لا إله إلا الله

# التوحيد

# یەکتاپەرستی

لە محازەراتەکانی مامۆستا: ناصر سبحانی

کۆکردنەوەو لێکدانەوەی: بەندەیەکی خودا

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على محمد واله اجمعين

ربنا اغفر لنا ولاخواننا الذين سبقونا بالايمان ولاتجعل فى قلوبنا غلا للذين امنوا ربنا انك رؤف الرحيم

ربنا لاتزغ قلوبنا بعد اذ هديتنا وهب لنا من لدنك رحمة انك انت الوهاب

ربنا توفنا مسلما وألحقنا بالصالحين

اللهم ارِنا الحق حقا وارزقنا اتباعه وارِنا الباطل باطلا وارزقنا اجتنابه

**پێشەکی :**

خوێنەری ئازیز کاتێك ئەم کتێبە دەخوێنیەوە پێش هەموو شتێك هەوڵبدە ئەم کتێبە بە قورئان هەڵبسەنگێنی، چونکە قورئان قیاسی حەقە بۆ مسوڵمانێتن، هەوڵبدە کاتێك ئەم کتێبە دەخوێنیتەوە بە دڵێکی پڕ ئیمانەوە بیخوێنیتەوەو دوور لە ڕق و کینە، بۆیە هیچ کەسێك لە هەڵە بەدەر نیە چ خاوەنی محازەرات چ کۆکەرەوەی ئەم کتێبە ( کل بني ادم خطاء) جا هەر کاتێك ڕەخنە و پێشنیارێکت هەبێت بە روحێکی ئیمانیەوە بیدرکێنە نەك بە رق و کینە.

ئێستا کەسانێکی زۆر هەن لە ڕاستی (توحید) یەکتاپەرستی دەگەن، بەڵام لە رووی ئەوانیشەوە کەسانێکی زۆر تر هەن شەعائری دینیان کاملە لە نوێژ و ڕۆژوو حەج و زەکات، بەڵام لە (توحید) یەکتاپەرستی نەگەیشتوون، هەروەها لە ڕووی بۆمانشەوە کەسانێکی زۆر تریش هەن نێتزانن (توحید) یەکتاپەرستی چیە، ڕەنگە

گوێشیان لێ نەبووبێت، کەچی پێغەمبەری خودا صلی الله علیه وسلم (١٣) ساڵ لە مەککە قورئانی بۆ دەهاتە خوارەوەو فرمانی پێ دەکرا کە بانگەواز بۆ ( توحید) یەکتاپەرستی بکات.

(توحید) یەکتاپەرستی کۆڵەگەی دینە، پێغەمبەری خودا صلی الله علیه وسلم پێش هەموو شتێك کاتێك ئەصحابی پەروەردە دەکرد بە ( توحید) یەکتاپەرستی پەروەردەی دەکردن، بۆ ئەوەی دوور بن لە شرك وخرافیات، بۆ ئەوەی تەنها دڵیان بە خوداوە پەیوەست بێت، کاتێك ئەو دڵە تەنیا (اطمأنیَتني) ئارامشی بە خودا بوو لێرەدا هەرچی ئەوامرێك لەلای خوداوە بێت بێگومان جێ بەجێی دەکاتت.

جا ئینسانی پەروەردەی قورئانی پێویستە دوور بێت لە هەر خەتەرەیەك لە رووی (توحید) یەکتاپەرستی.

پێویستە بۆ هەر تاکێك کە خۆی بە مسوڵمان دەزانێت شارەزایی هەبێت لە (توحید) یەکتاپەرستی، چونکە پێش هەموو شتێك کاتێك یەکێك دەبێتە مسوڵمان دەبێت یەکەم شت شەهادە بێنێت کە (لا اله الا الله) یە ئەمە خۆی تەوحیدە.

بۆیە خوێندنەوەی ئەم کتێبە بە پێویستی دەزانم بۆ هەر تاکێك کە شارەزایی لە رووی تەوحیدەوە نەبێت یان شارەزایی یەکی لاوازی هەبێت.

زانایانی ئیسلامی رەحمەتی خودایان لێبێت دەربارەی (توحید) یەکتاپەرستی زۆریان نووسیوە خودا پاداشتی خێریان بداتەوە، بەڵام ئەم کتێبانەی دەربارەی (توحید ) یەکتاپەرستی نوسراون تا رادەیەك قورسن بۆ یەکێك شارەزایی لە علومی دینی نەبێت یان شارەزاییەکی تەواوی نەبێت یان شارەزاییەکی سەرەتاییشی هەبێت ناتوانێت تێی بگات، چونکە پڕیەتی لە فەرعو فروع، لێرەدا تێگەیشتن زۆر ئاسان نیە، بەڵکو زۆر قورسیشە، رەنگە یەکێکی سادە یان گوتمان یەکێك بەکەمێك شارەزاییەوە ئەم کتێبانە بخوێنێتەوە ئەوا نەك هەر پەی پێ نابا بەڵکو لەوانەیە

تووشــی زۆر بـیر و بۆچـوونی هەڵـە ببێـت، کـە بێگومـان هەڵـەش لـە (توحیـد) یەکتاپەرستی کوشندەیە.

جا بۆ تێگەیشتن لە (توحید) یەکتاپەرستی بۆ ئـەوەی تووشـی بـیر و بۆچـوونی هەڵەی کوشـندە نـەبین دەبێـت بـچینە لای مامۆسـتایەك یـان کەسـێکی شـارەزا بـۆ ئەوەی دەرسی (توحید ) یەکتاپەرستی بخـوێنین، جـا ئەمـەش بـۆ هـەموو کەسـێك ناگونجێت، رەنگە بۆ کەسانێك بگونجێت، بەڵام ئەمجارەیان لەوانەیە مامۆسـتا یـان کەسە شارەزاکە دەست نەکەوێت، بۆیە لێرەدا پێویست بە بـوونی کتـێبی( توحیـد) ی کوردی سادە دەکاتـت بـۆ ئـەوەی خـەڵکی بـە خوێندنـەوەی تـەنهای خـۆی تێـی بگات.

تێبینی خوێنەری بەڕێز پێوستە پـێش دەسـت پێکردنـت بـۆ خوێندنـەوەی ئـەم کتێبە قەڵـەمو کاغـەز ئامادەکـەی، بـۆ ئـەوەی خـوا نەخواستەئەگەر لـە شـوێنێکدا دوچاری دڵەڕاوکێ بوی، ئەوا شوێنو بابەتەکە دیاری بکەیتو دواجـار دڵەڕاوکێکـەت لای کەسێکی شارەزا سارێژ بکەیت.

برای مسوڵمان (توحید) یەکتاپەرستی مەسەلەیەکی نەگۆڕە.

واتا لەسەرەتای دروست کردنی یەکەم تاکی بەشەر کە (ئـادەم) ە علیـە الـسلام نەگۆڕ بووە تاکو ئێـستا بـەڵام لـە هەنـدێك زەمـانِ (کُلیـات) بـە شـێوەیەکی گشتی بەیانکراوەو لە هەندێك زەمانیش بە (جُزئیات) بەش بەشی بەیانکراوە، واتا بـەپێی بیرو بۆچوون و پێشکەوتنی ئەم زەمانە لە بەشەریەت یەعنی (توحید) لە ئادەمـەوە تا ( محمد) صلی الله علیه وسلم وەك یـەك بـەیان کـراوە، بـەڵام لـە هەنـدێك زەمـان زیاتر روونکراوەتەوەو درێتژەی پێدراوەو لـە هەنـدێك زەمـانیش زۆر درێتـژەی پـێ نەدراوە، گوتمان بە پێی بیر و بۆچوونی بەشەریەتی ئەم زەمانە.

بۆیە برای مسوڵمان بە دوعای خێری هەموو لایەك هەستام بەكۆ كردنەوەی ئـەم محازەراتانە، بۆ ئەوەی تاكی كورد بە پێی پێویستی ئیمانی شارەزایی لە (توحید ) یەكتاپەرستی پەیدا بكات.. جا ئەگەر هەر كەم و كوڕیەكی تێدابوو داوا لـە خـودای پـەروەردگار دەكـەم لـێم ببورێـت. بۆیـە مـن بـە پێـی توانـام وەك ئـەركێكی دینـیم بەوپـەڕی دڵـسۆزی بـە پێویـستم زانـی ئـەم محازەراتانـەی (مامۆسـتا نێتـصری سوبحانی) رەحمەتی خودای لێ بێت بخەمـە نـاو دوو تـوێی كتێبێكـەوە بـۆ ئـەوەی ئاسانتر بەرجەستە ببێت، هەروەها بیرو بۆچوونی هەڵە لە ناو دڵی مرۆڤی مـسوڵمان نـەمێنێت، جـا وەصـیەت دەكـەم بـۆ ئەوانـەی دڵیـان ئـەم دینـەی دەوێـت پـێش خوێندنـەوەی ئـەم كتێبـە دوعـا بـۆ ( مامۆسـتا نێتـصری سـوبحانی) بكـەن خـودا پاداشتی بەخێری بداتەوەو ئێمەش لە دوعا بێ بەش مەكەن.

خودا شادمان بكات بە بەهەشت

﴿ان الله لا یغفر ان یشرك به ویغفر ما دون ذلك لمن یشاء﴾

اعوذ بالله من الشيطان الرجيم

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ ۚ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١٨﴾ ﴾

خودای گەورە فەرەحنایی ئیمان باوێتە ناو دڵەکانمان سنگمان پر بێت لەو حەقەی پێغەمبەران علیهم السلام بۆی هاتونو راستی و دروستیمان بێت لە بەندایەتی کردنی خودای پەروەردگارو ورد بین بۆ ئەوەی دور بین لە شیرکوو نکوڵی لێ بکەین. خودای گەورە هیممەتمان بداتێ بۆ ئەوەی بانگەواز بکەین بۆ نەهێشتنی شیرکو بیدعەتو خورافیات.هەروەك خودای گەورە دەفەرموێ ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴾ خودای گەورە بۆ هەر میللەتێك پێغەمبەرێکی ناردوە بۆ ئەوەی دور بن لە عیبادەتی جگە خوداو دور بن لە خۆشەویستی طاغوتو گوێرایەڵی کردنی...

طاغوت: بەهەمو پەرستراوێك دەوترێ جگە لە الله جل جلاله.

﴿بۆ ئەوەی خودای پەروەردگارمان بەشێوەیەکی راستو دروست بیناسین پێویستە لە سەرەتا چەند شتێك بزانین﴾ ئینسانێك قەرارە (استدلال) بکات لەسەر بونی خودا لەم زەمینەیە، لێکۆلینەوە چیە؟ ئەم جارە ئەو وەسائیلە کە (استدلال)یان پێ دەکات چین، کۆتایی بە چ نەتیجەیەك دەبێت.

هەر مەوجودێك لەم مەوجوداتە لە پەیوەندی لەگەڵ مەوجوداتی تردا پەیوەندی کار(فعل)و کاردانەوە (انفعال)یان هەیە هەر مەوجودێك شتێك دەگرێو شتێك

دەداتەوە، ئەم پەیوەندیە لەناو هەندێك لە مەوجودات زۆر بەشێوەیەكی بەهێز جوڵە دەكاتت، لەبەر ئەمەیە ئەم مەوجوداتە دارای سیفەتێك بوون تایبەتمەندیەكیان تێدا پەیدا بوە، كە ئەو تایبەتمەندیە بانترە لەوەی مەوجوداتی خوارتر هەیانە شوێنەوارەكە لە (فعل)و(انفعال) (تاثیر)و(تأثُر)دیارە، ئەم نەوعە لە مەوجودە مەوجوداتی رووەكن. بۆمانی ژیان رووەكیان تیادا هەیە لە وەرگرتنو دانەویان بانترن لە خاكو بەرد و ئاو:

یەكەم: ژیانی رووەك : كە ئەمە دوو سیفەتیان هەیە:

١- نمو : ئەوەیە ئاو و خۆراك وەردەگرێت گەشە دەكاتت (وەرگرتن).

٢- تولید المثل : دوای ئەوەی كە ئاو و خۆراكی وەرگرت ئەمجارە بەر و بوومی دەبێت جا ئەم بەروبوومە چ بۆ مرۆڤ بە كەڵك بێت یان بۆ گیانداران یان تەنها بۆ جوانی(دانەوەی هاو شێوە).

بەڵام بانتر لەژیان ڕوەكی ژیان (حیوانی)ە كە ئەم دوو سیفەتەی تێدایەو دووی زیاتریشی هەیە

دوەم: ژیانی حەیوانی: چوار سیفەتی هەیە:

١- نمو: كە ئەمە ئاوو خۆراك دەخوات گەشە دەكاتت (وەرگرتن).

٢- تولید المثل : ئەمەش بەروبوومی هەیە (دانەوەی هاو شێوە).

هەروەها زیادە لەسەر بۆمان وەرگرتنو دانەوەیەكی تری هەیە.

٣- الاحساس بالحواس الخمسة _ هەست كردن بەپێنج هەستیارەكە.(زانیاری وەردەگرن لەم مەوجوداتە كەوا لە دەوروبەریانە) (وەرگرتن).

٤- الحركة الاختیاریة : (تەئسیر دادەنێن لەسەر شتانی تر بەم حەرەكە ئیرادیە كە هەیانە) (دانەوە)

ئەمەژیان حەیوانیە کە لە ئینسانیشدا هەیە، بەلام ئمتیازی ئینسان لە گشتی حەیوانێت ئەوەیە کە لەسەر ئەم چوار سیفەتە دوو سیفەتی زیاتری هەیە(یان بەواتایەکی تر لەسەر ئەم ژیانە جۆرێکی تر ژیان هەیە)

ئەمەش عبارەتە لەوەی ئینسان (یەکەم: علم. دووەم: ارادە)ی هەیە ئەم دوو تایبەتمەندیە ئینسان جیا دەکاتتەوە لە مەوجوداتی ترو بەناسینی بۆمان ئینسان دەناسین، وردەکاتری دەربارەی ئەم دوو تایبەتمەندیە بەم شێوەیە:

کە کاتێك ئینسان دەگاتتە سنوری جیاکردنەوەو چاو دەکاتتەوە مەوجوداتی دەوروبەری خۆی دەبینێت، ئەو مەوجوداتەی کە لە زەمانی خۆیدا هەیە نەك ئەوەی لە رابردوو داهاتو، واتە لەو بەشە زەمانەی کە خۆی تێیدا دەژی، پەیوەندی ئەم مەوجوداتە لەگەلٚ ئینسان بەهۆی هێزێکی زانستیەوەیە، کە عیبارەتە لەوەی ئینسان (مشاهدە) توانای بینینی ئەو مەوجوداتەی هەیە، ئەوشتانەی کە دەیبینیٚ لە دەوروبەری خۆیداو ئەو ڕوداوانەی پەیوەندیان بەم شتانەوە هەیە لێکی دەداتەوەو ئەو بینراوانە ڕێکوپێك دەکاتتو دەستەبەندیان دەکات دەیان گونجێنێت، ئەم بینینە دوبارە دەبێتەوەو کۆتایی دێ بە ئەنجامێك.

## زانیاری دەربارەی ئەم بونەوەرە بە سیٚ جۆر وەردەگیرێت :

ئەو هێزە زانستیەی کە لە ئینساندا هەیە دەیگەیەنیٚ بە زانست دەربارەی یاساکانو سونەنی دادوەر بەسەر ئەو مەوجوداتەی کە لەو بەشە زەمانەی خۆیدا هەیە، ئەو هێزە پێی دەلێن: هێزی بینین (قوة البصر)، (بصر) بینینی جگە چاوە (عین). بصر: عیبارەتە لە هێزێك کە هی رۆحی ئینسانە، بەلام بۆکەوتنە کاری

سود لەو ئەندامە وەرگریٚ کە چاوە، جا ئەو هێزە لەبەر ئەوەی لە رێگەی ئەم چاوەوە کار دەکات پێی دەلێن بصر، چوارچێوەی کاری ئەوەش جیهانی بینراوە _

ئەو مەوجوداتەی کە لە زەمانی ئەو لەدەوروبەریدا هەن، چونکە ئەوەی کە لە رابردوو داهاتو هەیە جیهانی شاراوەیە، ئەوەی کە ئێستا هەیە جیهانی (شهادە)یە بینراوە، جیهانێکە کە دەیبینێو تەماشای دەکاتت، بێجگە لە شتانێك کە غەیب بونیان پەیوەندی بە زەمانەوە نیەو زانستی پیێ پەیدا ناکرێتت، هەروەك ئینسان لە رِوی کاتەوە (زمان) سنوردارەو بەشێك بینراوە بۆی (شهادە)یە وە بەشێك نادیارە، بەهەمان شێوە لەروی شوێنەوەش(مکان) هەندێك شت هەن کە ئینسان بە هۆی ئەم هێزی بینینە پێان ناگاتو پەیوەندیان بە کاتو شوێنەوە نیە، وەك زانست بەفریشتەکانو تایبەتمەندیەکانیان.

١- بصر : بینین : زانیاری دەربارەی (عالم الشهادة) ئەوانەی بە چاو دەبینرێن وەردەگیرێت.

دوای ئەوە بە بینینی ئەم نیشانەی بونەوەریە بەو مەوجوداتی جیهانی هەستیە گەیشت بە دەرکی زانیاریەکی رێکو پێك، ئەمجارە مەرحەلەیەکی تر دێتە پێشەوە بۆ بەدەست هێنانی زانست کەئەویش (قلب)ە.

٢-(قلب) : دلّ : استدلال بە مەعلوماتی (عالم الشهادة) ئەوەی بە چاو دەبینرێن دەکاتت بۆ (عالم ما وراء الشهادة) ئەوەی کەلە پشت بینراوەوە هەیە.

استدلال: لێکدانەوە بە شتێکی دیار بۆ شتێکی نێندیار:

بۆ گەیشتن بە دلّ نیایی دەربارەی خالقێك ئەوەی کە دروستی کردوە (عالم) زانێت بوە، چونکە بینینی ئەم مەوجوداتە شوێنەواری زانستییان لیّ دەردەکەویّ، نەگونجاوە شتێك ئاوا بە رێكو پێکی دروست کرابێت بە بێت زانست بوبێت، شوێنەواری دەسەلأت دەردەکەویّ کە ئەم دروست کراوە زەبەلاحانە، دروست کراون، شوێنەواری دانێتیی دەردەکەویّ کە ئەم مەوجوداتە هەر ئەندامێکی هەر چۆن بوە وا رۆیشتوە بێت لەکار کەوتنو لادان، جا بەمانە (استدلال) دەکاتت بۆ

پەیبردن بە سیفاتی ئەم بەدی هێنەرە کە بۆمانی هێناوەتە کایەوە، ئەم هێزەی کە لە دوای هێزی بینین کاردەکاتەو زانیاری بینین لێك دەداتەوەو دەیکات بە دەلیل بۆ جیهانی شاراوە پێی دەڵێن (قلب) دڵ، نەك بەو جۆرەی کە لەناو فەلسەفدا ووشەی زهن بەکار دەهێنرێ کە تەنها ئیشارەت بە دەرکو زانینەکە دەکات بە شێوەیەکی وشکو بەبێت روح، لەبەر ئەوە لە ئیسلامدا زانین و دەرك بێت ئەرزشە هەر بە رەسمی نێتنێتسرێ، زانینێك بە رەسمی دەنێتسرێ کە ئینسان (منقلب) بکات (فؤاد) پێ دەڵێن واتە: گڕی بدا، واتە کاتێك کەنێتسیت بتگۆڕێو ببێتە هۆی باوەڕ بون (کەوابو ئەم هێزی دووەمە زانیاریەك دەرك دەکات لە جیهانی (شهادە) بینراو نیەلە جیهانی (غەیب) شاراوە، بەهۆکاری (استدلال) بەزانیاری (بصر) بینین دەگاتنت بەمانە، ئەمە دوو هێزن کە بەم دوانە ئینسان دەبێت ئەوەی وا پێویستێتی لە جیهانی بینراوو جیهانی شاراوە بۆ ئەوەی کە بینشو جیهانبینیەك (عقید)ەیەك تەواو بەدەست بهێنێت، دەبێت بتوانێ بەم دوو هێزە تەئمین بکات بەجۆرێك کە بینشو شونێتسیکی وا پەیدا بکات کە لەمە بەدواوە لە ژیانیدا هیچ جوڵانەوەیەکی بەبێت ئەساسو پایە نەبێت.

لەم بینینە جۆرە بابەت گیریەکی بۆ پەیدا دەبێت کە چی بکات یان چی نەکاتت کار لێرە بڕیار دانە، ئەم بڕیارەش ئەوەیە کە ئینسان زانیاریەك لە زانیاریەکانی کەسپ کردوە ئەبێت لەناو چەندەها جۆر لە بابەتگیریدا کە ئیمکانی هەیە ئینسان تەصەوریان بکات لەم زەمینەیە تەنها دانەیەکیان کە منێتسبە لەگەڵ ئەو زانیاریە ئەویان وەربگرێ.

دەی بەوەی ئەم جیهانی هەستیە لەگەڵ ئەم جۆراو جۆری کە هەیەتی لە مەوجودات یەك دەزگای (واحد)ە جوڵانەوەی تەواوی بەشەکان پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە، ئەم ئینسانەش بەشێکە لەم جیهانی هەستیە دەبێت جوڵانەوەی

ئەویش هەماهەنگ بێت لەگەڵ جولانەوەی جیهانی هەستی، هەروا دەبێت خودی خۆی لەگەڵ بەشی جگە ئختیاری خۆی هەماهەنگ بێت، دەبێت ئەم ئینسانە هەر بابەتێك کە دەیەوێ بیگرێ لەبەرامبەر هەر جۆرە زانیاریەکەوە ئەو بابەتە(اطمأنێتن) ی بێت، کە موافقە لەگەڵ جولانەوەی گشتی ئەم جیهانی هەستیە، لەگەڵ جولانەوەی بەشی جگە ئختیاری خۆی ئەمە پێویستی بە زانستی تەواو هەیە لە جیهانی هەستی، کە ئەمەش کاری ئینسان نیە، کە دەزانین هەم لە بەشی علمی (بصر) وە هەم لە بەشی علمی (قلب)ی لە چوارچێوەیەکی زۆر کەم ئەم ئینسانە دەتوانێ کار بکات کە ئەمە لەرێگەی زانستیەوە بزانێت، بابەتگیری گونجاوە لە هەر مەسەلەیەك چیە ئینسان دەسەلاتێکی نیە دەمێنێ بە رێگەیەکی تر دەست پێ بکات، دەبێ بە زانیاریەك کە هەیەتی(استدلال)بکات لەسەر ئەو شتەی کە قەرارە پێی بگات بۆی مەعلوم بێت(واتە بەو زانیاریەی کە لە عالەمی غەیبی یان عالەمی (شهادە)بینراوو پێی گەییوە(استدلال)بکات کە بزانێ چی بکات یا چی نەکات.

ئەوشتانەی لەبەشی بابەت گیرین، زانیاریەکن کە پێیان دەڵێن (اعتباری) واتە: بە پێی بریاری ئینسانەکەیە،واتە: کە بریاری دا شتێك ببێت دەبێت یان بریاری نەدا نێتبێت، ئەمە لەگەڵ ئەوەی کە بە رێگەی (استدلال)پێی دەگەی رێك نێتکەوێ، چونکە شتێك کە بە (استدلال) پێی دەگەی پەیوەندی بە بریار دانی خۆتەوە نیە، بۆ نمونە چاوت دەکەوێ بە دوکەڵ کە مەحلولی ئاگرە، بریار بدەی نەدەی هەر وایە، بەڵام لێرە روداوێك رودەدا دەروانی کە چۆن بابەت بگری بەرامبەری، ئەمە ئیتر بە (استدلال) نەبوە ئەمە پەیوەندی ئیرادە بوە کە ئینسان بریاری لەسەر دەدا(بۆ زیاتر زانیاری سەردانی ئەو کتێبانە بکە دەربارەی سروشن).

پوختەی ئەمەیە جۆرێك لە زانیاری هەیە کە ئینسان بە (استدلال) پێی نێتگات، ئەمەش ئەوەیە کە ئینسان نە بەرێگەی (بصر) بینینو تەجروبەوە گەیشتوە بەمانە، نە بەرێگەی(استدلال)ەوە، بەڵکو لە شوێنەواری پـەیرەوی بـە هێـزی (قلـب و فـؤاد) ەوە بیستویەتیو بۆیان وتوە، ئەویش وەری گرتوە، کە ئەمە ئیتر تەقلیـدی تیایـەو ئینسان چارەی نیە، بۆی دەڵێن ئەمە وایە، ئەویش باوەڕی بە علمی بەرامبەر هەیـە پێی رازیە، بۆنمونە لە زەمینەی (تخـصص) کەسێك دەچێتە لای پزیـشکێك خـۆی دەداتـە بـەر دەسـتی کـە گـەورەترین نەشـتەرگەری بـۆ بکـات، لێـرە هێـزی بیستنی(سمع)ی ئینسان کەوتۆتە کار کە بەمە رازیە، واتە: (استدلال)ی دەکـات کـە کەسانێك سەردانی ئەم پزیـشکەیان کـردوە دەرکـەوتوە لـە کارەکـەی خـۆی زانێـت بـوە، ئـەخلاقی گشتیـشی دەرکـەوتوە باشـە، بینێـت لەسـەر ئـەو نێتـسینەی لـەو پزیـشکەی هەیـە خـۆی تەسـلیم دەکاتـتو رازیـە بـەوەی کـە ئـەو لـەم زەمینەیـەدا شتانێك دەزانێ من نێتی زانم، ئائەو پێ رازی بونە کاری بیستنە(سمع) جا تاکەکانی ئینسان تەماشا بکەین هەر تاکێك لەسەر هەر تاکێکی تر بە هۆی بیستنەوە (سمـع) زانیاری وەردەگرێ.ئەمە کاری هێزی سێیەمە.

٣-سمع:بیستن :-کە دەرکی ئەو زانیاریانەی بیـنین (بـصر) پێیـان دەگاتـت، نەك( قلب) واتە (حقائق) نین لە جیهانی (شهادە)بینراو یـا جیهـانی (غیـب)نـەبینراو بڕیارن، ئەبێت کەسێك علمی تەواوی بەسەر ئـەم بونـەوەرەدا هەیـە ئـەو بڕیارانـەی بەو جۆرەی چاکن بیاندا، لەدوایی تەحویلی ئینسان بـدا، وەزیفـەی تـریش دراوەتـە (سمع) لەشوێن ئەوەی کە ئینسان لەبەر لاوازیەك کە هەیەتی سودی تەواو لە هێـزی بینینـو هێـزی قـەلب نێتکـات، لەسـەرەنجام زانـستێکی شایـستە بـە جیهـانی بینـراو(شـهادە) پەیـدا نێتکـات بـەو جـۆرە کـە دەشـێ ملاحـەزە بکـات نێتیکـات، عەقیدەیەك دروست لە جیهانی غەیب پەیدا نێتکات بە علم بەمە، خودای گـەورە لـە

زەمینـەی ئـەم دوو هێزەشدا هیدایـەتێکی نـێردوە کـە لـە ڕێگـەی بیستن (سمع) ئینـسان وەری بگرێـت ئەوەیـە کـە قورئـان تـەوجیهی خـەڵك دەکاتـت کـە چـۆن ملاحەزەی نیشانەی بونەوەری بکەن ئایات لە (ئافاق)لە (انفُس)دا بکـەن، چۆن لـە ڕاستی غـەیب بگـەن(بەشـەر کاتێـك هیدایـەتی خـودای نـەبوە، نـەیتوانیوە بینـشێك عەقیدەیـەکی دروسـت لـە جیهـانی نـەبینراوا پەیـدا بکـات یـان خوێندنەوەیـەك‌و تێڕوانینێکی دروست لە جیهانی (شهادە)بینراودا بکات).

بۆنمونە

بەرزترین فەلسەفە لە رابردو فەلسەفەی (ئەرق سوی) بوە کە کۆتایی علم پێـی دەگاتنت لە مەوردی خودا دەڵێـت خـودا مـنی دروسـت کـردوە ودونیاشـی دروسـت کـردوە، بـەڵام ئـیتر وێڵـی کـردوین کـاری بەسـەرمانەوە نیـە. دەڵـێ چـونکە ئێمـە نێتقصین خودا کاملە، کامل پەیوەندی بە نێتقص نیە. کە ئەمە هیچ مانێتیەك نێتدا شتێکی بێت ئەرزشە.

ئەم سێ دانە هێـزە کـە ئینـسان لەرێگـەی ئەمـەوە زانیاریـەك لازمـە ببیێـت لـە ژیانیدا هەم لە دەرکی ڕاستی‌و هەم لـە بابـەت گـیری منێتـسب لـە ڕێگـەی بۆمـانوە دەستی دەکەوێ (وەختێك کـەدەڵێن ئینـسان یـەکێك لـە ئیمتیازەکـانی لـە سـائری حەیوانێتت علمـە مەبەسـت ئـەم علمەیـە). لەشوێن بۆمـانوە هێزێکـی تـر هەیـە کـە شتێکی پێ خۆش بێـت وەری دەگـرێ هـەوڵی بـۆدەدا، شـتێکی پـێ نێتخـۆش بێـت نێتچێ بەلایداو لەخۆی دور دەخاتەوە، بۆنمونە جۆرێك خۆراکی پێ خۆشە جۆرێکی پێ نێتخۆشە، جۆرێك لیباسی پێ جوانـە جـۆرێکی پـێ نێتـشرینە، ئـەم هێـزە پێـی دەڵێن هێزی هەوا(نفس) جـا ئـەم هێـزە (محـرك)ە جولێنـەری ئینـسانە پـاڵی پێـوە دەنێت کە شتێك پێی خۆشە بیکات‌و شتێك پێی نێتخۆشە نەیکات، کاتێك ئەم هێزە کـۆنترۆڵ نـەکرێت لەبـەر ئەمەیـە کـە ئینـسان لاوازە، دواجـار داواکـاری دەبێـت

بەوشتانەی کە لـەم ژیـان دونیایـە هـەن، لەسـەرەنجام داواکـانی ئینـسان دەبـن بـە داواکاری حەیوانی، ئینسان دەکەویّتو دەچیّتە خواری خوارەوە (اسفل السافلین).

بەلاّم وەختێك کە کۆنترۆڵ دەکریّت (توجیە) دەکریّـت وای لیّدیّ ئـەو شـتانەی کە خالقی ئەم ئینسانە بەباشی زانیونو داوای کردون، ئەوانەی پـێ خۆشـەو بـۆلای ئەوانە جوڵە دەکاتت، ئەوەی کـە بەداوانـەکراو(مُنکـر) داینـاوە، لەوانـە هەڵدێو دور دەکەویّتەوە، ئیتر لەو وەختەدا ئەم کەسە ئینسانە.

ئـەم دوو دانـە هێـزە (١-علـم٢-ارادە) لـە هـەموو ئینـسانێك (بـالقوة) هەیـە وەئیمتیازی ئینسان لە سائری مـەوجودات، حـەیوانێتت کـە نـزیکترینن لـە ئینـسان بەمەیـە بـەلاّم (بالفعـل) بـونی کـارکردنی تـەنیا لـە ئینـسانی ئیمانـدار هەیـە کـە شـوێنەواریان هەیـە، هـەم علمـی دەسـت دەکـەوێ لـەم سـێ ڕێگـەوە بـەجۆرێك کـە دەردی بخـوا، هـەم ئیرادەکەشـی ئەوەیـە کـە بەرێیـەکی دروسـت هیدایـەتی دەداو نێتیەلێ بلەوتێ.

جا ئەمەی کە ئینسان ١-نمو دەکات ٢-تەولیـدی مثـل دەکـات ٣-احـساس بـە حواس دەکات ٤-حەرەکە دەکات لەدوایی (علم) لەم سێ ڕێگەوە بەدەست دێنێ - وە(اراد)ەی هەیە.

(کـۆی ئـەم شـوێنوارانە لـە شـتێك سەرچـاوە دەگـرن پێـی دەڵێن ژیـان) ژیـان ئینـسانی، چـونکە چـواریان لـە ژیـان حـەیوانی سەرچـاوە دەگـرن بەگـشتی، ئـەو دووەشیان لە علم و ئیرادە لە ژیان ئینسانی دایە چونکە پەیوەنـدیان بـە ڕۆحـەوە هەیە.

بەم جۆرە ئینـسان دەنێتـسین ئەمـە ئینـسانە کـە لـە بەرامبـەری ئـەم جیهـانی هەستیە قەرار دەگرێ ئینجا بزانین چی بەرجەستە دەکاتت:

له (استدلال) کردن بۆ بونی خودا بەر لە گشت شتێك ئینسان ڕو لەمە دەکاتت، کـاری ئەساسـی لـەم زەمینـەدا لێکدانـەوەی جـۆر جـۆر کـراوە: بۆنمونـە لـەلای فەلسەفیەکان جۆرێك لە (استدلال) کراوە. لەلای (مُتَکلمین) زاناواتە علمـی (کـلام)ی ئیسلامی کەپێی دەڵێن علمی( توحید) جۆرێـك (اسـتدلال ) جێـی باسـە، قورئـانیش جۆرێك (استدلال)ی بۆ شتانی تر خستوەتە بەر دەستەوە، کە ئێمە هەر لـەو جـۆرە دەتـوانین (اسـتدلال) بـۆ بـونی خـودا ئیـسفادە بکـەین.(اسـتدلال)ی فەلـسەفی و (استدلال)ی علمی (کلام) زۆر وشکن لەگەڵ هەمو کـەس سـازگار نـین، لەبـەر ئـەوە ئینسان کـەیفیان پـێ نێتکـات، هـەر لەبـەر ئـەوە ئێمـەش تێدەپـەرین بەسـەریاندا، (استدلال)ێك کە فەلسەفیەکان دەیکەن دەلیلی بەناوبانگ کـە هەیانـە عیبارەتـە لـە دەلیلی (امکان) واتـە لـە زهنـی خۆیانـدا تـەواوی تێگەشـتنێك کـە دەرکیـان کـردوە دەیکەن بە سێ بەشەوە، بەدابەش کردنێکی عەقلی دەڵێن ئەو مەفهومـە لـەدەرەوە یان نێتکرێت بونی بەبێت ئەسڵەن تەصەوری مەفهومەکە خۆی ئەوە دەگەیـەنێ کـە نێتکرێـت بـونی ببێـت یـان تەصـەوری مەفهومەکـە هـەر خـۆی ئەمـە دەگەیـەنێ پێویستی زاتی مەفهومەکە هەیە کە حەتمەن دەبێت ببێـت، یـا نـەخێر هـیچ کامیـان نێتگەیەنێ، کە ملاحەزەی مەفهومەکە دەکەن نەبەرەو بونی تیایـدا نەبـەرەو نـەبون (عدم).

ئەوانەش کە ملاحەزە دەکەین لەم جیهانە گشتی دانەیـەکیان نیـە کـە لـەجۆری ئەوە بێت، کە دەبێت ببێت واتە ئـەوەی ئێمـە دەیبیـنین لـە زەیو ئاسمـان گـشتی بونو نەبونی بەرامبەرە کەوابو ئەم پرسیارە پەیا دەبێت ئەگەر خۆی بونو نـەبونی بەرامبەرە ئەی چۆن بونی دەست کەوت؟ جا دەبێت هێزێکـی تـر هـەبێت تـا بـەرەو لایەکیان ببا. کاتێك ئاوایە تەواوی ئـەم مەوجوداتـە ممکنـنو شـتی ممکنـیش بـونو نەبون بۆی وەك یەکن، بـۆ هـیچ لایـەك ناجوڵێـت، بـەڵام ئێـستا ئێمـە ڕوبـەڕو بـوین

لەگەڵ واقعیەتێك کە ئەم ممکنێتە وجودیان هەیە، ئەبێت بگەرێین بە شوێن هێزێکی تردا کە ئەو ترجیحی لای (وجود) بونی داوە بەسەر لای (عدم) نەبوندا، دەی ئەو مەوجودە بیری لێدەکەینەوە ئەگەر ئەویش هەر ممکن بێت هەر ئیشکاڵەکە لەسەرجێی خۆیەتی، ئەی ئەو چی بونی پێداوە؟ دوبارە هەروا ئەویش ممکنێکی تر ئەمە رێك نێتکەوێ بە ئیستیلاحی فەلسەفە (تسلسل)لە دوای یەك روودەدات کە هەر برۆی دوایی نێتیەت، کە ئەمە ئمکانی نیە چونکە مەوجوداتەکە سنوردارن‌و دەبێت (مُنتهی) بێت بە جۆرێك کە تەصەوری زاتی خۆی ئەمەی لەگەڵدایەو دەبێت ببێت، کە ئەم مەوجوداتە نە (ممکن)ە نە (ممتنع)ە بەڵکە واجبە (واجب الوجود)ە واتە هەر تەصەوری زاتی خۆی ئەمەی لەگەڵدایە کە دەبێت ببێت، ئاوا دەگەین بە علم بە بونی خودا، بەڵام تەماشا دەکەین علمیان بە (واجب الوجود) دەست دەکەوێ هیچی تیا نیە، ئەوەی کە ئێمەدەمانەوێ لە ژیاندا دەردمان دەخوا (واجب الوجود) هەر لەخۆی دیارە پەیوەندی بە هیچ کەسەوە نیە تەنها ئەمە بوە کەئەو شتانە بونی پێ بەخشراوە.

–زانایانی تەوحید دەلیلێکی بەناوبانگیان هەیە بەناوی دەلیلی (حدوث).

حدوث : یانی ئەم کەونە، ئەم دونیایە بە بەردەوام گۆڕانی تێدایەو لە جوڵانەوە دایە، دەی شتێك کە بگۆڕێ حەتمەن دەبێت مەبدەئی هەبێت، شتێك کە بگۆڕێ سێ مەرحەلەی هەیە (١–زەمانێك کە لەمەو پێش هەبوە ٢–زەمانێك کە ئێستا هەیە ٣–زەمانێك کە لەمەودوا دێت.

(متکلمین) ملاحەزەیان کردوە ئەم جیهانە گشتی لە جوڵاندایە، هەرچیەك لە جوڵاندابو دەبێت مەبدەئێکی هەبێت، ئەم جارە دەبێت مەعدوم بێت، لێرە نێتچارین کەدەبێت مەوجودێکی تر ببێت کە ئەو لە (تغیر) لە (زمان) لە (حرکة) بەدەر بێت کە ئەو ببێتە مەبدەئو ئەو روداوانە لەلایەن ئەوەوە دەستیان پێ

کردبێت کە ئەویش زاتی قەدیمی (اللە) یە، (ئەوەتە ئەوان دەگەن بە ئسپاتی قەدیم) ئەمەش هەر شتێکی وشکەو جوڵانەوەکی تیا نیەو جوڵەیەك بە ئینسان نێتدات.

ئەم دوو دانە دەلیلە لەلایەن فەلسەفیەکانو (متکلمین) بەناوبانگن.

*بەڵام دوو دانە دەلیلی تر هەن کە هەم ( فطرین) گشتین بۆ هەموو کەس، هەم کاریگەری لە ئینسان دەکەن، هەم جوڵانەوە دەدەن بە ئینسان.

١-دەلیلی (وحی)　　　٢-دەلیلی (نظم).

١-دەلیلی (وحی) :- بەو جۆرە لە دەورو بەری وەحی (مەبەست لە وەحی قورئانە) لێکۆلینەوەیەك بکرێتت تایبەتمەندی ئەم وەحیە دەرك بکرێتت بگەین بەوەی ئاوا شوێنەوارێك ئیمکانی نیە مەخلوق وتبێتی، موعجیزە بونی دەرك بکەین کە نێتچار مونتەهی بین کە دەبێت لەسەرچاوەیەك جگە مەخلوق ئەم وەحیە هاتوە، لەبەر ئەوەی دەلیلی وەحی رونکردنوەی زیاترە، لەپێشدا دەلیلی (نظم) باس دەکەین.

٢-دەلیلی (نظم) :گونجاندن : یانی خودای پەروەردگار ئەم کەونەی بە شێوەیەك دروست کردووە تا بگونجێت لەگەڵ یەکتر.

بۆ رونکردنەوەی (نظم) نمونەیەك دێنین:

کابرایەك دەیەوێ پانتۆڵێك بۆ خۆی بدورێ بۆ ئەمە پارچە قوماشێك دێنێ دەیباتە لای خەیاتێك، جا خەیاتەکە دەست دەکاتت بەکارکردن لەسەر ئەم قوماشە، یەکەم جار خەیاتەکە ئەندازەی دەگرێ (قیاس) ئەوەندە بۆ درێتژی ئەوەندە بۆ کەمەری...(خلق) لە شوێن ئەمە کە ئەندازەی گرت بەپێی ئەو ئەندازانە کە گرتویەتی جیای دەکاتتەوە، واتە پارچە پارچەی دەکاتت ئەم بەشە پەیوەستە بە کەمیەت (برء) ئنجا پارچەکان لێك دەداو تەرتیبی دەکاتت، لەدوای ئەوە

شێوەیەکی تازە دروست دەکات، کە پانتۆڵەکە (تصویر) لە لایەکی تریشەوە ماددەی ئەم پانتۆڵە لە هەر شتێك نێتبێت هەڵبژێردرێ بەڵکو دیارە سابتە کە قوماشە، کە ئەمە ئیستعدادی دورینو لەبەرکردنی تێدایە، دەبێت ئەم پانتۆڵە هەماهەنگ بێت لەگەڵ ئەو کەسەی لەبەری دەکات، واتە لەگەڵ تەمەنی ئەم کەسەو لەگەڵ ئەو شوێنەی کە تێیدایە (واتە ئەنجامی وەزیفەی ئەم پانتۆڵە هەماهەنگ بێت لەگەڵ ئەو شتانەی تردا کەوان لەو دەوروبەرە) بۆمان ملاحەزە دەکرێو لەکۆی بۆمان پاتۆڵێك دروست دەکرێتو هەدەفێك لەپێشدا لەزهندا بوە دێتە جێ واتە : کەممەیەتی دیاریکراو_کەیفیەتی تایبەت_ئیستعدادی تایبەت لە ماددەی ئەم پانتۆڵە_ هەماهەنگ بونی ئەوە لەگەڵ ئەوانەی وان لەدەوروبەری (بۆمان بۆ ئەوەیە هەدەفێکی دیار (تحققی )پێ ببەخشرێ.

ئەوەی کە هەر مەوجودێك ئەوتایبەت مەندیەی ببێت تا هەدەفێکی دیاری کراو (تحققی) پێ ببەخشرێ پێی دەڵێن (نظم) خودای گەورە لە سورەی (اعلی) بەیان دەکاتت:

﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١ ٱلَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ۝٢ وَٱلَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ ۝٣﴾.

خلق : ئەندازەگیری (دوایی دەبێت بەپێی ئەو ئەندازەیە بەشەکانی جیا کاتەوە لەیەك مانێتی (برء ) کە جیاکردنەوەو برینە ئەویش لێرە لەگەڵ خودی ئەندازەگیریەکە (خلق) هاتوە.

فسوی: رێکوپێکی کرد لەسەر ئەو ئەندازەیە، ئەوەش بۆ بەشی کەیفیەتەکەیە کەشێوەیەك رێکو پێك رێك لەگەڵ ئەو شێوەیەی کە لە زانستی خودا (مقرر) کراوە.

والذی قدر : قودرەتو توانێتی تایبەتی بەهەر مەوجودێك داوە، ئستعدادی تایبەتی پێداوە کەبتوانێ بەرەو تەحقیقی ئەو ئامانجە جوڵە بکات.

فهدی: جوڵانەوەی هەر موجودێکی هەماهەنگ کردوە لەگەڵ جوڵانەوەی سائری مەوجودات (لەگەڵ موجوداتەکانی تر).

بەمانە دەڵێن (نظم).

کە هەر مەوجودێك لە مەوجودات ئەندازەو کەمیەیەکی دیاریکراوی هەیە، بەئەندازە لە ماددەی گشتی ئەم جیهانە جیاکراوەتەوە، هەر مەوجودێك شێوەو کەیفیەتێکی تایبەتی هەیە، بۆخۆی سازگارە لەگەڵ ئەو ئامانجەی لەسەر شانی دانراوە، هەر مەوجودێك ئیستعدادو توانێتیەکی تایبەتی هەیە بۆخۆی تا بگونجێت بۆ پێداویستیەکانی کەواتە: لە دوایدا ئەم مەوجودە بە(کەمیەتو_کەیفیەتو_ئستعداد)ی دیاریکراوەوە هەر کامەیان لەڕێیەکەوە دەکەوێتە جوڵە، جوڵانەوەی تەواوی بەلامنیش تەنزیمو هەماهەنگ کراوە، بۆ ئەوی نێترێکوپێکی و تێکچونو پێکدادان لەبەینیاندا ڕونەدا، بەو جۆرەی جوڵانەوە جۆراوجۆر هەیە لەم جیهانەداو یەك دەزگای واحدیش هەیە.

ئینسانێك تۆزێ تەماشای هەندێك لە مەوجودات بکات دەرکی ئەوە دەکات کە ئەو کەمیەتو ئەندازە بۆ ئەو مەوجودە دانراوە جێی خۆیەتی، بۆ گەیشتن بەو ئامانجەی کەلەسەر شانی ئەو مەوجودە دانراوە هەر ئەو کەمیەتە گونجاوو کەیفیەتە گونجاوو ئیستعدادە گونجاوەیە، بەراستی هەماهەنگیشە جوڵانەوەی ئەم لەگەڵ جوڵانەوەی باقیا.

نمونەیەکی سادە: مراوی وەزیفەیەك کەپێی دراوە بەپێی شوێنی ژیان دەزانین وەزیفەیەکە کەلەناو ئاودا ئەنجام دەدرێ لەبەرئەوەی وەزیفەی لەناو ئاودایە لەوێ ئەنجامی ئەدا، ئیتر بزانین چۆن ریعایەت کراوە، تەماشا دەکەین کەمیەتێك بۆ پێکهاتنی لاشەی ئەو مراویە گونجاوە لەگەڵ ژیان ئەو لەناو ئاودا هەتا ئێسقانەکانی خاڵی بونیان وەزنیان، کەیفیەتی حاڵەتی پان بونی سنگو سکی بۆئەوەی بتوانێ

ەسەر ئاوەکە بڕوا، هەتا تایبەتمەندی پەڕەکانی کە ئاو نێتگرێتە خۆی وەك هی مریشك نیە، دوای ئەوە کەیفیەتی پێی کەبەینی پەنجەکانی پێی پەردەیان تێدایە، دەنوکی جۆرێك دروست کراوە چونکە لەناو ئاو خۆراك دەخوا بۆئەوەی کاتێك خۆراك دەخوا ئاوەکە بێتە دەرەوەو نەخنکێ، واتە وەختێ خۆراکەکە بەدەنوك دەگرێ ئاوەکە لەو کونێتنەوە دێتە دەرەوە، یالە ئستعداتێکدا کەهەیەتی ئەو مادده چەوریەی کەدەری دەدا لەسەر پشتیدا، ئەویش بەدەنوك ئەینێ بەتەواوی بەدەنیەوە بۆئەوەی ئاو نەگرێتە خۆی، سائری ئستعداداتێك کەهەیەتی، ئەوانەی ئەم زەمینە کاریانە باشتر دەزانن.

تەماشا دەکەین لە کەمیەت (چەندی) لە کەیفیەت (جۆری) لە (ئستعداد) لە (هەماهەنگ کردن) لەگەڵ دەوروبەری ژیاندا ملاحەزە کراوە، کەئەم مەجودە ئەم مراویە وەزیفەی تایبەتی لەسەر دانراوە بۆیە هەماهەنگە لەگەڵ تەواوی ئەوانەدا. وشەی (فطرة) تیش ئالێرەدا ماناکەی ڕۆشن دەبێتەوە (کەئەڵێین فلان شت فطرەتی ئەوەیە، واتە: فلان شت لەم روەوە جۆرێك دروست کراوە کە سازگاربێت لەگەڵیدا).

نمونەیەکی تر : وشتر چونکە سەرو کاری لە بیابانە یەکەم شت دەستو پێی درێژە، کاتیك دەستو پێی درێژە چۆن باری لەسەر پشتی دانێن‌و سواری سەر پشتی بن؟، ئەمجارە تەبیعەتی وشتر وایە دادەنیشێ لە کاتی سوار بون‌و دانێتنی بار لەسەر پشتی، دەی کە دانیشت چۆن هەڵسێتەوە کە باری لەسەر پشتە؟، ئەمجارە ملێکی درێژی بۆ دروست کراوەو لەکاتی هەڵسانەوەیدا یارمەتی ئەدا، هەروا چونکە تۆزو خۆڵ زۆرە چاوی بەپێچەوانەی جۆرێك لە حەیوانێتی ترە، کەیەك پەردە هەیە لەسەر چاویان، ئەم دوو پەردەی لەسەر چاو هەیە کە رێگری تۆزە، بەلام رێگری بینین نیە، دەی رەنگە چەند رۆژ نەگاتە لەوەڕو ئاوو خۆراك، بۆ

ئەمەش کیسەیەکی بۆ دروست کراوە کە ئاوو خۆراك هەڵدەگرێ بۆماوەی چەند ڕۆژێك، جگە لەمانە لە تایبەتمەندی تر، کە ئەوانەی ئەهلی (تخصصن) لەم کارە باشتر دەزانن.

ئەمە پشان دەدات کەوەزیفەیەك دەبێت ئەم وشترە ئەنجامی بدات (کەمیەتەکی گونجاو لەلاشەیەك هەیەتی بۆ هەڵگرتنی ئەو بارە، کەیفیەتی گونجاو لە شکلو شێوەی، ئیستعدادی گونجاو، هەماهەنگ لەگەڵ ئەو شوێنەی کەتیایدا دەژی بۆی دروست کراوە ) ئەمە (نظم)ە. ئینسان وەختێك لەهەندێ مەوجودات(نظم) ی دەرك کرد لێرە کاری (بصر) بینین تەواو دەبێت.

*ئەمجارە کاری (قلب) دڵ دێتە پێشەوە کە بۆمان بکات بەدەلیل بۆ جیهانی (غیب).

بیر لەوە دەکاتەوە ئەم مەنشەئە ئەکرێت بێت علم بوبێت؟! لەگەڵ ئەوە کە شوێنەوارەکەی بەم وردەکاتریەوە لە کەمیەتو (چەندی) کەیفیەتو(چۆنی) ئستعدادو (ڕێکخستنی) جوڵانەوەی ئەم مەوجودە لەگەڵ مەوجوداتی تردا واتای علمێك دەقیق دەکات، ئەکرێت قودرەتی نەبوبێت کەشوێنەوارەکە وانێتکەیەنێت، ئەکرێت حکمەتی نەبوبێت، لەحالێك تەماشا دەکەین هەر کام لەم مەوجوداتە بەجێیە، ئەوجۆرە کەدەبێت ببێت هەر وایە لەمە زیاتر یان لەمە کەمتر، لە کەمیەتدا بەجۆرێ تر لە کەیفیەتدا جگە لەمە، لە ئستعداد نێتدروست بوو هەڵە بوو، زۆر بەسادەیی ملاحەزەی ئەم (نظم) و تەرتیبو گونجاندنە دەیگەیەنێت بە علم بە زاتێك بە سیفاتێك کە گونجاوە لەگەڵ بۆماندا، جا ئیتر ئەمە ئەم تایبەتمەندی (نظم) و تەرتیبو گونجاندنە دەیگەیەنێ بەچەندێك لە سیفات، زۆر سادەیە مەسەلەن ئیشارەمان کرد بەقودرەت یا بە حکمەت...

ئەم ئینسانە دەست بۆھەرچی دەبات لەبەر دەستیدایە، لە نیازمەندیەکانی لە پێداویستیەکانی ماددیو مەعنەوی، ئەو کێشەو گرفتانەی دێتە پێشی ڕێگەچارەی هەیە لەمانە، دەگاتتت بە نێتسینی سیفاتی جەمالی خودا، ئەو سیفەتانەی ئومێدو ڕەغبەتن، بۆ نمونە دەگاتت بەوەی خودا ڕەحمانە، ڕەحیمە، سود بەخشە، لە ملاحەزەی شوێنەوارێکی تر لەم مەوجوداتە دەگاتتت بە علم بە دەسەڵاتو قودرەتی خودا، بە علمو دەسەڵات بونی خودا بەوەی کە مالیکە مەلیکە قەهارە جبارە موتەکبڕە، ئیتر بۆمان لەقەزیەی داوای سەرەکی تەوحید نزیکی دەکاتەوە.

ئابەم جۆرە ئینسان بە دەلیلی (نظم) دەگاتت بە علم بەزاتی خودا، بەبونی خودا.

شتێکی تریش لە دەلیل باس دەکەن بەناوی (فطرة) کە گوایە ئەم ئینسانە لەزاتی خۆی علمی بەبونی خودا هەیەو هەروا دروست کراوە کەئەبێت علم بەمە پەیابکات، دەلیلیشیان ئەمەیە کەلەوەتەی بەشەر هەیە هیچ کاتێك ئینسان بێت دینداری نەبوە، دەڵێن مادام دینداری هەر هەبوە دەبێت لەزاتی ئینسانەوە هەڵقوڵێ بەلام لەوانەیە ئەمە دەلیلی سەربەخۆ نەبێت، دەلیلی فطرەت عیبارەتە لە زەمینەیەك کە ئینسانەکە هەڵدەنێت بۆئەوەی بە وەسیلەی دەلیل ئینسان بگات بە علم بە بونی خودا، ئەوەی کە پێی دەڵێن دەلیلی فطرەت عیبارەتە لە گەڕانەوەیەکی زاتی لە ئینسانداو داوایەك لە ئینساندا کەدەبێت من بگەڕێم بەشوێن ئەم مەوجودەو بیدۆزمەوە، بەلام لەچ ڕێگەیەکەوە پێی دەگاتت ئەوەجگە لەو فطرەتەیە، کاری ئەمە بەس ئەوەیە کەئینسانەکە پاڵدەدا بۆئەوەی خودا بدۆزێتەوە، بەلام ئیتر چۆن دەیدۆزێتەوە ڕێی (استدلال)ی چیە تەنها ئەوە نیە، ئەمجارە دەبێت (بصر) بکەوێتە کار (قلب) بکەوێتە کار (استدلالات) بێنە پێشەوە لەڕێگەی بۆمان بگات بە علم بە بونی خودا.

نمونەیەکی سادە: ئینسان غەریزەی جنسی هەیە، ئەم غەریزەیە لەشوێنێك لەکاتێك دا پاڵی دەنێت بگەڕێ بەشوێن ئافرەتێك بۆئەوەی بیخوازێو تەئمینی ئەو نیازە بکات، ئەم غەریزەیە کاری تەنها ئەوەیە پاڵی دەنێت، بەڵام دوایی چۆن دەی دۆزێتەوە؟ بۆ نمونە چۆن بیری لێدەکاتەوە لەکوێ بێت چۆن بێت ئیتر ئەوە مەسائلی ترەو جگە خودی غەریزەکەیە، ئەو غەریزەیە تەنها پاڵ پێوەنەری بوە بۆ ئەم کارە.

لێرەش ئەو فطرەتەی کە ئینسان هەیەتی، دەڵێن دەلیلێکە لەدەلیلەکانی علم بەبونی خودا، لەوانەیە بەس پاڵپێوەنەر بێت، واتە خودا خۆی ئینسانی وا دروست کردوە کەدەبێت پەیوەندی لەگەڵ خودا ببێتو بەرەو ئەو جوڵە بکات، لەدەرونیدا شتێك هەیە کەدەیەوێ خودا بناسێت، بەڵام چۆن بیناسێت تەنها ئەو فطرەتە بەس نیە بۆی، ئەوە هەر وای پێ دەڵێ دەبێت من خودا بناسم هەتاخوداش نەناسێت، شتێکی گەرەکە وەك ئەوەی شتێکی لێ بزربوبێت.

دەلیلش بۆ ئەمەی ئەم فطرەتە خۆی تەنها دەلیل نیە بۆ بونی خودا، ئەوەتە زۆرینە گومڕان لەناسینی خودادا، لەحالێکدا ئەگەر فطرەت دەلیلی سەربەخۆ بێت دەبێت تەواوی بەشەر خودایان ناسیبایە.

*کەواتە دەلیلی فطرەت خۆی سەربەخۆ نیە، زەمینەیە پاڵپێوەنەرە، دوایی دەبێت بە دەلیلی (وحی) یا دەلیلی (نظم) بگەن بە علم بە بونی خودا.

ئەمجارە دەلیلی وەحی:

لەدەلیلی وەحی ئینسان بگات بەوەی کە قورئان موعجزەیە، کاتێك گەیشت بەمە کە قورئان لەتوانایی بەشەر بانترە، کاتێك ئەمە سابت بوو، هەم سەرچاوەیەك کەئەم وەحیەی لێ هاتوە سابت دەبێت، دواجار زاتو سیفاتی خودا سابت دەبێت.

بۆ ئەمەی باس بکەین لە موعجیزە بونی قورئان لەپێشدا دەبێت ملاحەزەی ئەوە بکەین کاتێك کەسێك لەهەر شتێك بانگەواز دەکاتو داوای موبارەزە دەکات، دەڵێ: من شتێکم لایە ئێوەی گوێگر ناتوانن لەم هونەرەدا بگەن بەسنوری من، مەرجی سەرەکی ئەوەیە کەئەو هونەرەو ئەو قەزیەی کەمەوردی موبارەزەو تەحەددایە، لەوانە بێت کەلەگەڵ تەبیعەتی خەڵك رێك بکەوێ، بۆ نمونە: لەلای کەسێك کەهیچ جۆرە سازگاریەکی لەگەڵ وەرزش نەبێت، پاڵەوانێك بچێ خۆی بنوێنێ کەمن دەتوانم ئەوەندە وەزن هەڵبگرم، داوای موبارەزە بکات، ئەمە بانگەوازێکی بێجێیە چونکە ئەو لەم زەمینەدا کاری نەکردوەو لەگەڵیدا رێك ناکەوێ.

لەهەر زەمینەیەك داوای موبارەزە دەکرێت، ئەوانەی داوایان لێدەکرێت دەبێ لەم زەمینەیەدا کاریان کردبێت، قوڵتر لەوە دەبێت لەزاتیان لەدەرونیان پاڵپێوەنەرێك هەبێت بۆئەوەی کەلەم زەمینەیە کار بکەن.

ئینسان سێ دانە پاڵپێوەنەر لەزاتیدا هەیە، لەبونی ئینسان جیا نابنەوە تاکۆتایی ئینسانەکە:

١ـ هەستی ئەوەی ئینسان پاڵپێوەدەنێت بۆئەوەی شتێك نازانێت دەیەوێ بیزانێ،ئەم هەستە لەسەرەتای بونی بەشەر، بوە بەهۆی پەیدابونی دوو جۆر زانین بۆ ئینسان. یەکەم: زانینێك کەلەرێگەی بینینەوە (بصر) وەردەگیرێ.دووەم: زانینێك کەلەرێگەی (قلب)ەوە جێبەجێ دەکرێت کە(استدلال) بەبینراوەکان دەکات بۆ جیهانی غەیب، پێی دەڵێن جیهانبینی

٢-هەستی پاڵپێوەنان بۆکاری چاکە، ئەم هەستە هەمیشە ئینسانی پاڵناوە لەزەمینەی ئەخلاقی گشتی کار بکات(ئەم هەستە ئینسانی هەڵناوە بۆئەمە کە بۆی

ڕۆشن بێتەوە لەبەرامبەر ئەم ڕوداوە تایبەتەوە چیبکات چ لایەك بگرێو چ لایەك نەگرێ.

٣-هەستی جوانی ئەوەی کە بەدرێژایی مێژوو پاڵی بە ئینسان ناوە کەلەزەمینەی هونەر کار بکات، شوێنەواری ئەمە لەتەواوی مێژوی بەشەر دەبینرێت.

سەرەتایی ترین زەمانی بەشەر خاڵی نەبوە لەم سێ هەستە، نیشان دەدات ئەم سێ دانە هەستە لەزاتی ئینسان هەڵدەقوڵێن.

دەی کاتێك ئەمەمان زانی ئینسان ئەم سێ نیروەی تێدایە، ئەمجارە دەزانین کە داوای موبارەزە و تەحەددی لەزەمینەی شوێنەواری ئەم سێ هەستە بەجێی خۆیەتی، بەمەرجێك ڕوبکرێتە تەواوی تاکەکانی بەشەر بەپێی ئەوەی هەرکەسە شارەزایی لەکام بەش لەم سێ بەشە هەیە.

جا کاری ئێمە لەم زەمینەیە ئەوەیە کە کاتێك ئەم قورئانە بانگەوازی بە موبارەزە کرد وە، کاتێك کە تەحەددای بەشەریەتی کرد، کەوەك من شتێکی ئاوا بێنن یا بڵێن، خۆی لەم زەمینەیە چی نواندوە چی هێناوە؟ تابزانین هیچ کەس نەیتوانیوە شتێك وەك ئەو بێنێ.

بۆ ئەوەی زیاتر موعجیزە بونی ئەم قورئانە رونبێتەوە، زروفێك کەئەم قورئانەی تیادا هاتوە، چاوێکی بەسەردا بخشێنینەوە: سنورێك کەقورئان تیایدا هات حیجاز ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر ئەم راستیەی بۆ دەردەکەوێ کەهیچ ئیمکانێك نیە لەلایەن تەواوی بەشەر شتێك لەو بابەتە بێتە کایەوە، یەکێك لەوقسانەی دەیان کرد دەیانگوت محمد علیە الصلاة والسلام خۆی ئەم قورئانەی هێناوە : ڕۆشنە بەرلەوەی پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام بێتە دونیا باوکی نامێنێ، دوای ئەوە ئەم منداڵە لەلای دایکیشی نابێت، دوای ئەوە موددەتێکی زۆر کەم لەلای دایکی دەبێت

باشان دایکیشی وەفات دەکات، دوای ئەوە باپیرەشی نامێنێ، دوای ئەوە دەکەوێتە لای مامی ئەبو طالب ئەویش لەبەر فەقیری و کڵفەتی زۆر ئەیکاتە شوان، لەنەتیجە هەتا لە هاتوچۆیەکی سادە کە منالاًن دەیکەن لەناو کۆمەلگادا، هەڵسوکەوتێك کەلەکۆمەلگا وەریدەگرن لەویش مەحروم بو،دەبوایا زوو لەگەڵ مەرو مالاتەکەی بچێتە سەحراو ئەوپەڕی یەك کەس لەگەڵیدابێت تا ئێوارە کەئەستێرە دەردێن بگەڕێتەوە، لەخوێندەواریش بێبەش بوو بەهۆی ئەوەی کەئەو لەناو کۆمەلگادا نەبوەو تا ٢٥ ساڵی هەر خەریکی شوانێتی بوە، دووربوە لە فەرهەنگی کۆمەلگا (بۆمان هەمووی حکمەتی خودا بووە).

بانترین شوێنەواری فەرهەنگی ئەو قەرنە کەلە کۆتایی قورئان نازڵ بو لەو سەردەمە بریتی بوە لە ( ٧) دانە قەصیدەی مەشهور بەناوی (معلقات السبع) کەلەدوای ئەوەی زمانی عەرەبی سەدەیەك پێش نازڵ بونی قورئان گەیشتە سنورێکی زۆربەرزو کامل، ئەم (٧) قەصیدەیە پەیدا بون، خاوەنی ئەم قەصیدانە بانگەوازیان کرد کە هەر کەسێ دەتوانێ وەك ئەم قەصیدانە دانێ بابێتە پێشەوە موبارەزە بکەین، لەبەرئەوە پێیان دەڵێن (معلقات) واتا ئاوێزانکراو. ئەگەر ئەم ریوایەتە صەحیح نەبێت صەحیح تر ئەوەبێت کەلەبازاری عوکازدا ئاوێزانیان کردبێت، چونکە لەدوای ئەوەی ئیبراهیم علیە السلام بناغەی مەکەی دامەزراند، دوای ئەوە خەڵکەکە لەسەر شەریعەتی ئیسماعیل علیە السلام بون چوار مانگ لایان حەرام بو لەم چوار مانگە لەجیاتی شەڕ خەریك بون بەئیش و کارو پێکەوە ژیان، بەتایبەت کۆبونەوەو گۆرینەوەی تێڕوانینەکانتیان‌و هونەر، لە بازارێك بەناوبانگ بەناوی (عُکاز)، گرنگترین هونەریش لەو سەردەمە هونەری زمانەوانی‌و شیعرو قەصیدە بوە، لەوێ بانترین شاعیر دادەنیشت هەر شاعیرەو دەهات شیعری خۆی دەخوێندەوە دوایی ئەو نمرەی بۆ دادەنرێت، ئەم حەوت شاعیرە قەصیدەی خۆیان

خوێندەوەو دوایی داوای موبارەزەیان کرد، بەتایبەت لەناو عەرەب تا ئیمکانی ببێت نسبەتی ناتوانیی لەخۆیان دوردەکەنەوە، هیچ کەس نەیتوانی وەڵامیان بداتەوە.

ناوەڕۆکی ئەم قەصیدانە چی بێت: جیاکردنەوەی ئەم حەوت قەصیدەیە ئاوا دەست پێدەکەن، بیرکردنەوە لەپەیوەندیەکی جنسی زۆر بێ ئەدەبانەی شاعیر لەگەڵ نەیەك ژن بەڵکو لەگەڵ چەند ژنێك وەك بەناوبانگترینیان (امرء القيس) پێیان دەگوت (ملك الشعراء ) هەتا پەیوەندی راستەقینە عەشقێکی پاك دامەن جێی باس نەبوە لایان، بەڵکو فەخریان بەوە کردوە کەلەگەڵ چەند ژنێك رابوێرن. لەڕویەکی ترەوە باسی شەڕ دەکات، دەڵێ لەشەڕ ئاوامان کرد ئەسپەکەم واتاودا، وا تەکانی ئەدا، وا خوێن دەڕژا، وادامان بەسەریان... لەباسێکی تریان کەلە مەجلیسی شەراب خۆریدا، بۆنمونە چۆن سەخاوەت مەندانە وشترەکەم سەرئەبڕم لەوێ ناترسم لەهەژاریو کەم دەستی. هەروا لەم جۆرە بابەتە بێ ئەرزشانە بە(استثنیَت )ی (١٥) دانە لەقەصیدەی (زهیري بن ابی سلمه) کە مقدارێك پەندیان تیایە، لەبەر ئەوە ناوی نراوە(شاعر الشعراء ).

کەهەندێکیان لەگەڵ عەدل رێك دەکەون کە ئیسلام دایناوەو هەندێکیان رێك ناکەون زۆر خراپن بۆ نمونە کە دەڵێ (ومن لم يذد عن حوضه بسلاحه يهدم ومن لم يُضلم الناس يضلم).

نیوەی یەکەمی باشە (کە هەر کەس بە سیلاحی خۆی لەحەرەمی خۆی دیفاع نەکات دەیروخێنن بەسەریدا)

بەڵام نیوەی دووەم زۆر خراپە (هەرکەسە زوڵم لە خەڵکی نەکاتت زوڵمی لێدەکرێت).

ئەمە فەرهەنگی ئەو عەصرەی عەرەبەکان بـوە، چـونکە بۆمـان نمونـەی بـەرزی فەرهەنگو هونەری ئەوان بوە.

*زیاتر لەمانە سێ دانە زانستیش لەناو ئەوان هەبو:

یـەکێکیان زانـستی لێکدانـەوەی خەونـە نـە بـەپێی ئەسـاسو چوارچێوەیەکی دیاریکراو، بەڵکو کەسانێك هەر بۆخۆیان شتێك فێر بوبون خەونیان لێك دەداوە.

یەکێکی تر زانستی فێربونی فەلەکیات بوە، نەبەو شێوەی ئـەمڕۆ هەیـە، بـەڵکو بەناسینی ئاراستەی با، ئەوەی بەشێوەی تەجروبەیە، باران کـەی دەبـارێ، ئـا لـەم جۆرە شتانە، خەڵکی سادەی لای خۆشمان هەیە لەم جـۆرە شـتانە دەزانـێ بـەپێی تەجروبەی ژیان.

شتێکی تر هەبو لەناویان، کەسـانێك توانـای لەبـەرکردنیان بـەهێز بـو لـەناویان، نەسەبیان لەبەر دەکرد، بۆنمونە دەیان گەیانـد بـە بیـست یاسـی لەپـشتی خۆیـان، ئەویش لەبەر ئەوەی فەخر بەنەسەب لەناویان بونی هەبو لازم بـو لـەناویان هـەرکام نەسەبی خۆی بناسێ.

:-ئەمە تەواوی فەرهەنگی عەرەبستان بو لەو کاتە (کە ئینسانەکاتن لـەناو ئـاوا فەرهەنگێکدا پەروەردە بوبون) کە دیارە بیرکردنەوەو بینشیان دەبێ چۆن بێ.

بەڵکو کاریگەری پێنجەم تەئـسیری فەرهـەنگی وڵاتـانی تـر لەسـەر ئـەم شـوێنە تەماشـا دەکـەین، تەقـدیری خـودا وابـوە کەئـەم بەشـەی زەوی دەسـتی داگیرکـەر (استعمار)ی پێنەگەیشتوە.

ئێران بەشی شیمالی عەرەبستانی عێراقو بەشی جنوبی یەمـەنی لـەژێر دەسـتدا بو، ڕۆم شامی لەژێر دەستدابو، بەڵکو ئەم بەشە ئێران تێدەپەڕێ بەسەریدا دەستی هیچ لایـەکی پێناگـاتو هـیچ جـۆرە پەیوەندیـەك لەبـەینی داگیرکـەرو ئـەو گۆشـەی زەویـدا نـەبوە، بۆیـە تەئـسیرێك نـادا بەئـەم گۆشـەیە، تەئـسیرێکی زۆر کـەم کـە

تاجرەكان لەگەڵ خۆیان دەیان هێنا لەئێرانەوە، وەك داستانی رۆستەمی زاڵو لەم شتانە، لە رۆمیش هەروا دەهات، لەو شتانە نەبو بینشێكیان پێ بدات تەئسیریان لێ بكات.

*جا ئەم ئینسانە كاتێك قورئانی خوێند بۆیان چۆن تەحەددای كرد چۆن داوای موبارەزەی كرد لەچەند زەمینەداو چۆن پەككەوتنی ئەوان سابت بو، بەگشتی چۆن تەحەددای تەواوی بەشەریەتی كرد، لەهەر زەمانێك بە لێكۆلینەوەیەكی زۆر سادە دەزانین بەشەر پەككەوتوە لەوەستان لەبەرامبەر تەحەددا و موبارەزەی ئەم قورئانە.

– گوتمان هەستی پاڵپێوەنەری ئینسان بۆ زانینی ئەوەی كە بەچاو نابینرێت، بوە بەهۆی پەیابونی زانینێك بۆ ئینسان لەزەمینەی تەجروبە، زانیاریەك لەوەی پشت بینینی چاوە. بەتەعبیرەكی تر لە جیهانبینیدا، لەو كاتە بەناوبانگترین جیهانبینی جیهانبینی فەلسەفەی یۆنان بوە، جیهانبینی سێ روكنی ئەساسی هەیە:

١– ئەمە ئینسانە هەوڵدەدا بۆئەوەی ئەم جیهانە ببینێ بەجۆرێك لێكی بداتەوە تا ئەوەی ئیمكانی بێت راستیەكەی دەرك بكات.

٢–خاوەنی ئەم جیهانەو خاوەنی ئینسانە.

٣– ئەم جیهانەیە دروست كراوانی تر جگە لە ئینسان.

دەركی راستی هەركام لەم سێیانە، تایبەتمەندی هەركام لەم سێیانەو پەیوەندی بۆمان بەیەكەوە ئیتر دروست یا نادروست، بیروبۆچونێك لەهەر كام لەم سێیانە لە زهنی ئینساندا جێگیردەبێ پێی دەڵێن جیهانبینی، لەدوایی لە هەستی دوەم بۆ دەرككردنی هەر ڕاستیەك پەیوەست بەیەكێ لەم سیانە، دەبێ بابەت گیریەك بكرێ ئەمە پەیوەستە بەهەستی دوەم.

دەی بەناوبانگترین جیهانبینی لەو سەردەمە ئەرستۆ یە لەبارەی خودا ئاوا دەڵێ:

: خودا یەکە لەتەواوی روەوە لەبەر ئەوەی یەکە دەتوانێت یەك شت دروست بکات ئەویش (عقل)ی یەکەم بو دوای ئەوە نەفسی یەکەمو عەقڵی دوەم دروست دەکات هەروا بەتەدریج تادێتە کۆتایی نۆ دانە عەقلو نۆ دانە نەفس دروست دەبێ بەزاراوە بۆ حەوت دانە ئاسمانو عەرشو کورسی کە بیروبۆچونێکە هەڵەبونیان زۆر ئاسان دەرکەوتوە، کۆتایشیان زەوی و ئەوانەی کەتیایەتی دروستی کردوە.

دەڵێت چونکە خودا کاملەو مەخلوقات بەتایبەت ئینسان ناقصە، ئەوا کامل پەیوەندی بە ناقص نیە، لە دوای ئەوەی دروستی کردووین وێڵی کردووین.(واتە وەحشیەتو جەهالەتو سەرگەردانیو بێ ئاراستەو بێ ئەنجامی ئەم جیهانە دەگەیەنێ) ئەمە باڵاترین پلەی جیهانبینی ئەو سەردەمە بوە.

پێداچونەوەیەك لە جیهانبینیەکانی ئەو سەردەم دەری دەخات زۆر لەوە باڵاتر نەچون، بۆنمونە یەکێك وەك (نیچە) یان ئەوانی تریان لە (ئەرستۆ) لەهەندێ لاوە خراپتر بینشیان کردوە بێ ئەرزشتر بوە، کەیەکێکیان دەڵێ ئینسان وەك کرمێکە دەخولێتەوە هیچی زیاتر نیە، یەکێکی تریان دەڵێ خودا ئەم ئینسانەی بۆ ئەوە دروست کردوە بۆئەوەی عەنتەرێك کەیفی پێ بکات.

لەم زەمینەیە کاتێك قورئان بانگ بەگشت بەشەریەت دەکات، ئادەی وەك من بهێنن دەی تەواوی توانایی جیهانبینی خۆتان بخەنە گەڕ نەك هەر خۆتان بەڵکە جنیش بێتە کۆمەکتان، تەواوی بیرو بۆچونو جیهانبینی خۆتان بخەنە سەر یەكو قیاسی بکەن لەگەڵ جیهانبینیەك کەقورئان عەرزی دەکات، کە زۆر سادە ئەوە بەیان دەکات کە هەر دەرد ناخوا قیاس بکرێ لەگەڵ قورئان.

تەواوی ئەو جیهانبینیانەی کە بەشەر کەسپی کردوە قابلی قیاس نیە لەگەڵ تەواوی ئەو جیهانبینیەی کەقورئان عەرزی کردوە.

(پوختەی جیهانبینی لە ئیسلام) :

لەخودی ئینسان دەردەکەوێ ئەم جیهانە خاوەنێکی هەیە پەیوەندی ئەم جیهانە پەیوەندی خەلقو ئەمرە، پەیوەندی خەلق بەم مانایە لەپەیوەندی هەر مەوجودێك لەو مەوجوداتە دەردەکەوێ کەهەر کامیان کەمیەتەکی تایبەتی هەیە بەپێی ئەو وەزیفەیەی لەسەر شانی دانراوە، کەمترو زیاتری نیە، واتە بەئەندازەیە، هەروا هەر مەوجودێك شێوەو کەیفیەتی تایبەتی هەیە کە گونجاوە لەگەڵ ئەو شوێنەی تێیدا دەژی، ئەو وەزیفەیەی لەسەر شانێتی کە جگە ئەو شێوەو کەمیەتە دەردی ناخوا، بێجێیە تا ئەم تەرتیبو ڕێکخستنە تەنها کاری خودایە. هەر خودایە کەمیەتو کەیفیەتی تایبەتی بەو مەوجودانە داوە هەرئەوە ئیستعدادو قودرەتی تایبەتی پێداوە، هەماهەنگی کردون لەگەڵ یەکتر بەجۆرێك کەهیچ لادانو پێکدادانێك رونەدا لەبەینیان، لەگەڵ بۆمانش یاسایەکی بۆ داناوە کەبەشی جگە ئختیاری ئینسان پێیەوە پەیوەست بێت، بۆئەوەی نەبێتە زەرەر لەسەر خودی خۆیو دەورو بەری ( ئەمە بەشی (خلق)ە کە کاری هیچ مەوجودێك جگە خودا نیە ) لەسەر ئەم ئەساسە فەرمانڕەوایی فەقەت کاری خودایە.

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُ﴾ ئەمە پەیوەندی خودا لەگەڵ ئەم جیهانەیە، جا لەگەڵ ئینسان بەشی ئختیاریەکەی زیاتر ڕون دەکرێتەوە وەك لە سورەی (فاتحە) یەکەم ئینسان دەبێ خودا بەزاتی دارای سیفاتی جەمالو جەلال بناسێ، زانینی ئەمە ڕەغبەتو ئومێدی پێ پەیا بکات، رەغبەتو ئومێدی جگە لە خودا لە دەرونیا دەربکاتو ڕەهبەتو ترسی تیا پەیدابکاتو جگە لە خودا ڕەهبەتو ترسی لە کەس نەبێت، ئەمجارە ڕەغبەت هەڵی نێ بۆ ئەوەی داوای

ئەمەك تەنیا لە خودا بکاتو تەوەکول تەنیا لەسەر ئەو بکات، رەهبەت هەڵی نیێ
بۆنەوەی فەرمانبەرداری بێ چۆنو چون هەر لەو بکات (الرحمن الرحیم) (مالك یوم
الدین)، ئەمجارە نەتیجەی کارو کردەوە بێ بە(ایاك نعبد) (وایاك نستعین) کەئەمە
لێکدانەوەی ئەم ڕستەی (الحمدلله رب العالمین)ە کەلەبەشی ئەمری ئختیاری
کەلەلایەن بەندەوە سوپاسگوزاریەو لەلایەن خوداوە خاوەنداری (ربوبیە))،
پەیوەندی ئینسانیش لەگەڵ ئەم جیهانە بەوەی کە ئینسان دارای هێزی زانستە ئەم
جیهانە بەڵگەیە بۆی، دەبێ بەدوا دا چون بکات بەمە کە جیهانبینیەك راستو
دروستە دەرکی بکات، کە گونجاوە لەگەڵ ناخی ئینسان. ئەمە خولاصەی
جیهانبینیەکە کە قورئان ئەیدا بە ئینسانێکی ئیماندار کە بیرو بۆچونی چۆنە
بەرامبەر خاوەنی ئەم کەونە، بەرامبەر خۆی، بەرامبەر ئەم کەونە.

لەبەشی دوەمیش داوای موبارەزە دەکاتو تەحەددا دەکات لەبەشی زانستی
تەجروبە:

لەدوای ئەوەی لەقەرنی (١٨)و (١٩) زانستی تەجروبە زۆر بەرەو پێش چو،
لێکۆلەرەوەکان وا مەغرور بوون خەریك بو بڵێن ئیتر شتێك نەماوە کە ئێمە پێی
نەزانین لەم جیهانە، مسولمانەکانیش بۆئەوە کە بەرگری بکەن بەبیرو بۆچونی
خۆیان لە ئابڕوی ئیسلامو لە قورئان کەوتنە شوێن ئەوە هەر نەزەریەیەك
لەغەربەوە دێت بگەرێن لەقورئان موافق لەگەڵ ئەوە شتێك بدۆزنەوە،
بەلێکدانەوەی هەندێکیان ئەو نەزەریە تەئیدی قورئان بکات، بەم جۆرە لەسەر
قورئان بەجواب بێن، ئەوەیە کە زۆر بەحرسو بەپەلە هەرشتێك کە کەمترین جێی
دەستگیرەی بێ دەستی پێوە دەگرنو لەقورئان تەئویلی دەکەن، لەلایەك کە
موافق بێ لەگەڵ تەجروبەی غەرب، بەبێ چاو پێداخشاندن کەئایا هێشتا نەزەریە
یان گەیشتوە بەسنوری راستی، کە ئیمکانی نیە رەد بکرێتەوە، لەدوای ئەمە ئایا

راستی هەر لەم چوارچێوەیە یان شتی تریش هەیە، لەم زەمینەیە(یەك ئینسان دەبێ زۆر ورد بێت، ئەو نەزەرییە نەگاتە سنوری راستی ئەرزشی وای بۆ دروست نەبێ کە خەریك بێ لەقورئان تەئیدێکی بۆ بدۆزێتەوە، تەوفیق بدا لەبەینی ئەوو لەبەین قورئاندا،دوو لەدوای ئەوەی تێگەیشت لە راستی، زۆر نەکات لە قورئان مانای بدا بەلای ئەودا، بەڵکو لێرە تەنها ئافەرینێك بکات لەبەشەری زەعیف کە لە زەمینەیەك زۆر سنورداردا توانیویەتی ڕاستیەك لە ڕاستیەکانی کە قورئان بەواتای کردوە پێی بگات، نەك دڵی خۆش بێ کە قورئان ئابڕوی سەندراوەتەوەو تەئیدی کراوە بە زانستێك لە زانستی بەشەر ، لەدوای ئەوەی دەبێ هۆشی بێ ئەگەر قورئانەکە دەلالەتی گشتی تر بو مونحەصری نەکاتت لەشتێك کە علمی بەشەر پێی گەیشتوە، ئەکرێ زەمانێکی تر چەندەها بەرامبەری ئەوەی هەبێ).

نمونە بۆ ئەوەی کە ئینسان نابێ پەلە بکات: ئایەتێك لە سورەی قیامە هەیە لەگەڵ مەسەلەیەك کە ئەمرۆ کەشف کراوە ئەویش ئەوەیە شوێنەواری هیچ کام لە نەخشەکانی پەنجە (پەنجە مۆر)ی ئینسانەکاتن وەك یەك نین، ئەڵێن ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ ﴿بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ﴾ بەواتا ئەم راستیە دەکات، دەفەرموێ: ئێمە تواناین لەسەر ئەوە کە ئەنگوشتەکانی ئینسانەکاتن رێك و پێك بکەین. بەتایبەت لەناو هەمو ئەندامەکان ناوی ئەمە دەبا ئەمەتایبەتمەندیەکی هەیە دیقەتێکی زیاتری دەوێ، کەلەمەجالی بەواتا قودرەتی پێ داواتە خۆی ناوی ئەمە دەبات، بەڵکو یەکەمین ئیشکال لەم زەمینەیە کە وشەی (بنان) لە ناو زمانەوانەکاتن جێی ئختلافە کە (بنان) بۆ هەمو ئەنگوشت بەکار دەهێنرێ یان تەنها بۆ سەر ئەنگوشت بەکار دەهێنرێ، کەوابو لێرە جێی ئەوە نامێنێتەوە کە بڵێین ئاوایە، کاتێك دوو ئحتمال دەبێ لەمانای ئایەتێکداو ئێمە هەڵی بنێین بەلایەك. واتە ئەگەر شتێك لەئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی ئینسان رێك کەوت لەگەڵ قورئان ئەوە

...و نافەرینێك لەبەشەری زەعیف دەکەین، ئەگەر رێك نەکەوت ئەوە بەمانای ...ی قورئانە.

راستیانێك لە زانستی تەجروبە لە قورئان بەیان کراوە دوای چەندەها مەرحەلە، دوای هەزاران ساڵ لە تەمەنی بەشەر گوزەراوە ئنجا ئینسان گەیشتۆتە ئەوەی دەرکی راستیەك لە راستیەکان بکات، کە ئەمەش بەئاراستەی کاتو شوێنو وەزعیەتی کەسێك کە ئەو قورئانەی عەرز کردوە موعجزەیە، کاتێك بەشەریەت بە هەزاران ساڵو هەزاران تەجروبە دەکات بە دەرکی راستیەك بەڵکو ئینسانێك بەوشێوە زۆر سادە بەواتە دەکات، ئەویش نەك خۆی بنوێنێ بەوەی کەخەریکم راستیەکی علمیم کەشف کردوەو عەرزی دەکەم، بەڵکو بەوەی کاری قورئان ئەوەیە کە یەك: جیهانبینیو تەصەوراتێك دروست لە خاوەنی جیهانو خاوەنی ئینسان بدا بەم بەشەرە. دوو : هانی ئینسان بدا بۆئەوەی (بصر،سمع، قلب) بخاتە کارو متابەعەی ئەم ئایاتە لە (ئافاق) لە (انفس) بکات.

یەکێکی تر لەو زەمینانەی کە قورئان داوای موبارەزە دەکاتو تەحەددا دەکات:

زەمینەی هەستی چاکەو هەڵهاتن لە شەڕ، واتە لەزەمینەی ئەوەی ئەبێ چی بکرێو ئەبێ چی نەکرێ، بەڵکو لەم زەمینەیە وەك یەکەم نیە کە قیاسی ئەو شتانەی بەشەر پێی گەیشتوە بکرێت، لەگەڵ ئەوەی قورئان عەرزی کردوە تەرجیح بدەین لەبەینیان، بەڵکو لێرە قەزییەکە لەوە سەرەکی ترە، لێرە مەسەلە ئەوەیە کە ئینسان ئیمکانی نیە مەحاڵە بگات بە کەسپی مەعریفەت هەتا بۆ یەك دانە حوکمی جوزئی، لێرە مەسەلە ئەویە لەبەرامبەر هەر ڕاستیەك لەو ڕاستیانە بابەتگیریەکی تایبەت هەیە، دەبێ ئینسان بەوە بگات کە ئەم جیهانی هەستیە بەوجودی جۆراو جۆری شتەکان یەك دەزگای تەنیایە، نا هەماهەنگ بونی کاری دوو

دانه بەش لەبەشەكانی دەبێتە تێكچونی كاری ئەم دەزگایە، لەبەر ئەوە ئەبێ جولانەوەی هەر مەوجودێك لە مەوجودات سازگار بێ لەگەڵ جولانەوەی تەواوی مەوجودات وەكو ئەوەی (ابراهیم) علیه السلام داوا لە مەلیكەكەی سەردەمی خۆی دەكات كە هیچ (رب)ێك بەمانای فەرمانڕەوا نیە جگە خودا، دەفەرموێ: فەرمانڕەوای من خاوەنی من مردنو ژیانی بەدەستە، واتە كەسێك كەلەبەشی غەیرە ئختیاری خۆمو كەسانی تر بەدەست ئەوە هەر ئەوە كە دەتوانێ لەبەشی ئختیاریشدا پەیوەندی بێ تا جولانەوەی بەشی جگە ئختیاری لەگەڵ بەشی ئختیاری هەماهەنگ بكات، كابرای سەفیە وادەزانێ ژیانو مردن ئەو شێوە زاهرێیە كە كەسێك بكوژێ یان كەسێك وێڵ بكاتو نەیكوژێ (انا احیي وامیت) دیارە جوابی ئەوە زۆر ڕۆشنە، ئەمجارە (ابراهیم) علیه السلام ئەو دەلیلەی تریش باس دەكات كەهەڵسوڕێنەری ئەم بونەوەرە خودای منە، جا ئەگەر تۆ توانیت جولانەوەی خۆر ئاراستە بكەی بەكەیفی خۆت، دەی فەرمو خۆر لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێ تۆ بەپێچەوانەوە لە رۆژ ئاواوە هەڵی بێنە، ئەوكاتە من تەسلیمی فەرمانەكانت دەبم (فبهت الذی كفر) ئیتر سەرگەردان دەبێو جوابێكی نابێ لەدوای ئەوەی راستی بۆ ڕۆشن بۆتەوە، هەر ڕاستیەك لەڕاستی جیهانی هەستی كە ئینسان دەركی دەكات، دەبێ بابەتێكی تایبەت لەبەرامبەری بگرێ بە نەفی یا بە ئسپات، جالەبەر ئەوەی ئینسان هێزی تەصەوری هەیە ئەكرێ بابەتگیری جۆراو جۆر تەصەور بكات، بەڵكو كامیان سازگارە و گونجاوە هەر ئەوەیان دروستەو دامەزراندنی ئەوە بەجێیە (بەرێگەی تەصفیە ئینسان دەتوانێ بگات بە بابەتگیری تەواو، چۆن ئەو بابەتە دەگرێ ماوەیەك لەگەڵی دەبێ ئنجا دەزانێ ئەمە هەڵەیە دواتر بابەتەكەی دی دەگرێ دواتر دواتر... چیە ئینسان خەریكە تەجروبە دەكات لەوانەیە توشی زۆر هەڵەی گەورە ببیو لەوانەیە پێی ڕانەگات) كەوابو ئەوە ڕێگەیەكیانە كە ئینسان

٢٠ اب بـه بەبابـەتی راسـتو دروسـت (رێگـەی تەصـفیە) (رێگـەی تەجروبـە) بگـات
٠٠ەەلە بونی بابەتەکانی تر کەتوشیان بوە، بەڵام لێرە شتی هەڵەی بۆ دەردەکەوێ
٠ ٠ەلام صـەحیح بـونی بابـەتگیری بـۆ سـابت بـێ، ئەمـە لەهەنـدە شـێوەیەك غـەیرە
ممکنە، کە ڕەنگە هەر ڕێـی پـێ نـەبا، لەهەنـدێکیش زۆر بەزەحمـەت پێـی دەگـات،
رێگەی تریش ئەوەیە کە کەسێ علمی تەواوی بەسەر هەم ئەو ئینسانەو هەم بەسەر
تەواوی جیهانی هەستی بێو بینەری تەواوی جوڵانەوەی مـەوجودات بـێ، تـا کاتێك
بابەتگیریەکی تایبەت بۆ ئینسان دیـاری دەکـات، چـاوی لـەوە بـێ کـەبزانێ لەگـەڵ
جوڵانەوەی باقی مەوجودات پێچەوانە نیە، ئەگەر ئینـسان تـوانی ئـاوا علمـی تـەواو
پەیا بکات یا دەست بکات بە قانون گوزاری، دیارە ئەمەش مەحاڵە.

دەمینێتەوە ڕێگەی (استدلال) واتە بەکۆمەکی تەصەوری زانیاری ئینسان بگـات
بـە دەرکـی نادیارەکـان (مجهـولات)، ئەمـەش هـەروەك لەپێـشدا گوتمـان ئـەبێ
پەیوەندیەکی وەها لەبەینی ئەم دیارو(معلوم) نادیارەدا(مجهـول) بێـت، کـە زانینـی
مەعلومەکـە لـە زهنـی ئینـسانەکە بیکێـشێ بـۆ دەرکـی نادیارەکـە (مجهـول)،
{(استدلال) ئاوایە کە ئەویان هات بەزهنیدا هەتا ئیتر ئختیار لەدەست خۆشی نـەبێ
ئەوتریشیان بێ بە زهنیدا} ئەمەش کاتێك کە پەیوەندیەك لەبەینیان ئیمکانی نـەبێ
مەحاڵبێ ئەم دوانە لێك جودا بنەوە.

تەصـەور یـان ئلتزامـی یـەك نـەبن، ئەمـەش تـەنها پەیوەنـدی حـەل کردنـە کـە
تەصەوری ئەو حـەل کرنـە کـرا حەتمـەن تەصـەوری گیراوەکـە دەکرێ، تەصـەوری
گیراوەکە کرا هی حەل کردنەکە دەکرێ، دەی لەبـەینی راستیەك کـە (بـصر) یـان
(قلب) دەرکیان دەکات راستی جیهانی بینراوو جیهانی غەیبە، لـە بـەینی زانیاریـەك
کە ئەبێ چی بکەینو چی نەکەین ئەم پەیوەندیە نیە، چونکە ئێمە خەریکین ئێـستا
لەم زەمانە بریار دەدەین کەئەبێ چی بکەین یان ئەبێ چی نەکەین، لەگەڵ ئەمەشدا

ئەم راستیە لەزۆر زەمانەوە بوە، ئەو راستیەی لە جیهانی غەیب یا لە جیهانی بینراو (شهادە) هەر ئەوەی لە سەرەتاوە ئەو راستیە وجودی بوە ئێستا ئێمە خەریکین بڕیارێك دەدەین بابەتێك دەبێ بگرین یا نەی گرین لەبەرامبەر ئەو راستیە، شتێك ئێستا دێتە وجود کە ساڵەهایە هەیە ئەمە خۆی نیشان دەدا کە پەیوەندی گێراوەو حەل کردن لەبەینیان نیە، کەنەبو گەیاندنی زهنی لەیەکێکەوە بۆ ئەوی تریان ئیمکانی نیە، لە ئەنجامدا هەرگیز لە زانراوێك لە زانراوەکانی ببینین یان (قەلب) ناگات بە نادیارێك لە نادیارەکانی بەشی ئەبێ چی بکەین یا چی نەکەین، لەنەتیجە ئیمکانی نیە مەحاڵە ئینسان یەك دانە حوکم لەڕێگەی (استدلال)ەوە کەسپ بکات پێی بگات یا دەرکی بکات، لێرە مەسەلەی قیاس نیە لەبەینی بەدەست هێنانی ئینسانو قورئان، لێرە قورئان دەفەرموێ بەشەر تۆ هیچت نیە، لێرە بەشەر پەکی کەوتوە علمی تەواوی نیە، (استدلال)یش لەم زەمینەیە کار ناکات (جا ڕێگەی تەصفیە کەباسمان کرد ئەویش تەنها بۆ بەشی سلبی کار دەکات یان یەقین پەیا دەکات بەهەڵە بونی ئەوانەی هەڵە بونیان دەردەکەوێ، بەڵکو یەقین بە دروست بونی بابەتێك پەیا ناکات )،کەوابو لەزەمینەی ئاساری هەستی دوەم بەشەرو لەپاڵیشدا جن هیچیان نیە تا لەگەڵ ئەوەی کە قورئان عەرزی کردوە قیاسی بکەن.

زەمینەی ئاساری هەستی سێیەم (هەستی جوانیو هونەر) کە عیبارەتە لە هونەر هەرگیز لەبەشەر دانەبڕاوە، ئەمەش بەشێکی عیبارەتە لە (هونەری فەصاحەتو بەلاغەتی قورئان) کە زۆرتر لێکۆڵەرەوانی پێشوو لەمە بەحسیان کردوە، فەصاحەت پەیوەستە بە زاهری (نظم)ی قورئان بەم جۆرە کە کەلیمات دەنگیان، (ترکیب) پێکهاتەی حەرفەکان بەیەکەوە نوسانی ئەم کەلیمانە بەجۆرێك بێ کە بەرامبەر هەستی ناخۆشی پێ نەکاتت، پێکهاتنی ڕستە بەندی وشەکان

هەروەك پیت ئەوانیش سازگار بن‌و نا هەماهەنگ نەبن، بەیەكەوە گونجاندنەكە جۆرێك بێ‌و پێكهاتن‌و رستە بەندیەكە جۆرێكی تر بێت، كە ماناكان بۆخۆیان پێكهاتەیەكی تایبەتیان هەیە، پێكهاتنی لەفزەكەش دارای ئاوا پێكهاتنێكی ئاسایی بێت، هەروەها مانا كە پێكهاتەیەكی فطریەو پەیوەستی سەلیقەو گونجانێك تایبەتیان هەیە، لەفزیش دارای گونجاندنێك بن كە بەیانگەری ئەو ماناو راستیە بێ لە دڵی ئینسان دا، بۆنمونە ئەگەر لەزمن (فعل) بەر لە( فاعل) بێ لەدەرەوە (فاعل) بەر لە( فعل) نەبێ، بەم شێوە. مانای غەیرە مەبەستی بۆ مەبەست تێدا نەبێت، بۆنمونە زۆر ئیسفادە دەكرێ لە زمانی عەرەبی لە عیباراتێك كە (ئستعار)ی نیە (كاتێك لەناو عەرەب كەسێك زۆر سەخیە دەڵێن سەگەكەی ترسنۆكە، واتە چی؟ واتە ئەم سەگە زۆری لێدراوە لەبەر ئەوە ترسنۆك بوە، بۆ زۆری لێدراوە چونكە ئەم ماڵە زۆر هامو شۆی دەكرێ، واتە مێوانی زۆر دێ ) ئەمە زۆر سادە ئینسان لە ترسنۆكی سەگەوە دەگات بەوەی خاوەنەكەی سەخیە. بەڵكو كاتێك عیبارەتێك بەكار دەهێنرێ مانایەكی هەیە، كەلە مانای یەكەمەوە بۆ مانای مەبەست زۆر بەزەحمەت ئینسان پێی دەگات، كەئەمەئیتر لەفەصاحەت دەری دەكات، بۆنمونە كەسێك بڵێ شەرت بێ ئەوەندە بگریێم تا چاوم وشك دەبن (كە زاهریەكەی ئاوایە، ئەوەندە بگریێم كە ئیتر توانای فرمێسك رشتنم نەمینێ) بەڵكو كابرا هەدەفی ئەوەیە كە ئەوەندە بگریێم تا كۆتایی بەخەم دێ دوایی بكەم بە شادی، ئەمە لە مانا لەفزیەكەوە غەیرە مەبەست دەگەیەنێ بە مانای مەبەستەكە. هەروەها شتانی تر هەن لەم بابەتەوە كە پەیوەستە بە وشەكان‌و جێگیركردنی وشكان لەپاڵ یەكدا، رێكخستنیان بۆ گەیاندنی مانای مەبەست، كەئەگەر لەوانە بو كە زۆر رۆشن مانای مەبەست دەگەیەنێ دەڵێین ئەم وتەیە فەصاحەتی هەیە.

*بەلاغەت : عیبارەتە لەوە کە ئەم وتەیە کاتێك دەوترێ کەبکەوێتە گوێی بیسەر، واتە ئەو قسە کەرە لەگەڵ زروفو مەرجەکانی بیسەر ئەم وتەیە بەیان دەکات ( واتە قسەی بەجێ بکات)، بۆنمونە کەسێك زهنی خاڵیە لەوەی کە سەرۆك کۆماری فلان وڵات مردوە، هیچیشی لێنازانێ، یەکێك بێت ئەوەندە سوێندی بۆ رێز بکات کە مردوە، ئەوە نەك تەنها خزمەتی بە قبوڵکردنی قسەکەی نەکردوە، بەڵکە هەر ئەو کەسە شەك پەیا دەکات، کە واتە بۆ چی سوێند دەخوا کەمن هیچ رەددێکم نەبو. ئەگەر بیوتایە سەرۆك کۆماری فلان وڵات مرد باوەری دەکرد، بەڵکو ئەم تەئکیداتە بەم سوێندانە لەجێی خۆی نەبوە. هەروەها بەپێچەوانەوە ئەگەر کەسێك رەددی هەبو نسبەت بە شتێك، حاڵەتی ئنکاری هەبو ئەو بێ هەروا زۆر سادە بەواتە بکات هیچ تەئکیدی نەکاتتەوە، ئەمەش جێی خۆی ناگرێت، چونکە بەسادەیی بەیان کردن هەرئەوەندە مەسەلەکە باس دەکات بەشێوەی ئحتمال، لێرە شتێك بەشێوەی ئحتمال لە زهنی پەیا بو بەلام لەوانەیە شەکی هەبێ، یان هەتا ئنکاری دەکات، لێرە هەروا بێ تەئکید کردنی دەرد ناخوا، بەجێ قسەکردن وەلەگەڵ حاڵەتی ئەو کەسەی قسەی بۆ دەکرێ، مەرجێك کە ئەو قسەی تیا دەکرێ پێی دەڵێن بەلاغە.

جا ئەمە نسبەت بەیەك کەس یا کۆمەڵەیەکی دیاری کراو ئەگەر ئاسان بێ ریعایەت بکرێ، هەتا بۆ کەم کەس ئەمە ئاسانە ریعایەت بکرێ بۆ کۆمەڵەیەکی بێ سنور، بۆ نمونە بۆ گەلێك بۆ یەك تەبەقە لەبەشەریەت لەیەك زەماندا ئەبێ چۆن بێ، لەولا بۆتەواوی بەشەریەت لەو کاتەوە کەئەم وتەیە دەردەچێ دەبێ ئیتر چۆن بگاتە هەموی. یەك لەروی فەصاحەتەوە کەلیماتێك کە هەڵدەبژێردرێتن بۆ گەیاندنی مانا، پێکهاتەو رێکخستنێك کە بەم کەلیماتە دەدرێ بەجۆرێك بێ کەهیچ کاتێك نەبێتە هۆی دروست بونی ئیشکال لە گوێگر. دوو هەر کاتێك لەهەر شوێنێك لەهەر

مەرجێكدا هەر كەسێ ئەو وتەیە دەبیستێ بەجێ بێ بۆیو هیچ كات نەبێ كە ئینسانێكی ژیرو وریا بتوانێ سابتی بكات تا ئەو كەلامە بۆئەوە بەجێیە بۆ ئەو مەرجانە بە جێ نیە. هەڵبەتە بەمەرجێك هەر بەو رەوشە كەئەو قسەكەرە خۆی دیناوە وشەكانی لەهەر كاتو شوێنێك عەرز بكرێ، بۆ نمونە لەم قورئانە بەیان دەكات بانگەواز بە حیكمەت بێت، لەپێشدا داعیەكە دەبێ لە خودی ئەم قورئانە حیكمەتەكە بگرێو ببێتە ئەهلی حیكمەت تا بەو جۆرە كە قورئانەكە دەبێ عەرز بكرێ وا عەرزی بكات، یا بەگشتی بەشەریەت لەلایەك دادەنێینو قورئانیش لەلایەكەوە، بەشەریەت بەتایبەت مەندی گشتیەوە دادنێینو ئەم قورئانەش دادەنێین بزانین چی وای تێدایە كەلەگەڵ بەشەر ناگونجێ، لەگەڵ زاتی بەشەر رێ ناكەوێت، قورئانێك كە لە بینشو جیهانبینیدا گۆڕانێكی تێدا نیە، چونكە بەواتە راستیە بەشێك لە بەشەكانی نەهێشتۆتەوە كە لازم بێ بەشەر بیزانێت، بێ ئەوەی كە بەواتە تەواوو كۆتایی بكات، بەڵكو هەر ئەو قورئانە كە جوزئی ترین مەسائلی بەیان دەكات، تائەو سنورە كەبۆ ئینسان پێویستە لەمەسائلی ئەحكامو لە بابەتگیریو لە بەشی ژیان ئینسان كەئەبێ چیبكاتو ئەبێ چینەكاتت، لە زۆرێك لەمەسائلی گرنگ بەشداری (جُزئیات) بەشەكان ناكات، بەڵكە (كُلیات) گشتیەكان بەیان دەكات تا ئینسان ئینسانە ئەو (كلیات)ە سازگارە لەگەڵییەتی، بۆ نمونە (كلیات)ی نیزامی ئیقتصادی، نیزامی سیاسی، نیزامی ئجتماعی، (جُزئیات) ئصولو زەوابتێك دادەمەزرێنێ كە بەپێی ئەو زەوابتو ئصولیاتە لەهەر كاتو شوێنێك بەپێی نیاز (جُزئیات) لەو (كلیات)ە دەردەكەن. بەڵكو (جزئیات)ێكیش تا بەشەر بەشەرە هەر ئەوانەی بۆ سازگارە، بۆنمونە ئەم قورئانە لەزەمینەی ئقتصاد (كلیات) بەیان دەكات لەزۆر شت، بەڵكو لەو زەمینەیە(جزئیات) بەیان دەكات ناگۆڕێ، بۆنمونە لە نوێژ بەتەفصیل بەیان دەكات، دەڵێ دەمو چاوت بشۆ ئنجا دەستت بشۆ تا ئەژنۆ

سەرتان مەسح بکەن پێکانتان بشۆن تا گۆزینگ، قورئانێك لەمەسائلی گرنگی ئیجتماعیو سیاسی و ئقتصادیدا زۆرێك لە(جوزئیات) سکوتی لێ دەکات، بۆ چونکە ئەم قورئانە بەجێ قسە دەکات، ئەبێ قسەیەك بکات کە بۆ هەمیشەی بەشەریەت دەرد بخوات، دەی (جزئیات) لە مەوردی نوێژ یان رۆژو یان شتی تر تا بەشەر هەیە ناگۆرێت، بەجێیە کە بەیان بکرێت، بەڵکو لە ئقتصاد یان لە سیاسەت یان لە ئیجتماعیدا ناکرێ (جُزئیات ) بەیان بکرێت، (جُزئیات) لەمانە دەگۆرێ بەپێی مەرجەکانی کاتو شوێن، بۆیە فەقەت (کُلیات) بەیان کراوە.

لەزەمینەی فەصاحەتو بەلاغەت :_

قورئان لەکاتێك هات کە فەصاحەتو بەلاغەت گەورەترین هونەر بووە، لە بازاری (عُکان) گرنگترین پێشبرکێی تیا دەکرا، لەو کاتی عەرزی کرد کاتێك کە (معلقات السبع) جولآنەوە دەکەن، هیچ کەس زاتی نیە بروا بە دەوریاندا، لەو کاتە ئەو ئینسانە بەو تایبەتمەندیە کە گوتمان چەند وشەیەك عەرز دەکات کە بازاری شیعرو شاعیری و هونەر تەعجیب دەکەن، زەربەیەکی وادەخوا کە ئیتر شاعیرێك نیە هەڵسێتەوە تا دوایی هەندێك لە شاعیرەکانی ئیسلامی وەك (حسان) و (کعب بن زوهیر) و (عبدالله بن رواحە)... کە ئەمجارە ئەوان دەچن لە مەکتەبی قورئان بینشو جیهانبینی وەردەگرن، مەجبورن شوێنکەوتوی شێوەی بەواتە قورئان بکەون. ئا ئاوا داوای موبارەزەی کرد لەزەمینەی فەصاحەتو بەلاغەت، ئەویش لەکاتێك کە زمانی عەرەبی گەیشتبوە لوتکە، نە لەوەوبەر گەیشتبوە ئەو سنورە، نەلەدواییش هەرگیز ناگاتە ئەو سنورە، هەتا تەماشا دەکەین دوای ماوەیەك کەم زمانی عەرەبی دابەزینێکی وای بەخۆی بینی خودا وەعدی داوە کە قورئان بپارێزێت، ئەگەر نا زمانی عەرەبی وێران دەبوو عەرەب نەیاندەزانی بە عەرەبی تەواو قسە بکەن، عەرەب ئێستا نیازی بەوە هەیە کە قورئانی بۆ تەرجەمە بکرێت، لەئەنجامدا هەر

کەسێك لێرەولا بگاتە سنورێك لە فەصاحەو بەلاغەی جاهلیەت ئەوە لە قورئان دەستی کەوتوە. ئیتر لەبەرامبەر قورئان کەوتنە سەر چۆك نەیانتوانی موبارەزەی قورئان بکەن بەتایبەتی ئەو کاتە ئەو هونەرە لەجێی خۆیدا بو نەیانتوانی ئیتر هیچ کاتێکی تر ناتوانن.

که پێیان وترا، کە ئەگەر وەك سوەرەیەك لە سورەکانی قورئان شتێکی ئاوا بڵێن ئیتر من دەچمە دواوەو دەڵێم: بەڵێ دەکرێ وتەیەکی ئاوا بەشەر بیڵێ، ئەو عەرەبانە ئەگەر پێیان بکرایە یەك دانە سورە وەك قورئان بڵێن نەجاتیان دەبو لەوەی کە خوێنی بەرێزترین پیاوەکانیان برێژێنن، نەیاتوانی لەم زەمینەیە کەمترین بەرەو پێشچون بکەن.

یەکێك لەو سەفیهانەی لەجوابی داوای موبارەزەی قورئان ماوەیەك خەریك بو کە گوایە ئەویش شتێك وەك قورئان عەرز بکات (مسیلمەی کذاب) بو کە ئیددعای پێغەمبەرایەتی کرد، بۆ نمونە وشەکانی ئا بۆمانن:

( الفیل ما الفیل وما ادراك ما الفیل له خرطوم طویل ).

وەك ئەوەی ( القارعة ما القارعة وما ادراك ما القارعة) یان (الحاقة ما الحاقة وما ادراك ما الحاقة) ئەو بێ چارەیە بێ خەبەر لەوەی لە ڕاستیەك کە ئەم عیبارەتانە ئەدای دەکەن ئەو وا دەزانێ هەر وشەیەك (ال) یکی پێوە بنووسێنی، دووەمجار (ما) یەکی لە پێشی دا بنێی، بۆ سێیەم جار (وما ادراك) ەی لە پێشی دانێی، ئیتر تەواوە.

هەتا ئەگەر نەچینە زەمینەی ڕاستیش ئەو ئاهەنگەی لە وشەی (الحاقة) هەیە خۆی تەئسیر دەکات لە بەرامبەر.

دوای ئەوەش هەروا کەسانێك بون هەوڵیان داوە وەك (ابن مقفع) هەندێك پێیان گوت بەڵکە تۆ کارێك بکەی وەك قورئان شتێك بنوسی ئەم بێچارەیە سی ساڵ هەر

نوسیو فرێیدا هەر بەم شێوە، لە کۆتاییدا هیچی پێ نەما جگە ئەوەی ناتوانایی خۆی دەر بخا.

ئەمە تەنها بەشی فەصاحەتو بەلاغەتی قورئان.

گۆشەی (فن القرآن) هونەری قورئان:

کە لە ڕابردو ڕوی تێنەکراوەو (سید قطب) ڕەحمەتی خودای لێ بێت مقدارێك کاری تیا کرد، پێشەکی بۆ چنی کەلەم زەمینەیە لێرەو لا کار بکرێ بۆروی مۆسیقیو ئاهەنگی قورئان.

دوو جۆر علم هەیە یەکێك لە ئایاتەوە بۆ دەرکی زاتی خودا، دوو لەزاتی خوداوە بۆ دەرکی راستی، بۆ نمونە کەسێك لێکۆڵینەوەیەکی زۆر لە ئایات دەکات، دوایی یەکێك لە سیفاتی خودا دەرك دەکات، بەڵکو ڕێگەیەکی تر بە لێکۆڵینەوەی هەندێك لە ئایات بە دەلیلی وەحی یان هەر شتێکی تر سیفەتێك لە سیفاتی خودا بناسێت، جا لەو سەرەوە بێتەوە بۆ دەرکی راستی، وەك کە من دەزانم خودا (الرحمن الرحیم) ە یانی هەرچی دەرد هەیە دەرمانی هەیە. هەرچی کێشە هەیە چارەی هەیە. هەرچی لازمی جولانەوەی ئینسانە داناوە.

ئەگەر بەشەر لەزەمینەی مۆسیقی کار بکاتو بچێتە پێشەوە دەبێ کۆتایی بێ بەوەی تەنها مۆسیقایەك سازگار بێت لەگەڵ ڕەوانی ئینسانو تێکی نەداتو لازم بێ بۆ ژیان ئینسان، تەنها مۆسیقیەك ئەمە مۆسیقی قورئانە.

(سید قطب) ڕەحمەتی خودای لێ بێت جارجار لە( تصویر الفني) و ( في ضلال)یشدا جار جار گۆشەیەك بەیان دەکات لە هونەری قورئان.

بۆنمونە لە سورەی (ضحی).

(٥) ئایەتی یەكەمی سورەی (ضحی ) (استدلال) بە ئایاتی كەونی لەسەر ئەمە كە خودا پێغەمبەری خۆی علیه الصلاة والسلام نەجێهێشتووە نەرقی لیٚ بوەتەوە بۆ ماوەیەك. لەئەنجامدا دەبیٚ بگات بە كەمالٚ استدلال دەكات بە (ضحی – لیل).

چۆن خۆر لە دوای ئەوەی لە زەعیفترین شێوە هەڵدێت دوایی بەرە بەرە دەجولێت بەرەو كەمالٚ.

هەروەها شەو كە دێت لە سەرەتا لە زەعیفترین تاریكی دەست پیٚ دەكات تا دەگاتە حالٚەتی (اشباع) كە لەوە تاریكتر نابێت.

لێرە ئەگەر هەمیشە (ضحی) بوایە یا هەمیشە (لیل) بوایە، یا هەمو مەوجودات دەتوایەوە لە گەرمان یان سڕ دەبون لە سەرمان، هەردوو بۆمان نیشانەی رەحمەتە لەدوای خۆر هەڵاتن شەو داهاتن، تاریكی نیشانەی رق لێكەوتن‌و تەرك نیە نیشانەی رەحمەتە تۆش بەینێكە كە وەحیت لیٚ پچراوە نیشانەی ئەوە نیە كە خودا رقی لێتە یا وازی لێهێناوی نا، لازمی تەواو بونی تۆ ئەوەیە بەین بەین ئیسراحەتێك بكەی هەروەك چۆن خۆر جوڵانەوەی هەیە بەرەو كەمالٚ، هەروەها شەو جوڵانەوەی هەیە بەرەو كەمالٚ، تۆش دەبیٚ وابی هەر حالٚەتی دواییت لە پێشوت باشترە (وللاخرة خیر لك من الاولی) تا ئەو دەگاتە حالٚەتی (ضحی) رۆشنایی تەواو تۆش دەبیٚ بگەیتە (ولسوف یعطیك ربك فترضی) حالٚەتی كەمالٚ.

(والضحی واللیل اذا سجی) (ما ودعك ربك وما قلی) (وللاخرة خیر لك من الالی) (ولسوف یعطیك ربك فترضی)

ئەمجارە (استدلال) بە ئایاتی (انفس)ی هەر لەسەر ئەم قەزیە بەیانی ئەوە دەكات سیٚ دانە بەڵا هاتە رێت، ئەگەر خودا لەگەڵت نەبوایە هەركامیان بەس بو بۆئەوەی لەناوت ببا، خودا لەو سیٚ بەڵایە رزگاری كردی، ئێستا رقی لێت دەبیٚ؟ نەخێر.

(الم يجدك يتيما فأوى ووجدك ضالا فهدى  ووجدك عائلا فأغنى).

يەتيم بون خۆی يەكێكە لەو شتانەی كە پشتی ئينسان دەشكێنێ، تۆ يەتيم بووی بەڵام خودا پەنای دای نەيهێشت لە بەين بچی دڵسۆزێكی بۆ پەياكردی وەك باوكی خۆی (ابو طالب)، خودا تۆی بە رێ لێ ونبو بە دەست كەوت هيدايەتی دای بۆ سەر ڕێی ڕاست، ئێستا وێڵت دەكات نەخێر، هەروەها تۆ نەبوون بووی باڵی قورسی نەبونی بەسەرت زاڵ بوو خودای گەورە (خديجە)ی كردە قسمەتتو پارەشی هەبوو خستيە ئختياری تۆ وە (فقر) يەكێكە لەوشتانەی كە پشتی ئينسان دەشكێنێ، هەروەها خودی وشەی (فقْر) لە لەگەڵ وشەی(فَقَرَ) بۆ ئەو بڕبڕانەی پشت بەكار دێ هاوبەشن لە ماددە.

دەی خودا لەو سێ بەلايە ڕزگاری كردی ئێستا رقی لێتەو وازت لێدەهێنێ؟ نەخێر، لێرە دڵی راحەت دەكات كە جێی نەهێشتوەو ڕقی لێنەبۆتەوە.بەڵكو ئێستا داوايەك وەك تەعليق ماوە لەدوای ئەمە دەفەرموێ ئێستا ئەو مەسئەلەيە هاتۆتە پێشەوە لە ئاياتی (انفس) دەفەرموێ يەتيم بونت هاتە پێشەوە خۆت تاڵی يەتيم بونت چەشتوە دەی ﴿فَأَمَّا ٱلۡيَتِيمَ فَلَا تَقۡهَرۡ﴾ غەلەبەت نەبی نسبەت بە يەتيم خۆت دەردی يەتيم بونت چەشتوە ﴿وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنۡهَرۡ﴾ خۆت دەردی هەژاريت چەشتوە دەزانی چەندە تاڵە دەری نەكەی ئەوەی داوای شتێكت لێدەكات.

﴿وَأَمَّا بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثۡ﴾ خۆت دەردی رێ ونبونت چەشتوە ئەو نعمەتەی خاوەنەكەت كە هيدايەتە، بانگەواز بكەو باسی بكە بۆ خەڵكی.

جا لێرە لەم تەعليقە تەرتيب دەگۆرێ لە دوو ئايەی كۆتايی لە پێشدا (عائل) دوای (ضال)ە بەڵام لێرە (سائل) دەخاتە بەر (نعمت ربك) بۆ چونكە لەوێ

دەفەرموێ (ووجدك ضالا فهدى) یەکەم هەستی سەرگەردانی تێدا پەیابو هەر لە دەورانی لاویدا لەروی زوترەوە ئەوە پێشترە لە فەقیر بون کە دوای ئەو بەسەری هات بەڵکو لەدوایی لە تەعلیقەکە دەفەرموێ (سائل) بەتوندو تیژی دەر مەکە، باسی نعمەتی خاوەنەکەت بکە، لێرە مەسەلە ئەوەیە کە دوای ئەمە خۆت لەم دوو بەڵایە رزگارت بوو با ئەنجامی ئەوە بە خەڵکی تر بگات، هیدایەت دێر تر چارە سەر کرا لە چل ساڵیدا بەڵکو (عائل) فەقیر بون زوتر لە ٢٥ ساڵیدا، وە یەکێکیش لە مەسەلەی هیدایەت دەفەرموێ (فحدث) باسی بکە چونکە ئەمە مەسەلەیەکە پەیوەندی بە ئختیاری خەڵکەوەیە لەسەر تۆ باس کردنە جا ئەو خەڵکە قبوڵ دەکەن یان نا ئەمە کەیفی خۆیانە جا هەدەفی چی بو لێرە، چونکەپێغەمبەر علیه الصلاة والسلام دڵی تەنگ بو کە ماوەیەکە وەحی بۆ نەهاتوە وای زانیوە کە خودا رقی لێکەوتوە یان وازێ لێ هێناوە بەتەواوی (استدلال) بە ئایات لە (ئافاق انفس) دەکات بۆ نەفی ئەمە، لە دوای ئەوەی کە بابەتی (عائل) و (ضال) دێتە پێشەوە تەعلیقێکیش لەسەر ئەوە دەدات کە ئەویش بۆ خەڵکی هۆشی پێیانەوە بێت، ئەوانەی کە ئەم سێ دەردانەی هەیە ئامانجی سەرەکی دوو پارچەی یەکەمە (استدلال) بە ئایاتی(ئافاق انفس) تەماشا دەکەین ئاهەنگەکەی ئەوان یەکێکە ﴿وَٱلضُّحَىٰ ﴿١﴾ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ﴿٢﴾ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴿٣﴾ وَلَلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لَّكَ مِنَ ٱلۡأُولَىٰ ﴿٤﴾ وَلَسَوۡفَ يُعۡطِيكَ رَبُّكَ فَتَرۡضَىٰٓ ﴿٥﴾ أَلَمۡ يَجِدۡكَ يَتِيمٗا فَـَٔاوَىٰ ﴿٦﴾ وَوَجَدَكَ ضَآلّٗا فَهَدَىٰ ﴿٧﴾ وَوَجَدَكَ عَآئِلٗا فَأَغۡنَىٰ ﴿٨﴾﴾ بەڵکو لەتەعلیقەکە مەسەلەیەکی تازە لەدوایی هاتوتە پێشەوە ئاهەنگ دەگۆڕێ ﴿فَأَمَّا ٱلۡيَتِيمَ فَلَا تَقۡهَرۡ ﴿٩﴾ وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنۡهَرۡ ﴿١٠﴾﴾ وە هەتا (ر)ەکان خۆی هەر حالەتی ماناکە دەگەیەنێ توندیو تیژی و

غەلەبە بەڵكو ئەوەكەی تر باس كردنە باسی هیدایەت عەرز كردنێتی بۆ ئەوەی قەهرو غەلەبەی لەگەڵ بێ بەوشەی (ث) سێ نوقتەیەك زۆر نەرمو ناسكە كۆتایی پێدەینی ﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ﴾ وەهەتا دوو بەشی یەكەمیش ئایات (ئافاق انفس) تۆزێك فەرقیان هەیە لەگەڵ یەكدا تەماشا دەكەین كاتێك ئایاتی (ئافاق) تەواو دەبێ ﴿وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰ﴾ لەحنەكە بەجۆرێك دەگۆرێ لە یەكەمی ئایەتەكانەوە ﴿أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَىٰ﴾ رودەكاتە خۆی چونكە مەسەلە پەیوەستە بەخۆیەوە، ئایەتەكان هەر لەیەكەمەوە درێتژن تا كۆتایی وەك ئەو نیە. ئا ئەمە ڕوی مۆسیقی هونەری قورئانە كە پێویستی هەیە بە (متخصصین) كاری تێدا بكەن كە كۆتاییان بێ بە نەتیجەیەكی تەواو كە تەنها ئاهەنگێك سازگارە لەگەڵ ڕەوانی بەشەر ئاهەنگی قورئانەو بەس. جا قورئان ئا لەم زەمینەیە تەحەددای كردوەو تەحەددای باقیە، بەشەر بەكۆمەكی جن فەرمون بێن لەم زەمینەیە كار بكەن هەرچی بەدەست هێنانی مۆسیقیان هەیە، بیهێنن لەپاڵ قورئان دای بنێن، هەر ئەو مۆسیقیەی هەزارانی تێك داوە بەیەكدا، نەخۆشی نەفسیو شێتیو ئەو جۆرە شتانەی دروست كردوە لەناو ئینساندا، كەهەر ڕۆژێك ئاهەنگێك بێنن چەندەهای پێ شێت بكەن. ئەو كاتە بیدەن بەملاوە یەكێكی تر بێنن تابۆیان دەردەكەوێ كەهەمو مۆسیقاكانیان هەڵەو پوچن. بەڵكو بێن ئیمان بێنن بەم قورئانەو گوێ بگرن بۆ ئاهەنگی ئەم قورئانە تا ڕەوانتان لەبەشی مۆسیقی سازگار بێ.

باسی چوار دانە دەلیلمان كرد لە دەلیلەكانی بە زاراوە ئسپاتی وجودی خودا، جا ئێستا چەند رونكردنەوەیەكی پێویست لەسەر ئەم دەلیلانە:-

١–لەدەلیلی ئیمکان کەدەلیلی فەلسەفیەکانە : هەر لە زوەوە بۆ حەلی ئەم مەسەلەیە بۆ ئسپاتی وجودی خودا یان نەفی ئەمە بابەتی جۆراو جۆر هاتە پێشەوە، هەندێك لە شوێنەواری یەئسو ناتوانایی لە ئسپاتی ئەمە یان لەبەر هۆکاری تر هەڵساون، وتویانە ئەسڵەن ڕاستیەك وجودی نیە لەم کەونە هیچ نیە خەوو خەیاڵێکە وایان زانیوە ئەگەر ئەم ڕاستیە ناو بنێن خەوو خەیاڵ لەکۆڵیان ئەکەوێتو نەجاتیان دەبێ لە زەحمەت کێشان بۆ گەیشتن بەئەنجامێکی کۆتایی لەم زەمینەیە، لێرە هەرچی باسیش بکەی بۆ ئەوانە ئەم باسەش هەر بە خەیاڵ دادەنێنو وەڵامێکی نیە، ئەرزشێکی واشی نیە کە ئینسان گرنگی بدا بەوانەوەو باسێك بکات.

–گروپێك وتویانە ئەم کەونە ئەم جیهانە خۆی قەدیمە پێویستی بەکەسێك نیە، پێویستی بەوە نیە کەسێك قەناعەتی هەبێ یان نەبێ، ئەمەش لەدەلیلی دووەم دەلیلی (حدوث) بە تێڕوانینی گۆڕانکاری ئەم جیهانە بۆمان ڕۆشن بۆوە کە شتێکی نادروستە ئیمکان نیە شتێك کە گۆڕانکاری بەسەر دابێ قەدیم بێ.

گروپێکی تر وتویانە قەدیمەو پاڵی دایتە سەر خودا، کەئەویش قەدیمە، واتە خودا هەمیشە بوە ئەم جیهانە وەك سێبەری ئەو بوەو لەگەڵیدا بوە، چونکە خودا سەرەکیەو ئەم جیهانە گیراوەی ئەوە، ئیتر لێك جیا نابنەوە، کەوابو خودا هەمیشە بوە، جیهانیش هەمیشە بوە لەگەڵی، ئەم گروپە (اشتباه) یان لەمە بوە کە ئیرادەیان لەبیر چۆتەوە، کە خودا قەدیمە ئەو هەڵسوڕێنەرو دروست کەری ئەم جیهانەیەو ئیرادەشی هەیە، ئیرادە دەکرێت لەناو زەمانەکانتی ڕوداوی ئەم جیهانە (واتە ئەوەی کە دوایی دەبێ بە زەمان چونکە بەر لە وجودی ئەم جیهانە زەمانێك جێی باس نیە) یەکێکیان دیاری بکات، واتە بەر قەراری بکات بە ئیرادەی خۆی.

لەدوای زەمانێك ئەگەر دروست بێ ناوی بنێین زەمان ئەم جیهانە بێتە وجودەوە بەر لەوە نەبێت، کەوابو کاتێك سیفەتی ئیرادەمان ملاحەزە کرد ئیتر ئاسانە بۆمان‌و بیهێنینە بەر چاومان کە جیهانێك وا خودا دروستی کردوە لەولاوە بوبێت، هەمیشە لەگەڵ خودا وەك سێبەر وجودی نەبوبێت.

بەشێکی تریش وتویانە روداوە، بەڵکو وەڵامیان ئەوە بوە بە وجود هاتنی ئەم جیهانە بە شێوەی (تصادف)بوبێت، وەڵام لەم زەمینەیە هەروەك وەڵام لەزۆر لە زەمینەکاتنی تر زۆر لەمەسائیلی تر پێویستی بەمە هەیە بەر لەوەی وەڵامەکە بدەین بپرسین لەو کەسەی وادەڵێ ئەو وشەی (تصادف)ە مانای چیە؟ رونی بکەرەوەو شی بکەرەوە تا بزانین ئایا جێگەی باسە یان نا، بۆ نمونە (تصادف) واتە هەر یەك راست زرمەیەك هاتو ئەم جیهانەی لێ دروست بو ئەبێ شتێکی خولاصە بەیان بکات لە وشەی (تصادف)، وەڵامی یەکێك ئەوە بو کە لە دەلیلی دووەم بەیانمان کرد کاتێك ئەم جیهانە (حادث)ە هاتنی بۆ وجود لە نەبونەوە بەمانای ئەوەیە کە ئەو مەوجودە زاتی خۆی پێویستی نەبون یا بون ناکات، ئەبێ تەئکید بێ لەسەر دروست کراوێکی قەدیم چونکە نە مەسەلەی (تسلسل) وەنە مەسەلەی دەور هیچ کامیان دروست نین، ناچارین کۆتای‌و سەرهەڵدانی دروست کردنی ئەم جیهانە زاتێك کە (حدوث) بۆ ئەو نیە بێنینە بەرچاومان، جوابی تریش دەدرێتنەوە کە یەکێکیان مەسەلەی (احتمالات)ە لە شتێك تەواو ئاسانو سادەبێ ئحتمالاتی کەمەو زۆرتر نزیکە بە ئیمکانەوە، بۆ نمونە دوو دانە کاغەز لەناو کیسەیەك بن یەکێکیان ژمارە یەکی لەسەر نوسرابێ ئەوی تریان ژمارە دوو، ئێمە دەست کەین بەناویا بۆ ئەوەی یەکێکیان دەربێنین، ئحتمالی ژمارە یەك پەنجا لە سەدەو ئحتمالی ژمارە دووش پەنجا لە سەدە، بەڵکو ئەگەر کردمان بە چوار ژمارە هەر ژمارەیەکیان ئحتمالی دەبێتە بیستو پێنج لە سەد، هەروەها تا بەشو تاکێك کە

ئحتمالات له مەوردی ئەوان جێی باسە زۆر بن ئیمکان کەم دەبێتەوە، دەی کاتێک ئاوا ئحتمالات زۆر بو له مەوردی شتێکی زۆر سەرەتایی له بەشی مەوجوداتی زیندو ئیتر دیارە کە ئیمکانی بەدیهاتنو بە وجود هاتنی مەوجودێك زیندو کەمێك لەوە بانتر، هەروەها لەوە زیاتر بێ چەند مەوجود چەند جۆر هەر جۆرێك له تاکی جۆراو جۆر بەنزیکی ئەگات بە سفر، واتە ئیتر دەتوانین بڵێین مەحاڵە ئیمکانی نیە کە یەك دانەش لەم مەوجوداتە کەبەشی زۆریان هەیە، بۆ نمونە وەك مار وەك پشیلە، جۆرانی تر له شێوەی ئحتمال دەبێ نەخشەیەك لەلایەن عالمو قادرو حەکیمێکەوە هاتبنە دی.

- بە تێڕوانینی مەسائلێك کە زۆر سادەو لەبەر چاون زیاتر کۆمەك دەکات بەمە کە تەصادف دورە لە ئیمکانەوە، بۆ نمونە ئەگەر تەواوی ئەهلی عەقڵی ئەم جیهانە کۆببنەوە گەرەکیان بێ یەك ئینسان، ئەگەر چی ئینسانێکێ سادەش بێ قەناعەتی پێ بێنن بەوەی کە نەخشەی ئەم گۆی زەویە کە کیشەوەرەکانو پایتەختەکانیانو شارە گەورەکانو فرۆکەخانەکانو هێڵی شەمەندەفەرو دەریا نیشان کراوەو باوەڕی پێ بێنن کە ئەم نەخشە ئاوا دروست بووە، کە لەیەکەمەوە باس لە پوشو پەلاش لەگەڵ برێك ئاو کۆبونەوە جولانەوەیەکیان تێ کەوتو دوایی کاغەزی لێ دروست بو، ئەمجارە قەڵەمو ماجیکی رەنگاو رەنگ پەیا بون کەوتنە سەر ئەم کاغەزە یەك راست ئەو نەخشە رێكو پێکە پەیا بو، هەرگیز ناتوانن باوەڕ بەم کەسە بێنن، ئەمیش گاڵتەی بەم قسانە دێت، چونکە دەلیلێك زۆر سادە هەیە ئەم نەخشە رێکو پێکە لەکاتی تەماشا کردنی ئەوە دەردەکەوێ کە دقەتی تێدا بەکار هێنراوە، ئەم دقەتەش ئەگەر لە چوار چێوەیەکی زۆر کەم بێ بەهەر حاڵ قەبوڵ بکرێ لە شێوەی تەصادفە لەئاوا شتێکدا قەبوڵ ناکرێت، نەخشەیەك بەو گشتە دقەتەوە بەو هێڵی وردو باریکەوە بەو تەقسیماتەوە، ئینسانێکی زۆر سادەش بیر

دەکاتــەوە ئــەو هــەموو رێکوپێکیــە پێویــستی بــە پێــشەکی و لێکۆڵینــەوە هەیــە، ئیمکـانی نیـە هـەروا لەخۆیـەوە ئـەم کەلوپەلـە دروست بـوبێ و ئـەم نەخـشەیان لێ دروست بێ. کەمێك وردتر لەوەش ئەکرێ قسەی لێبکرێ، ئەم تەصادفە، بۆ نمونـە لە زەمینەی ئەم نەخشەیە کە ئا ئەم ماددانـە وا ئیـدعا دەکـەن بـە تەصـادف ئـەم نەخشەی لێ دروست بـوە، ئایـا فەقـەت خـودی ماددەکـان پەیوەنـدیان هـەبوە یـان شتێکی تری دەرەکیش لەمە پەیوەندی هەبوە، ئەگـەر شـتی دەرەکیـە ئـیتر باسـی لێدەکرێ ئایا ئەم شتە دەرەکیە چیە، کە ئەویش ماددەیە وەك ئەوان یـان ئـەوەی پەیوەندی هەیە ماددەیە، هەروەك خودی ماددەکنی پێکهێنەری نەخشەکەیە، ئەوە زۆر گرنگ نیە ئەگەر تەنها خودی نەخشەکەو ماددەکانی پێکەهێنەری نەخشەکەیە، ئەوە دەپرسین لێرە ئایا لەزاتی ئەم ماددانە پێداویستیەك هەیـە بـۆ ئەمـە کـە یـەك راسـت لـە پارچـەیەك روداوێـك ئـاوا روبـداو نەخـشەیەك دروسـت ببێـت، ئەگـەر پێویستیەك هەیە بۆچی هەمیشە ئەو پێویستیە کاری نەکـەردوەو بریـارە پێویـستی زاتی بێت، دەی دەبێ هەر کاتێك ئەم ماددانە بوبن ، ئـەو پێداویستیەشیان لەگەڵ بوبێ هەر لەیەکەمەوە، کە ماددەکان بون ئیتر ئەمە روی بدایە، هەر لەسەرەتای بـە وجود هاتنی ئەم نەخشە بهاتایە ئەگەر پێویستی زاتی بوە. ئەگـەر پێویـستی زاتـی نیە لەدواییدا پێش هاتنەکەیان ئەمەش خۆی پرسیارێکی ترە، کەچی دروستی کـرد تیایان ئەو پێویستیە بکات، ئەو حاڵەتـە کـە ئـستعداد پـەیا بکـەن، ئامـادەیی پـەیا بکەن بۆئەمە، کە ئەم روداوانەی لێ روبداتو نەخشەیەك پـەیا بێت، ئـەوەش هـەم خۆی پرسیارەکە لێرە بێ وەڵام دەمینێتەوە، مەگەر هـەم دوبـارە حەواڵـەی بکـەین بە ماددەیەکی تر وەك بەڵامن ئەویش هەر جێی قسەیە یان ناچارین حەواڵەی بکەین بەمەوجودێکی دارای علمو ئیرادەو قـودرەت بێـت، ئەگـەریش وەڵامەکـە ئەمەیـە کـە ئەسڵەن مەسـەلەی پێویـستی جێـی بـاس نیـە، تەصـادف بـەم مانایەیـە کـە هـەروا

لەخۆیەوە ئەم ماددانە جولانەوەکیان تێدەکەوێ ئەم نەخشەیەیان لێ دروست دەبێت، هەر خودی ئا ئەم وشانە کە لەم رستەیە بەکار دەبرێ هەر خۆی جێی باسە کە ئەم ماددانە هەر لەخۆیەوە بێ پێداویستی کەوتە جولانەوەو کۆبونەوەو ئەم نەخشەیەی لێ دروست بو، جولانەوە واتە چی دانە دانە وشە کان جێگای قسەن لەخۆیەوە کەوتنە جولانەوە، واتە چی لەخۆیەوە ئەم جولانەوە هەم دوبارە عەینی پرسیارەکان دێنێتەوە کەلەخۆیو لەزاتی خۆی دەست پێ دەکات یان پالپێوەنەرێکی تر هەیە بە وردی پرسیارەکان کە لە پێشدا بون دێتە پێشەوەو هەمو کێشەکان دێنە پێشەوە، بەهەر حاڵ مەسەلەی تەصادف کاتێك ئینسان قسەیەك دەکات دەر بارەی تەصادف شتێك هیچو پوچە، فەقەت وشەکە ناوبانگی پێدراوەو کۆمەڵەخەڵکێکی پێ فریودراوە. دەی ئێستا مەسەلەی بەوجود هاتنی ئەم جیهانە هیچ کام لەم قسە پڕو پوچانەی تەصادف نیە. لێرە دەردێك هەیە کە ئەوانەی ئەم وشەی تەصادفە بەکار دەهێنن‌و گرنگی پێدەدەن‌و دەیهاوێنە ناو مەیدانی علم زۆردارن‌و خاوەن مەسڵەحەتێکن، چونکە لە غەربەوە هاتوە ئەوانیش زۆردارن‌و خاوەن مەسڵەحەتن‌و دەسەلاتدارن، بۆیە گرنگی پێدراوە.

ــ وەلە زەمینەی دەلیلی دووەم دەلیلی (حدوث) جارجار پرسیارێك دێتە پێشەوە، کە ئەویش هەر کەڵك وەرگرتنە لە بونی دقتەتی بیسەران لە وشانێکدا کەبەکار دەهێنرێن، وەك ئەڵێن بۆمان رۆشن بۆوە کە هەرچی روداوە دەبێ دروستکەرێکی هەبێ (بە شێوەیەکی تر کە هەرچی شتە خودا دروستی کردوە، ئەی خودا چی دروستی کردوە) پرسیارەکە لەسەر ئەوەیە کە خوداش دروست کەرێکی پێویست بوە، واتە ئاوا دێنینە بەر چاو کە ئەویش پێویستی بە دروست کەرێك هەیە تا پرسیارێك ئاوا بێتە پێش، بەڵکو ئێمە لە ئسپاتی روداوەکان‌و دروستکەر بۆ ئەم جیهانە کە روداوە، چیمان سابت کرد، ئایا ئەوەی کە سابتمان

کرد بە تێڕوانینی ئەوە ئیتر ئیجازەی ئاوا پرسیارێك دەدات، ئێمە وتمان بە گۆڕانکاری ئەم جیهانە بۆمان سابت دەبێ کە ئەم جیهانە روداوە ئیمکانی نیە قەدیم بێ، دەی هیچ روداوێکیش بێ وجودی عاملێکی بەدەر لە خۆی لەنەبون نایە بەبون، هەروا ناکرێ بڵێین ئەم روداوانە روداوی وەك خۆیان دروستی کردون، چونکە هەرچیەك بێ مەوجوداتی ئەم جیهانە دیاری کراون لە چوار چێوەیەکدا، لێرەدا دەگەینە جێگەیەك کە ئیتر دوای روداوێك دانەیەکی تر نەمێنێ کە ئەویش حەواڵە بکەین بەئەو کە بڵێین ئەو ئەمی دروست کردوە لەبەر ئەوە ناچارین سەرچاوەو دەستپێکەری ئەم جیهانە زاتێك جگە لە ڕوداو بێنینە بەر چاومان کەنەبون بەسەریدا نەهاتوەو گۆڕانی نەبوە، لەئەنجام لە روداوو لەنەبون دور بێت، کاتێك ئاوا هاتە بەرچاومان زاتێك قەدیمەو لە روداوو لە نەبون دورە، ئیتر پرسیارەکە هەر جێی خۆی نیە هەڵەیە. نمونەیەکی سادە بۆ ئەمە ئەڵێین هەر جێگایەکی تاریك لەم جیهانە نور ڕۆشنی دەکاتەوە، کەسێك بڵێ ئەی نور چی رۆشنی دەکات ئیتر ئەوە جوابی نیە، چونکە کاتێك دەڵێین هەر جێگایەکی تاریك مەبەستمان ئەوە بوە کە تاریك بێ، بەڵکو گوتمان نور، نور ئیتر تاریکی تیا نیە تا بڵێین چی رۆشنی دەکات. لەویشدا ئەڵێین هەرچی ڕوداوە زاتێکی قەدیم دەبێ دروستی کردبێ، کەوتمان قەدیم مەسەلەی نەبون لێرە نیە تا بڵێین چی ئەم نەبونەی دروست کردوە.

ـ لەدەلیلی سێیەم دەلیلی (نظم) شتێکی خۆش هەیە تێڕوانینی بکرێ ئەمەی کە ئەبێ ئینسان بە (نظم) بە وجودی گونجان لە روداوی شتەکان خودا بناسێت، نەك وەك عادەتی زۆر کەس لە شتێك کە دەرکی ناکاتو کە دەرکی نەبو کاریگەری تێ ناکات، شتێکی رەمزی کەناتوانێ بەعلم بونی بکات ئا لەوەوە خودا بدۆزێتەوە، بۆ نمونە شتێك رودەدا بیری لێدەکاتەوە، رویەك بۆ ئەم روداوە نابینێ ناتوانێ بیدا بە لایەك، شتێکی بۆ دەرك نابێ لە دوایی دەست دەکات بە (ماشاء الله) و (لاحول

ولا قوة الا بالله) کردنو ئەو کاتە سەرزەنشتی ئەوانەی کە لەرێی خودا نیە لەم شتانە، چونکە لەسەر ئەو ئەساسە بوە کە ئەو شتانەی وا هۆکاریان ڕۆشنە دیارە ئیتر لەسەر ئەو هۆکارە بوە لەویۆ گەرەکی نیە ئیتر تێڕوانینی شتێکی بانتر لە هۆکار بکات، بەڵکو لێرە بیر دەکاتەوە هۆیەك بۆ ئەمە نابینیۆ مەجبورە لێرە بچیۆ بەشوێن وجودی خودا، چونکە هوکارێکی نەدیوە دەبیۆ خودا دەستی لەم کارە هەبێت، وەك ئەمە بۆ نمونە منداڵێك لەسەر بانێك بەردەبێتەوەو دەکەوێتە خوارەوەو هیچی لێنایە، ئەمە هۆیەکی هەیە، بەڵیۆ ئیرادەی خودایە، نەخشەو تەقدیری خودایە کە ئەم منداڵە بمێنێت، بەڵکو خودا هەتا لەکاتی موعجیزەشدا بیۆ هۆ کار ناکات کاتێك موعجیزەیەك ئەنجام دەدات هۆیەکی تر، بەڵکو جگە ئەم هۆیە دوبارەو عادیانە بەکار دەبا بۆ کاری خۆی لە چوارچێوەی ئەم دروست کراوانەوە کاریگەری خۆی دەخاتە کار، دەی چونکە عادەتەن هۆکارێکی دیاری کراو لەم زەمینەیە نیە ئەم منداڵە لەم بانە بەربۆوەو کەوتە خوارەوە هیچی لێنەهات، لێرە کە هۆیەکی دیاری کراویان دەست نەکەوت حەواڵەی دەکەن بە خودا، بەڵکو لە شتێك کە هۆیەکەی رۆشن بێت، وەك ئەمە یەك کەس نەخۆشیەکی سەخت بۆی رودەدا لەدوایی دەیگەیەننە دکتۆرێکو داوو دەرمانی بۆ دادەنێتو چاك دەبێتەوە، لێرە کەم کەس هەیە حەواڵەی بکات بە خودا، دەڵێن ئەگەر نەگەیشتبایە دکتۆرەکە تەواو دەبو لەبەین دەچو، بەڵام تێڕوانینی ئەوە کە (نظم)ی ئەم جیهانە بەرنامەی جوڵانەوەی ئەم جیهانە لەسەر پێشەکی و ئەنجام و هۆو هۆکار دانراوە، ئەوەی کە هەر کارو کردەوەیەکی خودا لە چوارچێوەی شتێکەوە بەناو هۆ دەردەکریۆ بە تێڕوانینی ئەمەش ئیتر ئینسان لەئاوا بینشێك دەگەرێنێتەوە کە ئەمجارە هەر کاتێك شتێك گونجانو رێکو پێکی تیا بوو ئا ئەوەیە ئەینێتە لای خودا، ئەوەی وا هۆیەکی نیە شتێکی تیا دیارناکەویۆ ئەوەش بەم شێوە دەیگەیەنیۆ بە وجودی

خودا، کە ئەویش هۆیەکی هەیە پێشەکیەك هەیە بۆ ئەم کارە، بەڵکو ئەم پێیان نازانن، نەزانینو هۆکەی لێرە کە ئایاتن دەی گەیەنێ بە خوداو نابێتە کێشە بۆی، چونکە لە زەمینەکانی تر لە زۆر جێگەی تر هۆو گونجاندنو ڕێکخستن بەدیاری خستوە ئەوەیان دەیگەیەنێت، لێرە ئیتر ئعتراف بە نەزانینی خۆی دەکات، بەنەزانینی خۆی لەم زەمینەیە کە ئایاتەکەی دەرك نەکردوە کە بیگەیەنێ بە خودا، نەك نەبونی هۆی ڕۆشن لەم زەمینەیە (لە جۆرێك کتێب وا باس کراوە ئەو جۆرە کەسانەی لەکاتی دەرك نەکردنی هۆ بیری خودا دەکەنەوە، ئەوا لە شوێنێك هیچ هۆیەك نەبو ئەوە ئیترلەوێ مەجبورن وجودی خودا قبوڵ بکەن، بەڵکو لە شوێنێك هۆ ڕۆشن بو هەر بیر لە خودا ناکەنەوە، چونکە وا بیر ددکەنەوە کە ئەم هۆیانە سەربەخۆن وە هەمو کارەکە دەدەنە پاڵ هۆیوکە))، وەك تێڕوانینێکی جارجار ئەوانەی کە پێیان دەڵێن ئەهلی تەخەصص کە لە زەمینەی تەجروبە کاردەکەن لەدوای ئەمە بەشێك لە زانستی تەجروبە، زانینی سونەنو یاسای حاکم بەسەر گۆشەیەك لەم جیهانی هەستیە دەر کردوە دەڵێن ئیتر جێگەیەك نەماوە بۆ وجودی خودا وەك ئەوە لەمەو بەر، بۆیە پێویست بوە ئیمان بە خودا، چونکە هۆیەکان دەرك نەکراوە، بەڵکو مادام گەیشتین بە زانینی هۆ لەم زەمینە ئیتر تەرکیان کرد بە خودا.

ـ لە دەلیلی چوارەم (دەلیلی وەحی)بەکورتی گەیشتین بەمە ئەم دەلیلە بە وجودی خودا، پەیامەکانی نێردراوەکانی خودا، یەکەم جار پەیامی محمد علیە الصلاة والسلام تەواوی وەحیەکەشی سابت دەبێت، کاتێك کە سابت بو ئەمە کە موعجیزەیە ئیمکانی نیە لە دروستکراوانەوە دەر بکرێت، چونکە ئەوانەی وا لەبەر دەستدان ئحتمالی هەیە نسبەت بدرێتە لای ئەوان، ئینسانو جن ئەوانە بانترن لە دروست کراوانی تر کە لە زەمینەی پەیابونی ئەم قورئانە وجودیان هەیە، کاتێك

ئیمکانی نەبو نسبەتی بەلای ئەوان بدرێتت باشتر ئیمکانی نیە نسبەتی بەلای دارو بەردو ئەو جۆرە شتانە بدرێتت، ئەوەی ئەو وەحیەی دەرکردوە زۆر بەرزترە لەجنو ئینسانو هەروەها دروست کراوانی تر، بەو جۆرەیە کە خۆی لەناو وەحیەکە خۆی دەناسێنێت، کە ئەم دەلیلە زۆر پڕ بەرەکەتەو هەمو شتێکی پێ سابت دەبێ، رێی ئینسان رۆشن دەکاتەوە دەلیلەکەش تۆزێك چاوی پێ بخشێنینەوە بەم شێوە بو کە لە چوار زەمینەدا دەبێ ملاحەزەی ئعجازی ئەم وەحیە ئەم قورئانە بکەین، یەك لە زەمینەی جیهانبینی لەبەواتە چۆنیەتیو پەیوەندی بەینی(خالق و ئامر) خودا لەلایەکەوە، ئەم جیهانە لەلایەکەوە بەناو نیشانی (مخلوق و مأمور)، ئینسانیش کە هەر لەم جیهانەیە جۆرە ئمتیازێکی هەیە لەلایەکی ترەوە، هەروەها پەیوەندی ئینسانو ئەم بونەوەرە بەیەکەوە، قورئان بینشێكو جیهانبینیەك عەرز دەکات، کە بەشەر تا ئێستا هەر نەچوە بە رۆخیدا، ئیمکانی نیە هیچ کاتێکی تر بتوانێ لەگەڵ قورئاندا لەم زەمینەیە بەربەرەکانێ بکات، جائەگەر شتێکی هێنا جگە ئەمە چونکە ئەمە کەمو کورتی تیا نیە ئەو شتە هەڵەیە، ئەگەر عەینی ئەمەی هێنا بەس ئەمەیە شتێکی تری نەهێناوە، کە بڵێین توانیویەتی لەم داوای موبارەزەیە سەرکەوێت.

وە لە زەمینەی ئەحکاما ئەبێ چی بکەین و چینەکەین: باسی ئەمەمان کرد کە ئیمکانی نیە ئینسان بتوانێ بەشێوەی (استدلال) بەشتێکی دیار لەسەر نادیار یان بە وەسیلەی دارا بون لەسەر علمی تەواو کە ئینسان ئاوا شتێکی نیە لەمە دورە یان بە ئسپاتی هەتا یەك دانە حوکم، لەئەنجام لەم زەمینەیە ئینسان بەتەواوی دەستی خاڵیە هیچی نیە لەبەرامبەر ئەحکامو رەوشی ژیان کە خودا عەرزی کردوە، بێ نەتیجەیە، لێرە مەسەلەی قیاس کردن تەرجیح لەبەینی ئەوەی کە خودا عەرزی کردوە لەم قورئانە، ئەوەی کە ئینسان عەرزی کردون نیە، ئینسان لەم مەسەلەیە

هیچی لا نیە، ئەگەر قبوڵ بکەین ئەو شتانەی وا ئینسان لەزەمینەی ئەحکام عەرزی کردوە، بڵێین ئینسان بە رێگەی (استدلال) گەیشتوە بەم پلە ئەخلاقیانە چونکە ئەم ئەحکامە کە هەیانە هەوەس نین پێی خۆش بێت یان پێی خۆش نەبێت، بەڵکو بەرێگەی (استدلال) بوە، با لێرەشدا قیاس بکەین ئعجازی ئەوەی کە لە قورئاندا هەیە لەم زەمینەش دەردەکەوێت، بۆ نمونە لەپێش چاو گرتنی راستیٔ ئینسان لە یاسایەکدا کە لە قورئاندا قەرار دراوە، لەپێش چاو نەگرتنی لە ئەحکامی بەشەر جگە ئەوانەی لە کتێبانی ئاسمانی دەرکی پەیوەندی ئەم ئەحکامە لەلا یان لەگەڵ ئەو کتێبە ئاسمانیانە دەکەن، بۆ نمونە ئەمەی کە ئەم قورئانە لە زەمینەی ئەحکامێکدا وا گۆڕانکاری کاتو شوێن پەیوەندی بە گۆڕانکاریان هەیە شتێکی جگە (اصول و کلیات) بەیان نە کردوە، کە نیشان دەدات کە دانەری ئەو ئەحکامە عالمە بە راستی ئینسان، بەڵکو لەوانەی هەرگیز ناگۆڕێن چ ئەحکامی (جزئی) چ (کلیات) و (اصول) دیاری کردوە قەراری داوە بەجۆرێك کە ئیتر ئینسان بۆ هیچ دانامێنێت، هەتا لەو (کلیات)ەی بەیان کردوە، (جزئیات)ی بەیان نەکردوە، لەبەر ئەوە کە بەپێی مەرجەکانی کاتو شوێن دەگۆڕێن (اصول و ضواط)ی بەر قەرار کردوە کەلەهەر زەمانێکدا ئەو کەسانەی ئاگایان لەو (اصول و ضوابط) ەو مەرجەکانی کاتو شوێن هەیە بتوانن لەو (کلیات)ە جواب بۆ مەسائلی تازە بەدی هاتوی ئەو کاتو شوێنە بدۆزنەوە، ئەمە هەر ئەوانەیە وا خودا گەرەکیە ئەم ئەحکامە هەر ئەوانەیە، ئەگەر خودا قەرار بوایە بەیانیان بکات هەر ئەوانەی بەیان دەکرد لەسنورێکدا کەبەشەر توانایی هەیە، لەزەمینەی قیاسکردنی مەکتەبی ئەخلاق کە قورئان عەرزی کردوە مەکتەبەکانی ئەخلاقی تردا دەتوانین ئەنجامو ئاساریش لە نەزەردا بگرین، ئەنجامێك کە شوێنکەوتنی مەکتەبی ئەخلاقی قورئان کە کۆمەڵگەی ئیسلامی لە درێژایی ئەم چەند سەدەیە، ئەنجامێکیش کە شوێنکەوتنی ئەحکامی

هەوەس و ئارەزوی ئینسان و مەکتەبە ئەخلاقیەکانی دەستی بەشەر لەتەواوی درێژایی مێژو داویانە بە ئەم بەشەرە.

ـ وە لەزەمینەی مەسەلەی علمی تەجروبە ئیعجاز بەم شێوە بو ئەگەر چی تایبەتمەندی قورئان ئەمە نیە کە راستەو خۆ ئاشکرا بێ بۆ مەسەلەی علمی تەجروبە فەقەت، لەو لایەوە ئیشارەیان بۆ دەکات کە ببن بە ئەساس بۆ کەسبی بینشێکی دەقیق لەم جیهانەو لە دروستکەری ئەم جیهانە، ئەو راستیە علمیە کە ئیشارەی پێکردوە کاتێك ملاحەزەی ئەوە دەکەین لەکێوە هاتوە ئەم وەحیە، لەولاشەوە ملاحەزەی تەواوی زەحمەت و کۆششەکانی ئەم بەشەرە لە درێژایی مێژوودا دەکرێن، چەندەها مەرحەلە کە هاتوە بەسەر ئەم زەحمەت و رەنج و کۆششەیان، تەنها ئالو گۆڕ هاتوە بەسەر نەزەریات و بیرو بۆچونەکانتنیان، دەگەین بە هەندێك لەو راستیەی کە قورئان عەرزی کردوە کە لە زەمینەی علومی تەجروبە ئیشارەیان بۆ دەکات، ئەویش لەم قورئانە بەجۆرێك بەیان کراوە کە ئاسمان تا زەوی لەگەڵ تەجروبەی ئەوان و لەگەڵ بابەتێك کە خۆیان پێیان راستیە جیاوازی هەیە، لەم قورئانە کاتێك راستیەك لەو زەمینەیە بەیان دەکرێ بەشێوەی تەواو و یەکجارەکی بەیان دەکرێت، هیچ لەو قورئانە دەرناکەوێ لە کاتی وتەکانی کە ئەوە بە وەسیلەی بینین و تەجروبە..پێی گەیشتوە، بەڵکو ئینسان هەست دەکات کە عالمێکە علمی تەواوی هەیە بەسەر ئەم جیهانەو هەمو شتێك وا لەبەر دەستی ئەودا، کۆشە کۆشەیەك لەمانە بەیان دەکات بۆ بەشەر زۆر بەلایەوە شتێکی ئاسانە، بەڵکو ئەم بەشەرە هەم لە بەواتەی راستی علمیەکە فەخر دەکات کە گەیشتوە بەمانە، جار جاریش بیردەکات کە بەراستی تەئمین نیە لەو مەسەلەی کەپێی گەیشتوە، بۆمان یەقین نین کە بەشەر پێی گەیشتون، لەدوایی لە مەسەلەی تەوحید باسی ئەوە دەکەین کە علمی تەجروبە یەقینیات نین ئێستا یەك ئیشارە

بکەین، ئەوەی کە ئینسان نان بخوا تێر ببێ یەقین نیە، ئەوە جا تۆزێك جێی عەجیبە کە چۆن هەزاران ساڵە ئینسان هەر کاتێك خۆراکی خواردوە تێر بوە، دەکرێت بڵێین ئا ئەمە جێی گومانە ئینسان یەقینی نەبێ کە ئەگەر خۆراك بخوا تێر دەبێت، لە دواییدا زیاتر رونی دەکینەوە.

لە زەمینەی (جمال) جوانیو هونەر کە وتمان لە ئینسان‌دا پێویستی هەیە بۆ ئەمە، هەستێك هەیە لە ئینسان‌دا بۆ ئەمە کە بە شوێن جانیو هونەر بێت، وتمان کە قورئان موعجیزەیە هەم لە روی فەصاحەتو بەلاغەت وە هەم لە روی مۆسیقیو ئاهەنگی قورئانەوە، لە فەصاحەت بە لەفزەکانو زاهیری گونجانی قورئان بو کە ئەم لەفزانە وا لە قورئاندا بەکار براون بۆ گەیاندنی ماناو راستی، هیچ لەفزێکی جێی رەخنەو ئیشکال نیە بەم جۆرەی کە حەرفەکانی پێکهاتنی ئەم وشە سازگار نەبن لەگەڵ یەکدا بە جۆرێك لەو کاتەی کە دەخوێنرێتەوە یا بۆ گوێگر هەست بە ناخۆشی ناکات، ئەمجارە وشانێك کە بەکار براون لەو وشانە نین وا غەریبن بۆ خەڵك، بەکارهێنانیان کەم بێ لە زمانی عەرەبی کە کاتێك یەکێك عەرەبی دەزانێ گوێی لێدەبێ دەرکی نەکاتت، ماناکەی تێنەگاتو وشەیەکی نائاشنا بێت، هەم (اصول و ضوابت) ریعایەتی ئەوانە ئەبێ بە هۆی ئەوەی وشەکان بەباشترین رو دور لە دوبارە بێ نیاز بێ ئەوەی ئینسان پێویستی پێ بێتو جگە بۆمان ئەم (اصول و ضوابت)ە لە وشانێك کە لە قورئان بەکار براون لەبەر چاو گیراون، پێچەوانەی ئەوانە وشەیەك بەکار نەبراون هەروا لە پێکهاتەو رستەبەندیدا وشانێك بەکار براون هەروەك گوتمان لەهەر وشەیەك پیتەکان ناسازگار نین لەگەڵ یەك، ئەم وشانەش ناسازگار نین بەیەکەوەو گەیشتنیان بۆ گوێگر هیچ حاڵەتی ناکۆکیو ناپەسەندیو ناخۆشی ناگەیەنێت، لە پێکهاتەی بۆمان ملاحەزەی گونجاندنو فطرەتێك کە مانا لە زهنیاندا هەیانە کراوە، کە ئەو لەفزانە بەواتە ئەو مانایانە دەکەنو ئەرزشیان

هەیە، جا هەر داوایەك هەر بابەتێك لە زهنی قسەکەر پێکهاتەیەکی فکری هەیە، کە چ شتێك لەپێشەوەی‌و چ شتێك لە دواوەی لە پاڵ چیدا قەرار دەگرێت، کاتێك پێکهاتەو رستەبەندی ئەرزشی تەواوی خۆی هەیە، کە خزمەتکاری ئەو پێکهاتەیە بێ کە ماناکە هەیانە، واتە ماناو راستی لە زهندا جۆرە پێکهاتەیەکیان هەیە کە دەقیق بەهۆی ئەوانە لەفزەکان رێکو پێك دەکرێن، ئەدای ئەو پێکهاتەیە کە لە زهندا هەیە قورئان لەم زەمینەشدا ریعایەتی کردوە، ئەو عەرەبانەی لە فەصاحەت‌و بەلاغەتدا دەرکیان هەبو هەرگیز نەیانتوانی لە یەك رستە لە رستەکانی قورئان هاو شێوە بێنن، هەروا لەو رستەو عیباراتە کە تێگەیشتنی وشەکان خۆیان مەبەست نین، بەڵکو بە کۆکردنەوەی تێگەیشتنێك شتێکی تر موراد دەکرێت، وەك بۆ نمونە لە کۆبونەوەی تێگەیشتنی (استوی علی العرش) موراد لەمە کە دەسەڵات‌و توانا بەسەر تەواوی ئەم جیهانە بگەیەنرێ، گەیشتن بە تێگەیشتنی ئەموشانە کە کۆبونەوە بۆ مورادێك لە کۆی ئەم پێکهاتەو رستە هەیە زۆر گەیاندنی فکری سادەیە، بەلاغەتی ئەو عیبارەتە لەسەر ئەو مانای مورادە کە ئێستا هەیەو بەلاغەتی رۆشن‌و ئاشکران لە زەمینەی فەصاحەتدا، لە زەمینەی بەلاغەتیشدا وتمان بەو شێوەیە کە بەپێی مەرجەکانی گوێگرەکان لە تەواوی کاتو شوێنەکاتن باس کراوە، تەواوی تایبەتمەندی‌و تەواوی تاکەکانی بەشەرو جۆری بەشەر لەبەر چاو گیراوە، دەلیلیش ئەوەیە کە یەك داوای (جُزئ)یش لە قورئاندا نیە کە تەواوی بەشەر کۆببنەوە لەسەری بتوانن ئسپاتی بکەن کە لەگەڵ مەرجێکی تایبەت لە کاتو شوێن لە گۆشەیەك لە گۆشەکانی سەر زەوی، لە زەمانێك لە زەمانەکاتنی سەر زەوی، لەگەڵ کەسێك یان کۆمەڵێك رێك ناکەوێ‌و ناگونجێت‌و سازگار نیە لەگەڵیدا، ئەمەش خۆی قورئان داوای موبارەزە دەکات، ئەم جارە لە زەمینەی مۆسیقی دا گوتمان کە لەدوو لاوە مۆسیقی قورئان موعجیزەیە یەك خودی

ئاهەنگەکە کە هەر ئاهەنگێك بۆ چ جۆرە داواو مورادێك هێنراوە، کە ئاهەنگێك فطریە کە ئەگەر بەشەر لێکۆڵینەوە بکات لە زەمینەی مۆسیقی ئاهەنگ دەگات بەوەی کە هەر ئەو ئاهەنگە دەگونجێ لەگەڵ فطرەتی ئینساندا، لەگەڵ ڕەوانی ئینسان سازگارە، بۆ گەیاندنی هەر مورادو مانایەك ئاهەنگی سازگار لەگەڵ ئەودا بەکار براوە، بۆ نمونە سورەی (ضحی)مان ئیشارە پێ کرد کە بابەتەکان مورادەکان ئەگۆردرێن، پەیێی ئەوانیش ئاهەنگەکان دەگۆردرێن.

وە لە ئەنجام لە زەمینەی هونەریشدا بە فەصاحەتو بەلاغەت، هەم بە ئاهەنگەوە بە هەردو روەکەی خودێ ئاهەنگو سازگار بونی لەگەڵ مانایەك کە ئەدا ئەکرێ بەو جۆرە کە ئەو ئاهەنگەی هەیە لەم زەمینەشدا موعجیزەی قورئانە، قورئان تەحەددای کردوە لە ئینسانو جن کە دەتوانن شتێك ئاوا بێنن لەکۆی بۆمان رۆشن بۆوە بۆمان کە قورئان ئیمکانی نیە لەیەن دروستکراوەوە هاتبێت، هیچ چارە نیە جگە ئعتراف بەمە کە خاوەنی ئەم قورئانە هەر ئەوەیە کە خۆی دەیناسێنێت، هەروا وتمان کە دەلیلی پڕ بەرەکەتەو تەواوی ئەو شتانەی کە لە قورئانەکەیە خود بەخود هەر بەمە سابت دەبێت، ئەمجارە ئیتر سەرو کاری ئێمە لەگەڵ ئەو قورئانە دەبێ کە چیمان بۆ باس دەکات، بە پێویستی ئەو قورئانە بجولێینەوە.

لەسەرەتاوە باسی ئەوەمان کرد ئینسان بۆ کەسبی علم سێ دانە وەسیلەی هەیە ( سمع_بصر_قلب) یان (فؤاد) ڕونکردنەوەیەك لازمە لەزەمینەی هەستی پێنج دانە ڕەنگە کەسێك بیر بکاتەوە کە چۆن ئینسان فەقەت (سمع و بصر و قلب ) ی هەیە کە جگە ئەوانە وەسیلەی تر نین علمیان پێ کەسب بکات؟، ئەم (اشتباه)ە واتە جیا نەکردنەوەی وەسیلەی علمی تایبەت بە ئینسان لەگەڵ وەسائلێك کە هاوبەشن لە ئینسانو حەیواندا، لە هەندێك لە کتێبە دینیەکانیشدا هەیە، بۆ نمونە وتویانە وەسیلەی علم عیبارەتە لە (عقل_حواس_وحی_ هەواڵی

راست) جارێ لە تەعبیری یەکەم کە وتویانە (عقل) ملاحەزە نەکردنی زاراوە قورئانیەکەیە کە (قلب یا فؤاد) باس دەکاتو (عقل) کارێکە کەئەم (قلب)ە ئەنجامی دەدا، بەم شێوە کە کاتێك شتێکی زانی بە پێویستی ئەو خۆی کۆنترۆل دەکات، کە وشەی (عقل) بەمانای بەستنەوەی( وەك حەیوانێك دەی بەستنەوە بۆئەوەی نەچێتە ناو زراعەتو شت زیانی لێنەدا) ئینسان کاتێك بە (قلب یا فؤاد) شتێکی زەبت کرد، بۆ نمونە ئەوە بەکەڵکە یان ئەوە زەرەرە، لەوەی کە زەرەرە بە گوێرەی ئەوە خۆی کۆنترۆل دەکات، لەو زەمینەی کە بەکەڵکە خۆی پێ دەبەستێتەوە، ئەوەی کە زەرەرە خۆی لێ دور دەگرێت، لەوەی کەوتویانە هەواڵی راست (وحی) کە هەاڵی ڕاست شتێکە وا باوەری پێ دەکرێ نەك وەسیلەی علمە لە ئینسانو وەسیلەکەش هێزی بیستنە، جا بیستن لەگەڵ گوێ فەرقی هەیە (سمع) عیبارەتە لە نیرویەك کە روحی ئینسان هەیەتی لە رێگەی ئەم ئەندامەوە بەناو گوێ وە دەزگایەك کە لێرە هەیە کار دەکاتو شت وەردەگرێت، هەروەها کە بینین جگە چاوە کە ئەبێ فەرقی بۆمان بکرێ، (سمع) عیبارەتە لەو هێزەی لە کاتێکدا ئینسان لە رێگەی بینین یان لە رێگەی (قلب)ەوە نەیتوانی دەست پێ بکات بۆ کەسپی علمێك، واتە نەلە زەمینەی جیهانی بینین بوو کە لەرێگەی هێزی تەجروبەو بینین ئەو شتەی دەست کەوێ وەنە پەیوەندی بە جیهانی غەیبەوە هەیە کەبە وەسیلەی ئەو زانیاریە کە (بصر) دەرکی کردوە، بۆ نادیارەکە ئەو هێزە هەڵی دەنێ بۆ ئەوەی گوێ راگرێ بۆ کەسێکی تر کە ئەویش بە جگە وەسیلەی (قلب)و (بصر) شتێکی دەرك کردوەو پێویستی بەمە نەبوە کە بەرێگەی بینینو تەجروبە شتی دەست کەوێت، لەمە نەبوە کە (استدلال) بە زانیاری بینین بکات بۆ ڕاستیەکانی جیهانی غەیب، بەڵکو لەرێگەیەکی ترەوە راستیانێکی دەرك کردوە ئەو کەسە شتی بۆ بەیان بکاتو ئەویش گوێی بۆ بگرێتو تەسلیمی بێو قبوڵی بکات،

ئەمە هێزی بیستنە (سمع) کە کاتێ کۆمەڵەی بەشەریەت ببێت ئەم هێزی بیستنە دەمێنێتەوە بۆ وەرگرتنی زانیاریەك کە خودا لەڕێگەی وەحیەوە دەینێرێ بۆ ئینسان، لەبارەی چۆن جوڵانەوەی ژیان کە ئەبێ چی بکرێ وە ئەبێ چی نەکرێ، بۆ دروست کار کردنی هێزی (بصر)و (قلب) دەنێردرێتن بۆ ئینسان لە ڕێگەی وەحی بەتایبەت وەئەوانەی ئەگەر ئینسان بیتوانیبایە ئیسفادەی تەواوی لە (بصر)و (قلب) بکردایەو بیتوانیبایە دروست بێ هیچ ڕێگرێك پێداچونی تەواوی لە جیهانی بینین بکردایە (استدلال)ی دروستی بکردایەو لەوانە کەسپی جیهانی بینراو بەسەر جیهانی غەیب، بەڵام خودا دەزانێ کە ئینسان لەم زەمینەیە ئیشکالاتی بۆ پەیا دەبێتو کەڵکی شایستە لە (بصر) و (قلب) ناکات بەرەحمەتی خۆی لە زەمینەی (بصر) و (قلب) یشدا شتێکی بە کەڵکی تری دروست کردوە، کە بەڵامنیش لە ڕێگەی بیستنەوە تێی دەگەن.

هێزی (بصر) عیبارەتە لەو هێزی ڕۆحە کە لە ڕێگەی ئەم دەزگای بینینەوە دەکەوێتە کارو تەماشای جیهانی بینراو دەکات، لەم زەمینەیە زانیاری دەرك دەکاتو دەگات بە زانینی سونەنو یاساکانی حاکم بەسەر ئەم جیهانی هەستیەدا.

قلب هێزێکی ترە لەدوای کاکردنی هێزی (بصر) نۆبەی ئەوە کە لەزانیاری بینین کەڵك دەکات بۆ دەرکی ئەوەی لەپشتی بینراوەکانە، چونکە ئەو زانیاریەی کە بەچاو دەرکیان دەکات ئایاتن نیشانەن لەپشتی ئەوانە ڕاستیانێك هەن کە ڕاستەو خۆ (بصر) دەرکیان ناکات کە (قلب) بە زانیاری (بصر) (استدلال) دەکاتو ئەو غەیبانە دەرك دەکات، بەزیادەی ئەمە حاڵەتی تەئسیری هەیە لە زانیاریەك کە دەرکی دەکات، بۆ نمونە سیفاتی ئومێد ئافەرینی خودا دەرك دەکات (منقلب) دەبێ (رغب) و ئومێی تیا دروست دەبێ، لە سیفاتی ڕەهەب ئافەرینی خودا ترسو ڕەهەبی تیا دروست دەبێو بەپێی ئەو تەئسیراتە کە تێیدا دروست دەبێ دەکەوێتە

جولآنەوەو لایەنگریەوە. ئەم سێ دانە هێزە لەزەمینەی علم ئینسان جیا دەکەنەوە لە حەیواناتی تر.

ئەوانەی کە پێیان دەڵێن پێنج هەستەکە، ئەوانە وەسیلەیەکن هاوبەشن لەبەینی ئینسانو حەیواناتی تر، کە بەوەیسلەی علم بۆ ئینسان نابێ ناویان ببرێت، بۆنمونە چاو هەروەك چاوی ئینسانو چاوی حەیواناتی تر شێوەو شتەکان دەرك دەکات وە لوتی ئینسان هەروەك لوتی حەیواناتی تر بۆن دەرك دەکات وە هەروەها هەستەکانی تر، کە ئەم زانیاریە خۆیان شتێك نین تایبەت هی ئینسان بن، لەمانەدا ئینسان لەگەڵ حەیواناتی تر هاوبەشن، لەئەنجام لەکاتێکدا ئێمە باسی جیهانبینیو کەسپی زانیاری لەم زەمینەیە دەکەین، کاتێك کە باسی ئایدیۆلۆجی بەمانای تایبەتی دەرکی مەکتەبی ئەخلاق و ئەحکام دێتەپێشەوەو لەکاتێکدا مەسەلەی زانینی سونەنو یاساکان بەسەر جیهانی هەستی جێی باسە لەوانەدا، ئیتر ئەو پێنج هەستە پەیوەندی نیە بە ناونیشانی وەسیلەی کەسپی علم نابێ بیریان لێ بکەینەوە، کاتێك کە زانیمان ئینسان دارای ئەو سێ دانە زانیاریەیە وە لەدوای ئەمەش کە لە دەلیلانێك باس کرا بۆمان رۆشن بووە خودایەك کە قورئان دەیناسێنی وجودی هەیە، ئەم جارە ئێمە بەو وەسیلانەی علمەوە لەبەرامبەری قورئان و هیدایەتی قورئان قەرار دەگرین، کە ئەو شتانەی لە زەمینەی (بصر) بۆ ملاحەزەی ئایاتی مەوجود لە (ئافاق) و لە (انفس) دا، ئەوانەی کە وان لە جیهانی هەستی کەڵك وەرگرین چۆن رێنموییمان دەکات چۆن دەستمان دەگرێ بۆ ئەمە کەکەڵك وەرگرین لە ئایاتی کەونی وە لەو زەمینەیە کار بکەینو هەروەها لە رێنموییەکان بۆ کاری (قلب) هەم بە (استدلال) هەم بە تەئسیر بون یابەو زانیاریە کە کەسپی دەکات وە بەشوێن ئەم قورئانە بکەوینو شوێن هیدایەتەکەی بکەوین، لەزەمینەی ئەحکامو ئایدیۆلۆجی بەمانای تایبەت لە زەمینەی ئەخلاق جگە ئەوەی

گویٚ بگرین بۆ قورئـان هەرچیمان بـۆ بـاس دەکات قبـوڵی بکـەین تەسـلیمی بـبین کارێکی ترمان نیە، کە لەدوای ئـەوەی زانیمـان دەبـیٚ چیبکەینو چینەکەین لایـەن گریمان بۆ رۆشن بـۆوە، جـا ئینـسان بـەو تایبەتمەندیـەوە لەبەرامبـەری قورئـان وە زوتر لەبەرامبەر گشتی شێوەکانی وەحی خودا بڕیاری گرتوە وە بڕیار لەسـەر ئەمـە بوە کە بەو جۆرە وەحی خوداو دروستکراوانی خودا جیهانی هەستی دەیناسـێنێت، ئینسان بیان ناسێت، دیارە کە ناسینو زانیاریەك دروستی پـەیا کـرد بـە پێویـستی ئەوە بابەتگیری بکات بەو جۆرە وەحی داناوە لە درێتژایی مێـژوی بەشـەر لـەدوای مەرحەلەیەك زۆر کۆتا لەم زەمینەیە ئشکالاتی سەرەکی پەیا بـوە، لادانـی گـەورەی شرك هاتۆتـە نـاو کـاری ئینـسان، کـە ئەمـە پێویـستی کـردوە خـودا لـە دوای هـەر پارچەیەكو هەر مەرحەلەیەك لە مەرحەلەکانی ژیانی بەشەر دوبارە ئەم هیدایەتە بۆ بەشەری دانـاوە دوبـارە بکاتـەوە ئینـسانەکانو ئاگاداریـان بکاتـەوە کـە چ جـۆرە لادانێـك تێیانـدا روی داوە دوای ئـەوەی نـەزانین توشـیان بـوە، هـەوەسو ئـارەزو توشیان بوە.

(ڕەورەترین (انحراف) لادان کە بەشەر کردوویەتی شرکە )

خودای گەورە دەفەرموێت

﴿أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ﴾.

لە هەندێك شوێن لە قورئان

١- (الخلق - برء - تصوير) لە دوو یەك هاتووە هەر یەك بە مانایەك

وەك ئەم ئایەتە: ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ٱلْمُصَوِّرُ﴾.

٢- لە هەندێك شوێنیش (خلق - برء) بەس دەوترێ (خلق )

(تصوير) دەوترێ تسویه (فسوى)

وەك ئەم ئایەتە : ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى (١) ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ (٢)﴾.

٣- لە هەندێك ئایەت زیاتر کورت کراوەتەوە بە هەرسێکیان (خلق - برء - تصوير ) دەوترێ (الخلق) یانی (خلق) بە مانای هەرسێکیان دێت وەك ئەم ئایەتە :

﴿أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ﴾ ٥٤ الاعراف

هەرسێکیان بە وشەی (خلق) تەعبیری لێکراوە.

الخالق - البارئ - المصور )

جا ﴿أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ﴾.

(خلق) ئەوە دروستی کرد و تەواو.

(امر) ١- بۆ ئیدامەی مەوجوداتەکە.

٢-بۆ بەخشینی (بقاء ) بە مەوجودات.

٣-بۆ گەیشتن بە سەرنجام.

کاتێك وشەی (امر) بۆ شتێك شعوری نەبێت :

١- بەخشینی ئستعداد و توانا بەم مەوجوداتە.

٢- گونجاندنی ئـەم مـەوجودە لەگـەڵ مـەوجوداتی تـر بـۆ ئـەوەی کـاری خـۆی بکات.

ئەم دووە بۆ مەعنای ( تقدیر و هیدایە).

بەڵکو ئەمر بۆ ئینسان : دەکرێتە دوو بەش:

١- امری تسخیری (اجباری) : بە دەسـتی خـۆی نیـە ئـەو ئـەمرە ئیـشی خـۆی دەکات، وەك مردنو قەزا و قەدەر - ئیتر.

٢- امری ابتلائی (تشریعی) : خودا رێگـەی حـەق و باطـل بـۆ ئینـسان پیـشان دەدات بۆ ئەوەی بە قـوەی علـم دەرکـی پـیّ بکـات، ئـەمجارە ئـیرادەی پیّـداوە بـۆ ئەوەی (انتخاب) یەکێکیان هەڵبژێرێت.

- تا ئێرە ئەم زەمینانەی دەکرێت شرك تیایاندا روودات :

١- خلـق : (١) ئەنـدازە (٢) جیـاوازی بـە پێـی ئەنـدازە (٣) دروسـت کردنـی شێوەیەکی نویّ.

٢- امر : بەخشینی قودرەت و ئیستعدادی خاص بە هەر مەوجودێك.

* ئێستا بزانین لەم چەند زەمینە بە درێتژایی مێژوو لە کامیان شرك روویداوە :

قورئان یەك دانە ئایەتی تێدا نیە کە قەومێك ئینکاری وجـودی خودایانکردبێـت، جا لێرە بە پێی ئایەت هیچ کام لە قەوم لە بەشی (خلق) شرکیان بـۆ خـودا ئـەنجام نەداوە.

وەك ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴾.

لێره پێویست به روونكردنەوەیەك دەكات:

شایعەیەك هەیە لە مەوردی فیرعەون یان نەمرود لە ئیدعای خودایەتی نە فیرعەون نە نەمرود ئیدعای خودایەتیان بە مەعنای ئەو خودایە نەبووە وەك خالق، ئەوان ئیدعای فەرمانڕوایان دەكرد. كە فەرمانڕەوا یەكێكە لە (٥) دانە مەعنای (ربّ) تەرجمەی واتا خاوەن.

وە هەروەها (اله) كە فەرمانڕەوایە.

نەمرود و ئەو گەلەی شركیان بۆ خودا ئەنجام دەدا بۆ (تقرب) بۆ نزیك بوونەوە لە خودا

هەروەكو خودای گەورە دەفەرموێت كە ابراهیم علیه السلام پێیان دەڵێت:

﴿ وَكَيْفَ أَخَافُ مَآ أَشْرَكْتُمْ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُم بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا ﴾.

وەختێك ئەوان هەرەشە لە ابراهیم علیه السلام دەكەن كە خوداكانمان توشی هیلاكەتت دەكەن.

دوایی دەفەرموێت:

﴿فَأَىُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِٱلْأَمْنِ﴾.

كام لەم دوو گروپە شایستەی ئەوەن نەترسن.

وە هەروەها خوا دەربارەی فیرعەون دەفەرموێت

﴿وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ﴾.

بە زاهیر ئنكاریان دەكرد بەڵكو لە دەروونیان یەقین بوون موسی علیه السلام لەسەر حەقە وە قەومەكەی هۆشداری دەدەنە فیرعەون كە چاری نەكەی كارت تێك دەچێت.

خودای گەورە دەفەرموێت :

﴿أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوْمَهُۥ لِيُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَ﴾.

ئەوەتۆ چۆن وازدێنی لە موسی علیە السلام لەگەڵ قەومەکەی تاخراپەکاری بخەنە سەر زەوی‌و واز لەتۆو لە خوداکانت (آلهة) بێنن.

یەعنی فیرعەون (الهە) خودای هەبوو وەك بت بۆ (تقرب) نزیکبوونەوە لە خودای گەورە.

جا لێرەدا لە زەمینەی (خلق) دا لە هەر سێ مەرحەلەکە شرك رووی نەداوە.

بەڵام روودانی شرك لە زەمانی نوح علیە السلام تا ئێستا لە زەمینەی (امر)دا بوە.

لێرەدا پەیوەندی هەیە بە قەزیەی (توکل).

بۆ رووداني هەر کارێك دوو شت هەیە:

١- (سبب) هۆ.

٢- ئیرادەی خودا.

لێرەدا ئینسان هۆ (سبب) جێ بەجێ دەکات وە دەبێت (توکل) ی لەسەر خودا بێت.

نمونە / یەکێك رەشکە دەخوات کە شفایە بۆ هەموو دەردێك بەڵام ئەبێت (توکل) ی لەسەر خودا بێت.

نمونەیەکی تر / سێ نەخۆش هەن هەرسێکیان گرفتارن بە دەست یەك نەخۆشیەوە، یەکێکدێت پێیان دەڵێت ئێوە بۆ ناچن بۆ لای فلانە دکتۆر زۆر باشە، جا ئەم نەخۆشانە یەکەمیان هەڵدەستێ خودای بیر نامینێ وا دەزانێ (شیفا) لای ئەو دکتۆرەیە ئەمە مرتەکبی شرکە، نەخۆشی دووەم دەڵێت کاکە هەر خودا شافی یە دکتۆری ناوێ ئەمەش مرتەکبی شرکە چونکە باوەڕی بە سەبەبی خودا نیە،

بەلأم سێیەم کە ئیماندارێکی بە ئاگایە هەڵدەستێ دەچێتە لای دکتۆر دەرمان وەردەگرێ دەڵێت خودایە ئەوە من سەبەبم جێ بەجێ کرد تۆش بیکە شیفا بۆم.

کە دەڵێت بەس خودا شافی یە ئەمەیان مرتەکبی شرکە چونکە دەرمانی بەرامبەر خودا داناوە ( دەڵێت خۆ دەرمان شیفام نادات ) نازانێ دەرمان سەبەبە.

جا لێرەدا (اسباب) هۆ تەکلیفە.

یانی وەختێك ئینسان ئەسباب بەکار دێنێ و بەلأم تەوەکلی گشتی لەسەر خودایە، بۆ وە تەواوی شتە تەجروبەیەکانی بەشەر فەقەت تا زەمانی حاڵ یەقینمان هەیە بەلأم لەمەودوا گومانە ئەویش ٥٠٪

بۆ نمونە / ئاگر سیفەتی سوتاندنی هەیە بەلأم خودا ئەم سیفەتەی پێداوە هەر ئەویش دەتوانێت بە جۆرێکی تر بیگۆرێت هەر وەك بەسەرهاتەکەی ئیبراهیم علیە السلام.

﴿يَـٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَـٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴾.

وە تەواوی مەخلوقاتیش لە ژێردەستی خودان خودا ئەم سیفەتی تایبەت بەخۆیانی پێداوە.

ئا ئەوە ئیتر گەڕانەوەی تەواو (رجوع کامل) بە خودا دەکات (توکل) لە بەشی (استعدات بە مەوجودات) مرۆڤ موەحید دەبێت هیچ بەکار هێنەرێکی تر ناناسێت.

زەمینەی پڕ جەنجال و بارز کە شرك تێیدا بەربڵاو بووە ئەویش فەریادڕەس (الە) قبوڵ کردنی غەیری خودا.

وا گومان بکات ( ملائکە یان امبیاء یا اولیاء ) مەلائیکەت یان پێغەمبەران علیهم السلام یان پیاو چاکان شوێنێکی وایان هەیە لەبەریان بپارێتەوە (دوعا) بۆ ئەوەی خودا لەبەر خاتری ئەوان لێی خۆش بێت.

بۆ نمونه / سونەتی خودا لە مەوردی نەخۆشی.

کەسێك باوەڕی وا بێت بە وجودی هۆ (سبب) کە خودا دایناوە ئەگەر ئەم هۆیە بەکار بێنێت گرفتاری ئەم دەردە نابێت چ بەهەر شێوەیەك چ خۆی بە دوور بگرێت یان مەناعەیەك بخوات.

بۆ نمونه / منداڵ لە سەرەتای ژیانی چەند دەرزییەکی لێدەدرێت وەکو مەناعە دژی سورێژە (سۆریکە) و هەندێك نەخۆشی تر. ئەمە خودا وای داناوە ئەم هۆیە جێبەجێ بکەی بۆ ئیرادەش هی خودایە.

لێرەدا ئەم هۆیە بەکار دێنی وە بەکار هێنانی باشیشە چونکە خودای گەورە رێگەی بە مرۆڤ داوە بۆ ئەوەی دەربارەی ژیانی شتی چاك دابین بکات بە تەوەکل لەسەر خودا.

بەڵام نابێت بڵێین شتێکی تر غەیری خودا هەیە بۆ دوور خستنەوە لەم دەردە یان چاك بوونەوەی ئەم دەردە.

بەڵام بەکار هێنانی هۆ (سبب).

ئەمە سونەتی خودایە کە ئەگەر ئەم هۆیە بەکار بێنیت وا دەبێت.

بۆ نمونه / کەسێك منداڵەکەی نەخۆشە ئەو دەیباتە لای فلان شێخ یان فلان بەرد یان فلان ئاو یان فلان قەبر بە باوەڕەوە (اعتقاد) کەچی رێگە چارەی ئەم نەخۆشە لەلای پزیشکە چونکە خودای گەورە دەرمانی داناوە بۆ ئەم دەردە لە رێگەی دروستکراوانی خۆی (مخلوقات).

جا نەوەی ئیسرائیل (بنو اسرائیل) بەو لادانەی ( انحرافات) کە کردیان دەیانگوت :

﴿نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ﴾.

نەك بەو مەعنایەی کە ئێمە کوڕی خوداین، بەو مەعنایە دەیانگوت کە ئێمە نازمان هەیە لەلای خوداو قسەمان دەڕوات.

بۆچی دڵی خۆی خۆش بکات کە کوڕی یەکێکە لە فلان پیاوچاك ئەگەر شرکیش بکات ناچێتە دۆزەخەوە بەڵام مەحاڵە لای خودا چونکە کوڕی نوح علیە السلام دەچێتەدۆزەخ.

مدافع – بەرگریکار – ئەمە تەنیا کار وکردەوەت بەرگریت لێ دەکات.

شفیع – تکا کار – ئەمەش تەنیا کار وکردەوەت تکات بۆ دەکات.

****

## ( دوعا – هاوار کردن لە غەیری خودا )

تەواوی ئایات مانای هاوارکردنی تێدایە بەشەکانی (مشتقات)ی دوعای تێدایە هاوار کردن لە غەیری خودا شرکە هەمیشە پێغەمبەران علیهم السلام ئەمەیان ووتوە.

بزانین دوعا یەعنی چی.

د – ع – و / یانی بانگ لێ کردن.

بۆ نمونە / دعوت ابني احمد   کوڕەکەم ناونا احمد.

چونکە دوایی بانگی لێ دەکەم احمد.

جا هاوار کردن (بانگ کردن) جۆری هەیە.

جۆری هەیە فەقەت بانگ کردنی سادە: فلان وەرە.

استغاثة / هاوار لەبەر کردن.

هاوار لێ کردن بە فریاد بە هانا هاتن ئەمە شرکە.

بۆ هێنانی خۆشی و لادانی ناخۆشی (دفع الضرر – جلب النفع).

بۆ نمونە / گەنم کەدەچێندرێت پێویستی بە ئاو و خاك هەیە ئەم هۆیە (سبب) دەبێت جێ بەجێ بکرێتت.

ئایا غەیری خودا هیچ شتێك یان کەسێك دەتوانێ چاکە و خۆشی ببەخشێ‌و ناخۆشی لا ببا.

خودا ( الرحمن الرحیم )ە

الرحمن : چاکەو خۆشی دەبەخشێ (جلب النفع).

الرحیم : ناخۆشی لا دەبا (دفع الضرر)

دوعاو پاڕانەوە لە غەیری خودا مرتەکبی شرکە، واتە ئەم کەسە شرکی کردووە، جا لێرەدا دەبێت پێی رابگەیەنرێت کە ئەم کارەی تۆ دەیکەی شرکە.

(الدعاء هو العبادة)

لەبەر ئەوە دەبێت پاڕانەوە تەنها روو لە خودا بێت

هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿قُلْ إِنَّمَآ أَدْعُواْ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ بِهِۦٓ أَحَدًا﴾ (الجن: ٢٠).

لە بەعزێك تەفسیر وشەی (ادعو) گۆڕدراوە لەبەر ئەوەی خۆیان تووشی ئەمە بوون، لەبەر ئەوەی لە غەیری خودا بپاڕێنەوە یان پاساو دێننەوە بۆ ئەم کارە.

دەڵێن (ادعو) واتە (اعبد) واتە (عبادة) عبادەت کردن.

. جا با بزانین (اعبد) یانی چی

عبد – ع –ب– د / یانی زۆرترین (منتها ) زەلیلی بەرامبەر یەکێك.

خوای گەورە لە سورەتی احقافدا دەفەرموێت:

﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱئْتُونِى بِكِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ هَٰذَآ أَوْ أَثَٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾.

ئەی موحەممەد پێیان بڵێ پێم ناڵێن ئەوەی بانگی لێدەکەن لە غەیری خودا لێیان دەپاڕێنەوە چیان لە زەوی دروست کردووە یان دەستیان هەبووە لە دروست کردنی ئاسمانەکاتن لەگەڵ خودا. دەی باشە دەلیلێك بێنن یان لە کتێبێك لە کتێبەکانی پێش ئێستا یان شوێنەوارێك لە علم بێنن وەك دەلیلی نەقڵی لە کوێ باسکراوە ئەم هاوار کردنە لە غەیری خودا، ئەگەر ئێوە راست دەکەن.

وە دوایی دەفەرموێت :

﴿ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَٰفِلُونَ ﴿٥﴾ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴿٦﴾ ﴾. کێ هەیە لەوکەسە سەرگەردانترو گومرا تر کە جگە لە خوا کەسانێك بانگ دەکەن هیچ وەڵامێکی بۆ نیە تارۆژی بەرپا بونی قیامەت _ دیارە کەسێك ئەگەر هاوار بکاتە شتێك جگە لە خوا بۆ ئەوەیەتی تا لە ژیانە فریای بکەوێ نە دوای مردنو بەرپابونی قیامەت، جا ئەگەر قیامەت هاتە پێش تازە سودیشی بۆخۆی نیە نە بۆ کەسێکی تر _ وەئەوان لە بانگو دوعاکردنەکەی ئەوان بێ ئاگان. هەرکاتێك خەڵکی کۆکرانەوە بانگ لێکراوان دەبن بە دوژمن بۆ بانگ کەران، ئەوان بەو بەندایەتیو پەرستشەی ئەوان بێ باوەڕن.

هاوار کردن لە غەیری خودا چ سەربەخۆ(مستقل) یان بە واستە (واسطة) بۆ بەخشینی چاکە و لادانی خراپە و ناخۆشی ئەمە تووشی شرکی گەورە بووە.

جا لە رۆژی دوایی پیاو چاکان دەڵێن ئێمە قبوڵ ناکەینو ئێمە ئاگامان لەوە نەبوەو کەبۆمان هاواری ئێمەیان کردووە، خۆیان لا دەدەن لەم کارەی ئەوان.

لەم ئایەتەدا هاوار کردن بە عبادەت ناو دەبا.

لــە پێــشدا دەفــەرموێت ﴿ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُواْ ﴾ کــێ هەیــە لەوکەســە سەرگەردانترو گـومڕا تـر کەکەسـانێك بـانگ دەکـات ، دوایـی دەفـەرموێت ﴿وَكَانُواْ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ﴾ بێ باوەڕ بون بەو عیبادەتەی ئەوان کردیان.

﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَقُولُ ءَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِى هَٰٓؤُلَآءِ أَمْ هُمْ ضَلُّواْ ٱلسَّبِيلَ ﴿١٧﴾ قَالُواْ سُبْحَٰنَكَ مَا كَانَ يَنۢبَغِى لَنَآ أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَآءَ وَلَٰكِن مَّتَّعْتَهُمْ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ نَسُواْ ٱلذِّكْرَ وَكَانُواْ قَوْمًۢا بُورًا ﴿١٨﴾﴾.لەو ڕۆژەوەی حەشر دەکرێن پیاو چاکان و ئەوانەی هاواریان لەبەر کردوون جگە لە الله بەرامبەر یەك رادەگیرێن خودای گەورە بە پیاو چاکان دەفەرموێت: ئێوە بەندەکانی منتان گومڕا کرد کە هاوار لە ئێوە بکەن یان خۆیان رێی راستیان لێ بزر بووە هاوار لە غەیری خودا دەکەن ؟. بەڵام پیاو چاکان دەڵێن پاك و بێ گەردی بۆ تۆیە خودایە بۆ ئێمە شایستە نەبوە کە دۆستانێكو پەرستراوانێك جگە لە تۆ بۆ خۆمان بگرین بەڵام تۆ نازو نیعمەتت دابە ئەوانو باو باپیرانیان هەتا وایان لێهات یادی تۆیان لە بیر چوو ئەوان کۆمەڵیکی داروخاوو بێ خێرو بێرن.

سوئالێك پرسیارێك دروست دەبێت.

ڕەنگە خـەڵکێك بڵـێن ئـەم هـاوار کردنـە وەختێـك دەبێتـە شـرك کاتێـك وەکـو قورەیش بکەین.

جوابی ئەوانە جوابی ئەو بەرد و تەختـە و ئـەو تاغوتانـە نیـە ئەمـە جـوابی ئـەو پیاو چاکانەیە.

رەنگە بەعزێکی تری خەڵك بڵێن ئێمە گوناهکارین رومان نایێت راستەوخۆ لە خودا بپارێینەوە.

ئەو خودا دەشوبهێنێ بە فەرمانڕەوایانی دونیا چونکە هەموو کەسێك ناگاتە لای فەرمانڕەواکانی دونیا مەگەر بە واستە نەبێت.

بەڵام خودای گەورە دەفەرموێتت راستەوخۆ بپارێوە لەبەرم جوابت دەدەمەوە (ادعو الله وانتم موقنون بالایجابة)

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێتت :

﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ یونس ١٨

عیبادەتی کەسانێك دەکەن جگە لە الله نە زەڕ و نە چاکەیان هەیە بۆ ئەوان بەڵام ئەوان دەڵێن ئەوانە دەبنە تکا کار بۆ مان لە لای خودا، پێ یان بڵێ ئایا ئێوە هەواڵێك بە خوا دەدەن کە ئەو نایزانێ لە ئاسمانەکانو زەویدا پاکیو باڵادەستی بۆ ئەو خوایە لە شەریکانەی کە ئێوە بۆی قەرار دەدەن.

هەرچی شتە خودای گەورە لە بواری بیر و باوەڕ (عقیدە) بەیانی کردووە بەش بەشی بەیان کردووە (جزئیات)

﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ۖ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لِى وَلْيُؤْمِنُوا۟ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾ (البقرة: ١٨٦).

خودای گەورە بە پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام دەفەرموێت وەختێك بەندەکانی من لە بارەی منەوە پرسیاریان کرد ئەوا من خۆم نزیکم پێویست بەتۆ

ناکا ئەمە دەربارەی دوعایە بە پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام دەفەرموێت من خۆم نزیکم پێویست بە تۆ ناکات.

بەڵام لە زەمینەی یاساکان (احکام)

کاتێك پرسیاریان لێ کردی دەربارەی یاسایەك (حکم) تۆ پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام

نمونە / ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ ۖ قُلْ﴾

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ ۖ قُلْ ﴾

﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ﴾.

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ﴾.

لێراو لە م ئایەتانەدا ﴿قُلْ﴾ بە پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام دەفەرموێت: تۆ پێیان بڵێ،

بەڵام خودای گەورە دەفەرموێ وەختێك دەربارەی من پرسیاریان کرد (فإني قريب) حەقی قسە کردنی بە پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام نەداوە (ئەوان راستەوخۆ بپاڕێنەوە لە من نەك لە پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام داوا بکەن بۆ ئەوەی لەلای خودا بێتە تکا کاریان یان شەفیعیان خودا رێی ئەمەی بە پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام نەداوە ).

لێرە نافەرموێت قل دەفەرموێتت ﴿فَإِنِّي قَرِيبٌ ﴾.

خودای گەورە دەفەرموێتت :

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِۦ نَفْسُهُۥ ۖ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ ﴿١٦﴾﴾

ق ١٦

به راستی ئێمه مرۆڤمان دروست کردوەو زاناین بەو وەسوەسه به دەرونیدا دێت ئێمه له شادەماری ملی زیاتر لەوەوەو نێزیکین.

(صلاة) یانی چی ؟

صلاة له لوغەی عەرەبی یانی پاڕانەوه (دوعا).

﴿وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ رۆژی به لای کەم ۱۷ جار ئێمه له نوێژدا دەڵێین:

(استعانه)داوای یارمەتی کردنی پێدانی چاکه و لادانی ناخۆشی، هەرچی کار و تەئسیره خودا دایناوه، بەڵام خودا هۆی (سبب) ی داناوه بۆ ئەوەی ڕووبدات.

بەلامن شتێك خودا داینەنابوو بەهۆ (سبب) ئەمه نابێت شرکه.

بۆ نمونه / وەختێك یەکێك نەخۆش دەبێت خودا داوو دەرمانی داناوه له ڕێگەی (علمی) نەك ئەوەی بچێته لای پیاوێك وەك پیاو چاك دەستی بەسەر دابێنێت بۆ ئەوەی چاك بێتەوه.

وەك دەرمانی ماددی عسل فیه شیفاء للناس

وەك دەرمانی مەعنەوی ئەمەش به پێی ئایاتی قورئانی.

وەختێك دوعا دەکات ئەو کاته سەبەبەکەی جێ بەجێ کردبێت.

مسوڵمانێك دوعا بۆ برایەکی تری دەکات :

۸ - ۹ - ۱۰ حـشر ﴿وَالَّذِينَ جَاءُو مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ (١٠)﴾.

به پێی ئەم ئایەته و ئایەتی تریش وه ئەحادیث هەر مسوڵمانێك (مکلف)ه بۆ برای مسوڵمانی تر دوعا بکات.جا هەر مسوڵمانێك (موکلف)ه بەوەی که بچێته سەر هەر قەبرێك جا ئەم قەبره چ پیاو چاك بێت چ سەحابه بێت دوعای بۆ بکات، نەك

لەبەری بپاڕێتەوە و دوعا لەبەر ئەو بکات، بەڵکو ئەو پێویستی بە دوعای زیندووان هەیە.

یانی ئێمە دوعا بۆ پێشینەی ئیمانداران دەکەین کە ئەوان زۆر لە ئێمە بەرز تر بوون لە پلەی ئیمان.

## (وە دەبێ بزانین دوعا بۆ کێ دەکەین )

لە سورەی (منافقون) هەم (توبە) خودای گەورە بە پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام دەفەرموێت ئەگەر حەفتا جار داوای لێخۆشبوون (استغفار) بکەی بۆ منافق خودای گەورە لێیان خۆش نابێت.

لێرەدا دەبێت دوعا بە جێ بێت دەبێت بزانین چۆن دوعا دەکەین وە بۆ کێ دەیکەین، مشرکینی مەکە ئاوایان دەوت کە ئەم بتانە بۆیە ئێمە دوعا لەبەر ئەوان دەکەین‌و لە بەریان دەپاڕێینەوە چونکە بۆمان لای خودا بە قەدرن تکامان بۆ دەکەن لە لای خودا.

چونکە خودا (اعز) ئەوان دەیان وت کچێکی هەیە ناوی (عُزا)

وە خودا (الله)یە دەیان وت یەکێك لە کچەکانی ناو (لات) ە

کە دەیانگوت بۆمان نازیان هەیە لای خودا دەبنە تکاکارمان.

لە سورەتی (انفال) ٣٠ ﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ﴾.

خودای گەورە دەفەرموێت:زەمانێك کافرەکان پیلانیان بۆتۆ بەر قەراردا بۆ ئەوەی سجنتکەن یان بتکوژن یان دەرتکەن ئەوان فرتو فێلیان کرد خوای گەورەش پیلانەکەی ئەوانی بەزانای‌و ئاگاداری لە دوژمنانی تۆ هەڵوەشاندەوە خوایگەورە چاکترین ماکیرە.

وه ئەوان دەیانگوت خودایە ئەگەر ئەوە حەقە بەرد ببارێنە بەسەرمان یان عەزاب و دەردمان بۆ بنێرە.

جا لەبەرچی خودای گەورە عەزابی نەدان.

١- ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ ﴾.

خودای گەورە عەزابیان نادات هەتا تۆ لەناویان بیت ئەی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام.

دوایی دەفەرموێت

﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴾.

مشرکەکان دوایی ئیستغفاریان دەکرد کە مناقەشەی پێغەمبەریان دەکرد علیه الصلاة والسلام ئەمە نەك بە مەعنای تەوبە، بەڵکو تۆزێك دەترسان.

ئەم دوو هۆکارە لە ناویان بوو خودای گەورە عەزابی نەدان.

بەڵام ساڵی دووەمی هیجری هیچ کام لەم دوو هۆکارە نەمان خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ ٱللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَمَا كَانُوٓا۟ أَوْلِيَآءَهُۥٓ ۚ إِنْ أَوْلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُتَّقُونَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾﴾.

دوای ڕووداني غەزوەی بەدر ئەم دوو هۆکارە لە ناو مشرکەکان نەما یەکەمیان چاکەکانیان لە ناو نەمان پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام و یارەکانی.

٢- ﴿وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً ﴾.

یانی موشرکەکان نوێژیان دەکرد بەڵام ئیتر ئەو شێوە ئیستیغفارەی پێشوو مقدارێك بە دڵ دەیانکرد ئەمە نەماوە ئیتر بەس ببوە جوڵانەوە بێ ئەوەی بیریان لای بێت.

هۆکاری دووەم ئەم نوێژەی پێشوو دەیانکرد مقدارێك بە دڵ بوو بەڵام دوایی ئەم مقدارەی نەما.

دوایی خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴾.

ئیتر ئەم دوو هۆیە نەما بکێشن عەزاب.

یانی کە کەسێك نوێژ دەکات بەڵام هاواری غەیری خودا بکات ئەمە توشی شرك بووە.

(مشرکین) حەجیان ئەنجام دەدا یانی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام ئەوەی بە فرسەت دەزانی بۆ بانگەواز رۆژانی حەج بوو کە موشرکەکان دەهاتن بۆ حەج، ئەنصار (انصار) کە بوون بە مسوڵمان لە حەج بوو شەش نەفەریان بوون بە مسوڵمان گەڕانەوە بۆ ساڵی داهاتوو هاتن پێنجی ساڵی پێشوو تر و حەفتیان کردبووە مسوڵمان ئەمجارەیان کە گەڕانەوە مامۆستایان لەگەڵ ناردرا ئەویش (مصعبی کوڕی عمیر ) بوو بۆ ساڵی سێیەم حەفتا پیاوو دوو ئافرەت لەبەیعەی عەقەبەی دووەم (عقبة الثانية) دوای ئەوە کۆچ بۆ مەدینە.

(مشرکین) وەختێ کە حەجیان دەکرد شیعاریان مەشهورە دەیانگووت:

(لبيك لا شريك لك الا شريك هو لك تملكه وما ملك)

دەیانگووت ئەی خودایە هیچ هاوبەشێکت نیە تەنها یەك نەبێت مەبەستیان (هبل) بوو

دەیانگووت : ئەویش لە ژێر چنگی تۆدایە.

وە لە حەدیسی سەحیح رۆژوی عاشورایان دەگرت.

وه هەروەها نەزریان دەکرد.

سـوره انعـام ١٣٦ ﴿وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلْحَرْثِ وَٱلْأَنْعَٰمِ نَصِيبًا فَقَالُوا۟ هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعْمِهِمْ وَهَٰذَا لِشُرَكَآئِنَا﴾.

لەو شتانەی کە خودا پێی دابوون لە زەراعـەت و مـەڕ و مـاڵات بەشـێك لەمـەیان قەراردا بۆ خودا بدرێتت بە فەقیران.

ئەوجارە دەهاتن دەیانگووت بەشێك بدرێتت بە فـەقیر بـۆ خـودا بەشـێکیش بـۆ بتەکان.

وا دەزانن خودا شتی ئاوای قبولە.

﴿فَمَا كَانَ لِشُرَكَآئِهِمْ فَلَا يَصِلُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَآئِهِمْ ۗ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾.

جا ئەوەی کە بۆ بتەکان بوو نە دەگەیشت بە خودا یانی نەیاندەدا بـە هـەژاران بـەڵام ئـەوەی کـە بۆخـودا بـوو بـەعزێکی دەگەیشت بـۆ (شـرکاء) بتـەکان یـانی بەعزێکیان دەدا بە فەقیر بەعزێکیشی بۆ (شرکاء) – بتەکان.

دەرئەنجام / هـاوار کـردن لـە غـەیری خـودا ئەگەرچـی بـەو شـێوەیەبێت بـە شێوەی نزیکبوونەوە (تقـرب) لـە خـودا یـان بـە شـێوەی سـەربەخۆ (مـستقل) ئـاوا شرکە ئەگەرچی ئەم کەسە تەواوی شەعائری دین ئـەنجام بـدات لـە نوێـژ و ڕۆژوو و حەج و زەکات.

شرك بۆ خودا ئەنجام دانی ئاوا نیە بڵێی خودایەکی دی هەیە غەیری خودا لەبەر ئەوەی کەس ئاوای نەگووتوە کەسیش ئاوا ناڵێت.

ئەسڵی شرك بۆ خودا ئـەنجام دان ئـەوە بـوو کـە پیاوچـاکانی پـێش نـوح علیـه السلام (ود – سواع – یغوث – یعوق – نسر ) وەفاتیان کرد شەیتان فێڵی لێکردن، لە سەرەتا پێی گوتن پەیکەریان بۆ دروست بکەن بەس بۆ ئەوەی لە بیریان نەکـەن یادیان بکەن دوای نەمانی ئەم جیلە پێی وتن بیان پەرستن ئەوانیش دەستیان کـرد بە پەرستنی ئەم پیاو چاکانەو خەڵکی هاواریان لەبەر دەکردن بۆ ئـەوەی لـە خـودا نزیکیان بکەنەوە.

لە صەحیحی بوخاری باسی ئەمە دەکات.

موشرکەکان هەمیشە باوەڕیان وابوو ئەو بتانە (الهە) لـە دەسـەڵاتی خودابـەدەر نین.

خودای گەورە لە سورەتی مۆمنون دەفەرموێت ٨٤–٩٠.

(بەیانی ئەوە دەکات کە عەقیدەی موشرکەکانی زەمانی پێغەمبەر ئاوا نەبوو کە ئێستا خەڵك بیریان لێ دەکەنەوە، بەڵام کـە هەرچـی ئالیهـەیان هـەبوو واتـا هەرچـی بتیان هەبوو دەیانپەرستن بۆ ئەوە بوو لە خودا نزیکیان بکەنەوە .

﴿ قُل لِّمَنِ ٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهَآ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٤﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٨٥﴾ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبْعِ وَرَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٨٧﴾ قُلْ مَنۢ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٨﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾.

یانی موشرکەکان باوەڕیان وابـوو کـە زەوی و ئـەوەی تێیدایـە هـی خودایـە وە باوەڕیان وابوو ئاسمانەکاتن و عەرشـی گـەورە خـودا خاوەنیانـە هـەتا موشـرکەکان باوەڕیان وابوو بتەکانیش لە ژێر دەستی خودان جوابیان ئەوەیـە کەچـی مەلـەکوتی

پەناگای هەموو شتە تەنیا هی خودایە وە دەسەڵاتی بەسەر هەرچی شتە تـەنیا هـی خودایە بەڵام عەقیدەی ئەوان وانەبوون کە ببن بە یەکتاپەرست.

جا لێرەدا / ئـەو شـتـەی کافرەکـان و موشـرکەکان تووشـی ببـون بـە درێتـژایی تاریخ هەر کەسێك تووشی ببێت وەك ئەوانە بە هەر تایبەتمەندیەکەوە.

تایبەتمەنـدی : مەبەسـتمان ئەوەیـە ئەگـەر ئـەو کەسـە نوێـژ بکـات یـا رۆژوو بگرێت....

جا وەك ئەوانە وەختێك (اقامة الحجة) بـۆی بـەیان نـەکرابێ لـە لایـەن کەسـێکی شارەزاوە. کە ئەمەی تۆ دەیکەی شرکە.

وەك ئەوانە وەختێك (اقامة الحجة) کرابن یانی بۆی بەیان کرابێت کەئـەم کـارەی تۆ دەیکەی شرکە.

جا هەر کەسێك دەچێتە سـەر هـەر قـەبرێك دەبـێ ئـەوەی لـە بیر بێت لادانـی ناخۆشی و پێدانی خۆشی بە دەستی ئەم پیاوە نیە. جا ئەم قەبرە پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) بێت یان پیاو چاك.

دەبێت بۆ ئەوە بچێت :

١-بۆ ئەوەی دوعای خێر بۆ ئەم قەبرە بکات نەك لەبەر ئەم قەبرە بپارێتەوە.

٢-یان بۆ ئەوە بچێت (تذکرة) بۆ ئەوەی بیری قیامەت و مردن بکات.

﴿قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ١٨٨﴾ (الاعراف: ١٨٨)، ( خودای گەورە باش رۆشنی دەکاتەوە کە ئەو پێغەمبەرە (علیە الصلاة والسلام) رەنگە خەڵك وا تێبگەن کە پێدانی چاکە و لادانی ناخۆشی بە

دەستە (جلب النفع) و (دفع الضرر) ئەمە نەك تەنها بۆ خەڵك ئەمە بۆ خۆشی هیچی بە دەست نیە.

﴿قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ﴾.

خودا دەفەرموێت بە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بڵێ هەتا بۆ خۆم هیچم بە دەست نیە تەنیا ئەوەی خودا کەیفی لێ بێت.

﴿وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ﴾.

وانەزانن من وەحیم بۆ کراوە بەشێك لە غەیبم بۆ بەیانکراوە من ئیدی هەموو غەیب دەزانم ئەگەر غەیبم زانیبا تووشی خراپە نەدەبووم بەڵام تووشی زۆر گێچەڵ و خراپە بووم.

﴿إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾.

پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بڵێ من هیچێك نیم جگە لە ئاگادار کەرەوەو مورژدەدەر ئەویش بۆ ئەوانەی ئیمان دێنن.

هەروەها خودای گەورە لە سورەتی جن ٢١-٢٢ خودا ئاوا دەستور بە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەدات.

﴿قُلۡ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا رَشَدٗا﴾.

خودای گەورە بە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێت بڵێ من نە دەتوانم بتوانم زەرەرتان لەسەر لابەم یان زەرەرتان پێبگەیەنم بتان ترسێنم وە نەرێگەیەکم پێ نیشاندان سەربەخۆ غەیری ئەوەی خودا ئەمری پێ کردووم.

﴿قُلۡ إِنِّي لَن يُجِيرَنِي مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٞ وَلَنۡ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدًا ٢٢﴾.

ئەی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بڵێ من خۆشم ئەگەر خودا شتێکم بەسەر بێنێ کەس نیە لەسەرم لابیا غەیری خودا. جا ئەمە مانای ئەوە نیە لە مەنزڵەتی

پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) کەم بکەینەوە، ڕێز دانان بۆ پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بۆ ئەوە نیە کە نزیکی بکەینەوە لە خودا.

ئەوانەی هاوار لە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەکەن ئامادە نین سونەتێك لە سونەتەکانی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) جێ بەجێ بکەن.

ڕێز دانان و ریز گرتن لە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ئەوەیە کە تۆ شوێن پەیامەکەی بکەوی سونەتەکانی ئەو جێ بەجێ بکەی.

دەربارەی ئەوەی کە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بکرێتت بە واستە هەندێك ئیشارەت بە ئایەتێك دەکەن غەڵەت تێگەیشتوون.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱبْتَغُوٓاْ إِلَيْهِ ٱلْوَسِيلَةَ وَجَـٰهِدُواْ فِى سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ (مائدة ٣٥).

ئەوانەی ئیماندارن لە خودا بترسن هەوڵبدەن تەواوی زەحمەت بکێشن بۆ ئەوەی وەسیلەیەك بدۆزنەوە تا لە خودا نزیکتان بکاتەوە ئیتر فەلاح و رزگاریتان دەبێت.

دەڵێن ئەوەتا وەسیلە لێرە هاتووە

جا بۆ وەڵامدانەوەی ئەمە خودا دەفەرموێتت:

﴿ قُلِ ٱدْعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِۦ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا ﴿٥٦﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ ﴾ (اسراء ٥٦_٥٧).

ئەی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بڵێ بەوانەی گوماندەکەن کە غەیری خودا نەفع و زەرەری بە دەستە نە تەنها بۆ خویان هیچیان بەدەست نیە ناتوانن

بیدەن بە یەکێکی تریش. هەر ئەوانەی هاوار کەران هاواریان لێدەکەن غەیری خـودا ئەوان بـۆ خۆیـان دەگـەڕێن بـە دوای هۆیـە (وسیلە) بـۆ ئـەوەی لـە خـودا نزیکیـان بکاتەوە.

﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا﴾.

بەڕاستی ئەو عەزابە حەقی خۆیەتی خەڵکی لێی بترسن.

جا بۆ نمونە:

لە مەحشەر ئەوا مەخلوقات بەرەو خودا دەچن لـەملاوە مەلائیکـەت لـەم لاوەش جن لەولاوەش بەشەر لەم لاوەش محمد (علیە الصلاة والسلام) کە اقرب الی الله)یە کە نزیکترین کەسە لای خودا جا خودای گەورە دەفەرموێت ئەوەی وا (اقرب) نزیکـە بە شوێن هۆ(وسیلە)دەگـەرێ ئایـا ئـەکرێت ئـەویش محمـد (علیـە الـصلاة والـسلام) ئەوان بکات بەهۆ (وسیلە) بۆ نزیکبوونەوە لە خودا.

سەرەنجام (وەسیلە) شتێکە غەیری مـەخلوقات زۆر سـادە لـە سـورەتی (علـق) بەیان دەکات.

﴿وَٱسْجُدْ وَٱقْتَرِب﴾.

(اسجد) سجد / مرۆڤ لە بەرامبەر شتێك خۆی زۆر زەلیل و کز بنوێنێت.

وەسیلە عبارەتە لە:

١- ناسینی خودا

٢- ئیمان و عەمەل

یەعنی ئەوەی مرۆڤ خۆی جێ بە جێی دەکات.

خودای گەورە دەفەرموێت :

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥٓۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخۡلُقُواْ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجۡتَمَعُواْ لَهُۥۖ وَإِن يَسۡلُبۡهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيۡـٔٗا لَّا يَسۡتَنقِذُوهُ مِنۡهُۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلۡمَطۡلُوبُ ٧٣﴾ (حج ٧٣).

ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە شتێکی زۆر خۆش بەیان دەکات گوێی بۆ راگرن تەواوی هاوار لێکراوان لە (ملائیکە و انبیاء واولیاء) هەرگیز ناتوانن مێشێکیش دروست بکەن ئەگەر چی کۆشبینەوە خۆ ئەگەر شتێکیان لێ هەڵمژێ ناتوانن لێی بسێننەوە شوێن کەوتوان و شوێن کەوتو هەردوك لاوازو بێ دەسەڵاتن.

جا هاوار کردن لە غەیری خودا شرکە.

خودای گەورە دەفەرموێت :

(بەیان دەکات کە موشرکەکان ئەو فەریاد رەسانەیان تەنیا بە وەسیلە دەناسی)

﴿أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُۚ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ فِي مَا هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ كَفَّارٞ ٣﴾ (زمر: ٣).

هۆشت بێت خالصانە تەنیا بۆ خودایە ئەوانەی بە غەیری خودا پیاوچاکیان بۆ خودا قەرار داوە بۆ ئەوەی لە کاتی کێشە هاواریان بۆ بکەن کاتێك رەخنەیان لێ دەگیرێ دەڵێن بەس بۆ ئەوەیە لە خودا نزیکمان بکەنەوە لە رۆژی قیامەت خودا مەحکەمەی بەینیان دەکات لە ئەوانەی هاواریان لە پیاو چاك کردووە وە ئەوانەی رەخنەیان لێگرتوون وەخودای گەورە هیدایەتی کەسانێك نادات کە درۆزن وکافر

بێت ئەو گشتە ئایەتەی خودا لەبەر چاو نەگرێ کە هاوار کردن لە غەیری خودا شرکە.

دوایی چارەی خیلاف دەکات

﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا﴾

ئەوانەی هاواریان لە غەیری خودا کردوە بۆ دۆزەخە.

﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا﴾.

وە ئیمانداران ئەوانەی رەخنەیان لێ گرتوون بۆ بەهەشت.

هەروەها لە ئایەتی ٣ زمر وە ١٨ یونس وە ٢٣ احقاف رۆشن دەبێت کە موشریکەکانی هەموو زەمانێك دەیانگوت ئێمە رووی ئەمەمان نیە راستەوخۆ بپاڕێینەوە لەبەر خودا پەنا دەبەینە ئەم شتانە بۆ ئەوەی ببنە وەسیلە لەلای خودا بۆمان.

وەختێك موشرکەکان شرکیان ئەنجام دەدا دەیانگووت بۆمانی ئێمە دەیانپەرستین کچانی خودان وەکوڕانی خودان:

﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ﴾.

﴿وَقَالَتِ ٱلنَّصَـٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ﴾.

لە ئایەتی ٧١-٧٢ - ٧٣ - ٧٤ سورەی نحل لە هێنانەوەی چەند دانە مەسەلەیێك بۆ حوکم کردنی شرك ئاگادار دەکات بەوەی مرۆڤ حەق نیە نمونە بۆ خودا بەیان بکات تەشبیهی خودا بکات بە هیچ شتێکی ترەوە وە ئەگەر مەسەلەیێك باس بکرێت دەبێت خودا خۆی بەیانی بکات.

﴿ وَٱللَّهُ فَضَّلَ بَعۡضَكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ فِي ٱلرِّزۡقِۚ فَمَا ٱلَّذِينَ فُضِّلُواْ بِرَآدِّي رِزۡقِهِمۡ عَلَىٰ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَهُمۡ فِيهِ سَوَآءٌۚ أَفَبِنِعۡمَةِ ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ ﴿٧١﴾ ﴾.

ئێوه شەریك بۆ خودا قەرار دەدەن حازر نین لەو رزقە زۆریەی زیادەی بدەن بەو کەسانە کە نزیکی خۆتانن چۆن رازین (مساوات) لەگەڵ خودا بکرێتت دەی ئەوا نیعمەتی خودا ئینکار دەکەن.

﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةٗ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِۚ أَفَبِٱلۡبَٰطِلِ يُؤۡمِنُونَ وَبِنِعۡمَتِ ٱللَّهِ هُمۡ يَكۡفُرُونَ ﴿٧٢﴾ ﴾.

ناوی هەندێك لە نیعمەتەکانی دەبا کە خودایەك ئەم نیعمەتانەی داوە بە مرۆڤ دەبێت هەر ئەو (اله) بێت.

دەفەرموێتت خودا هەر لە خۆتان ژنی بۆ خەلق کردن وە لە ژنەکاننتان رۆڵەی بۆ خەلق کردن وە کەسانێکی پێدان بۆ ئەوە لەبەر دەستتان بن وەك رۆڵە هەروەها لە رۆزییە پاك وخۆشەکان کە حەقی کەسی بەسەرەوە نیە لە رووی مەعنەوییەوە وە لە رووی ماددیەوە حەرام نین.

دەی ﴿أَفَبِٱلۡبَٰطِلِ يُؤۡمِنُونَ وَبِنِعۡمَتِ ٱللَّهِ هُمۡ يَكۡفُرُونَ ﴾.

ئەمجارە بە غائیب ناویان دەبات ئیمان بە شتی بێ ئەساس و پر و پوچ دێنن نیعمەتەکانی خودا پشت گوێ دەخەن کە ئەوان هیچیان بە دەست نیە.

﴿وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمۡلِكُ لَهُمۡ رِزۡقٗا مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ شَيۡـٔٗا وَلَا يَسۡتَطِيعُونَ ﴿٧٣﴾ ﴾.

وەختێك نعمەتەکانی خودا پشت گوێ دەخەن بەندایەتی بۆ کەسانێك دەکەن کە هیچ دەسەڵاتێکیان نیە.

خودای گەورە دەفەرموێت خودا مەشوبهێنن بە کەسانی تر

﴿فَلَا تَضْرِبُوا۟ لِلَّهِ ٱلْأَمْثَالَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧٤﴾﴾.

جا خودا خۆی مسال(مثل) بەیان دەکات گوێ راگرن لە دوو (مثل)

﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبْدًا مَّمْلُوكًا لَّا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَمَن رَّزَقْنَٰهُ مِنَّا رِزْقًا حَسَنًا فَهُوَ يُنفِقُ مِنْهُ سِرًّا وَجَهْرًا ۖ هَلْ يَسْتَوُۥنَ ۚ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾﴾ (نحل: ٧٥).

خودا نمونەیەکی باس کردووە لە ناو چەندەها نمونە بۆ ئەوە مرۆڤ بگات بەوەی کە کەس فەرمانڕەواو فەریادرەس نیە بەم شێوە.

دەی قیاس بکەن لە بەینی دوو کەس کە یەکێکیان (مملوك) هیچی بە دەست نیەو ناتوانێ هیچ ئەنجام بدات وە کەسێکی تریش رزق و رۆزی بە دەستە بە کەیفی خۆی لێی دەبەخشێ بە نهێنیو بە ئاشکرا (سر – جهر) الحمدلله دەی ئاوا مسال دەکات بۆ خۆی یانی تەواوی مەخلوقات وەك ئەم عەبدە (مملوك) ە وایە کە خۆی مولکی کەسێکی ترە هیچی لەبەر دەست دا نیە وە مەسلی خوداش وەك ئەو کەسە وایە کە رزق بە دەستە بە کەیفی خۆی دەیبەخشێ چۆن ئەم دوو نەفەرە یەکسان دەبن وە خوداو مەخلوقەکان یەکسان نین بەلام ئەوان (لا یعلمون) یانی ئیستیعدادیان تێدا نیە بۆ ئەوەی دەرکی حەقیقەت بکەن.

مثل ٢ ٧٦ النحل ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيْنِ أَحَدُهُمَآ أَبْكَمُ لَا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوْلَىٰهُ أَيْنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأْتِ بِخَيْرٍ ۖ هَلْ يَسْتَوِى هُوَ وَمَن يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ ۙ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٦﴾﴾.

دوو پیاو یەکێکیان توانای بەسەر هیچ نیەو بووە بە بار لەسەر خاوەنەکەی کە دەینێرێ بۆ هەر شوێنێك بە خێرەوە ناگەڕێتەوە بۆ لای وە هیچ شتێکی باشی بۆ ئەنجام نادات دەی ئەوە وەك یەکە لەگەڵ کەسێك ئەمر بە عەدل و چاکە دەکات، ئاوا نیە رێی راست پێ نەزانێ تەنها رێی راستی گرتە خێر پێ دەزانێ ئایا ئەم دوو پیاوە وەك یەکن.

یانی تەواوی مەخلوقات هیچ دەسەلاتێکیان نیە وە هیچ قودرەتێکیان نیە بوونەتە بار بەسەر خاوەنەکانتنیان کە خودایە تەنها خودا رێگەی راستی نیشان دەدات، ئەگەر بیداتە دەست خۆیان ئەوا تێك و پێکی دەدەن

تەنها خودایە ئیدارەی ئەم کەونە دەکات مایەی تەوازنی ئەم کەونەیە.

وەختێك هاوار دەکاتە (امبیاء) یان (اولیاء) کە نە ئاگای لەوە وە نە لێی نزیکە وە نە زیندووشن.

بەعزێك ئستاد دەکەنە سەر ئەو ئایەتەی دەربارەی شەهید کە دەفەرموێت زیندوون نەمردوون لەبەر ئەوەی زیندوون دروستە بیانکەین بە واستە ئەبیستن.

جا لێرە دەبێت دوو شت ڕۆشن بێتەوە:

١- رەبتی ئینسان لەگەڵ غەیب چۆنە.

٢- (حیات وموت) مردن و ژیان لە فەرهەنگی قورئاندا ئایا وەك ئەوەیە کە خەڵکی لە دونیا لێی تێگەیشتوون.

یەکەمیان

سێ جۆر ژیان (حیات) هەیە:

١- ژیانی درەخت.

ئەمە دوو سیفەتی هەیە:

١- نمو.

٢- تولیدی مثل.

لەسەرەتادا باس کراوە.

٢-وحیاة حیواني چوار سیفەتی هەیە:

١- نمو: ئاوو خۆراك دەخوا بۆ گەشە ٢- تولید مثل دەرەنجامی هەیە ٣- احساس بە حواس بۆ وەرگرتنی زانیاری یە ٤- الحركة الارادية جولانەوە بە ویستی خۆی.

جا بەر لە نزولی قورئان ژیان ( حیاة) بەکار دەهێنرا ئەگەر شتێك ئەم چوار سیفەتەی تێدا بووایە، ئەگەر ئەم چوار سیفەتەی تێدا نەبووایە دەیانگووت مردووە.

بەلام دوای نزولی قورئان، قورئان ژیانی بۆ ئەو شتە بە کار دەبرد کە خاوەنی ئەم چوار مەزهەرەیە وە بۆ شتی تریش بەکاری بردووە.

وەختێك کە رۆح واردی لاشە دەبێت دوو دانە مەزهەر بە شێوەی جوان پەیا دەبن بۆ ئەو رۆحە

١- علم

٢- ارادە

علم : یانی خودا ی گەورە زانستی پێدای واتا عەقلی پێدای بۆ ئەوەی خراپە و چاکە لەیەك جیاواز بکەیتەوە.

ارادە : وە هێزی ئیرادەی پێدای بۆ ئەوەی بە ویستی خۆت کامیان باشە هەلی بژێری.

قورئان بۆ ئەم دوو سیفەتە وشەی ژیانی (حیاة) بە کار هێناوە.

بۆ نمونه / زوڵم – نور بەر لە نزولی قورئان خەڵکی هەر بۆ تاریکایی و رۆشنایی بەکاری هێناوە، بەڵام لە قورئان زوڵم (تاریکایی ) بۆ ئەو کەسە بەکار دێنێت کە ئیمانی نەهێناوە.

﴿يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾.

لە تاریکایی بێ ئیمانییەوە بۆ رووناکی ئیمان.

هەروەها لە سورەتی نور ٤٠

(ضلمات) تاریکایی بۆ گومراهی بەکار دەهێنرێت تەشبیهی حاڵی کافر دەکات بەوەی کە لە ناو تاریکی ناو بەحر لە ناو شەپۆلەکانی ژێر ئاو شەپۆلی سەتحی ئاو وە تاریکایی هەوردا تاسێ تاریکێ وە لەو تاریکی یە وەختێك دەستی دەردەهێنێ خەریکە نەبینێ.

دەفەرموێت :

﴿أَوْ كَظُلُمَٰتٍ فِى بَحْرٍ لُّجِّىٍّ يَغْشَىٰهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ سَحَابٌ ظُلُمَٰتٌۢ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَآ أَخْرَجَ يَدَهُۥ لَمْ يَكَدْ يَرَىٰهَا﴾.

حاڵی مرۆڤی کافر وەك ئەوە وایە کە لە ناو بەحر لە ناو سێ تاریکی وەختێك نەبینێ لەناو بەحرێکی شەپۆل وەشێن شەپۆلی ژێر ئاو شەپۆلی سەر ئاو وە تاریکی هەور.

﴿وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ﴾.

هەر کەس خودا نوری هیدایەتی بۆ نەدا ئیتر لە هیچ لایەکەوە نوری بۆ نیە ئەوە وشەی نور و (ضلمات) بۆ تاریکایی و رۆشنایی مەعنەوی ئەوەی پەیوەندی بە رۆحی مرۆڤ هەیە ئەویش ئیمانە.

مەبەست ئەوەیە لە قورئانوشەی زۆر هەن بە ئیزافەی ئەو مەعنایەی لەوەو پێش بە مەعنای تر بەکار دەهێندرێتن جا لێرەدا دەبێ لە فەرهەنگی قورئان بگەین.

لەسەر ئەم ئەساسە وشەی (حیاة) لە قورئان وەختێك نەزەر بە روحی ئینسان بەکار هاتوە وە هەروەهاش بۆ مانای (علم ) و (ارادە) ی ئەو کەسە بەکار هاتوە یانی فلان کەس زیندووە چونکە خراپە و چاکە لێك جیا دەکاتەوە. (حق – باطل)

خودای گەورە لە سورەتی انعام ١٢٢دا دەفەرموێتت:

﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا﴾

ئایا کەسێك کە مردوو بوو لە ناو تاریکی گوزەر دەکات ئێمە زیندوومان کردەوە رۆشناییمان دروست کرد ئایا وەك یەکن. لێرەدا ئینسانی جاهل بە (میت) مردوو ناو دەبا بە هۆی ئەم دوو مەزهەرەی داخلی ئینسان ١ علم ٢ ارادە لەبەر ئەوەی ئەم دووانەی تێدا نەبووە لە فەرهەنگی قورئان بە مردوو (میت) ناو دەبرێ لێرە نور زیندوو کردنەوەیە ئەمە بەشی علم و لە دوای ئەمە رێی خۆی زانی حەرەکەت دەکات بە ئیرادەیە.

یەك وا لەناو ئاو و تاریکییەکان لە شرك و غەفلەت لە یادی خودا (ارادە) ی نیە بۆ ئەوەی رێی راست هەڵبژێرێ.

هەروەها خودای گەورە لە سورەتی (یس: ١١) دا دەفەرموێتت :

﴿ إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ اتَّبَعَ الذِّكْرَ وَخَشِيَ الرَّحْمَٰنَ بِالْغَيْبِ ﴾.

ئەی پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) تۆ هۆشداریت تەنها بۆ کەسێکە کە یادی خودای لە دڵدایە وە لە خودا دەترسێ وە خودای نەدیوە تەنها بە غەیب نەبێ.

هەروەها لە ئایەتی ٧٠ یس دەفەرموویت :

﴿لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيًّا﴾.

ئەوقورئانە بۆ کەسێکە کە زیندووە بۆ ئەوە ئینزاری بکات.

ئەم دوو ئایەتە یس ١١ و ٧٠ لە پال یەکدا بنێین لە پێشدا دەفەرمویت ( بۆ کەسێك ترسی خودای لە دلّدا بێت) دوایی دەفەرمویتت : بۆ کەسێك زیندوو بێت )

یانی کەسێك یادی خودای لە دلّدا بێت زیندووە.

هەر لە ئایەتی ٧٠ ی یس

﴿وَيَحِقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾، کافرەکان دەبێ بچنە دۆزەخ بە فەرمانی خودا.

لە بەرامبەر (حي) دەفەرمویت (کافرین) وەك ئەوەی بفەرمویت ( لینذر من کان مؤمنا حیا ویحق القول علی الکافرین المیتین)

کە ئەمە ئسلوبێکە بە ئیستلاحی (علما) زانایان پێی دەلّێن (اشتباك) لە دوو تەرەفەوە دوو شتی بەرامبەر یەك هەن لە دوانی ئەم لا یەکێکیان باس دەکرێت لە دوانی ئەملاش یەکێکیان باس دەکرێت.

موقابلی ئەم لە هی ئەولا لادەبرێت (حذف) وەهی ئەملا لەولا (حذف) لا دەبرێت بۆ کورت کردنەوە (اختصار) (حي) (مؤمن) دەگەیەنێ وە (میت) (کافر) دەگەیەنێت.

١- کەوا بوو چۆن (١) نمو (٢) تولید مثل (٣) احساس بالحواس (٤) حرکة الادارية..وشەی( حَي) بۆیان بەکار دەهێنرێت.

٢- هەروەها مەعرەفەی رێگەی حەق و لە خوا ترسان و یادی خودا وشەی (حي) بۆ بەکار هێنراوە.

کەوابوو نەبوونی چ بەشی یەکەم چ بەشی دووەم مردووە (میت ) بەڵام نـەبوونی بەشـی یەکـەم مردنـی جەسـتەیە، نـەبوونی بەشـی دووەم مردنـی رۆحـی یە.....مەبەستمان لە بەشی یەکەم (١) نمو (٢) تولید مثل (٣) احساس بـالحواس (٤) حرکـة الارادیـة (بـەم چـوارە دەوتـرێ (حیـاتی حیـوانی)). بەشـی دووەم (١) ارادە (٢) علم

لە نەتیجەدا :

١- هەیە ئێستا لە ژیاندایە بەڵام بە لێکدانەوەی قورئان مردووە کە ئیمانی نیـە کافرە.

٢- هەیە ئێستا (حیاتی حیوانی) نیە واتـا کەسێك لـە دونیـادا مـردووە نـەماوە بەڵام لای خودا زیندووە وەك کەسێك بە ئیمانەوە مردبێت.

٣- هەیە هیچ کامیان نیە کافرێك بمرێت.

٤- هەیە هەردووکیانی هەیە ئیماندارێك کە زیندووە لە ژیاندایە.

دوو جۆر لە دایك بوون هەیە :

- ئینـسان کـە ئیمـان دێنێـت لـە دایـك بـوونێکی تـازەی دەبێـت، ئەمـە بـە ئیستلاحی قورئانی بەوەی کە (انما المؤمنـون اخـوة) ئەمـە لـە دایکـی ئیمانـە ئەمـە پەیوەندی هەیە بە رۆحی ئینسان.

- وە لە دایك بوونێکی دونیایی هەیە ئەویش لە دایك وباوکی خۆیەتی.

لە بەشی یەکەم وشەی (اخ) لە (انما المؤمنون اخوة) بە مانای نێر و مێ (مـذکر ومؤنث) نایەت لێرە گشتی دەگرێتەوە.

ئەم برایە (اخوە) وەك (اخوە) کانی تر نیە ( وجاء اخـوة یوسـف) چونکە لێـرە بەیانکراوە کە براکانی یوسف علیە السلام لە دایك و باوك.

له دایك بوونی ئیمانی بەردەوامە لە ژیان کاتێك کە جەستەی دەمرێ هەر بەردەوامە لە ئیدامەی ژیانی بەرزەخی ناوگۆڕ تا زیندوو کردنەوەی جەستە.

وەك دەفەرموێت : تەسبیح دەکەن لە بەهەشتا.

تسبیح : یانی دوور کردنەوەی خودا لە شتێك کە شایستەی ئەو نیە.

حمد : یانی هەر شتێك بێتە پێشی لە چاکە لە خواوەی بزانێت.

خودای گەورە لە سورەتی بقره ١٥٤ دا دەفەرموێت:

﴿وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَن يُقْتَلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتٌۢ ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ وَلَٰكِن لَّا تَشْعُرُونَ ﴾.

به تەعبیری تر لە سورەتی ال عمران هەیە.

وشەی (شعور) یانی (شعر) موو واتا زۆر دەقیق و باریك.

شعور مصدری فعول بۆ دەرکی شتی زۆر دەقیق و ورد و باریك.

هەروەها بە تەعبیرەکەی لە سورەتی ال عمران دایە:

﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴾.

بۆمان نەك زیندوون، بەڵکو رزقیان پێ دەدرێت زیندوون لە لای خودا، وشەی رزق لە دونیا مەعنای دیارە (محدد) تەنیا بۆ خواردن و بەعزێك شتی تر بۆ پۆشین.

رزق لە لوغە یانی (العطاء الجاري ).

بەخششی پێویستە بەردەوام لە هەر نەوعێك بە هەر شێوەیەك بۆ رۆح و بۆ لاشە بە پێی پێویست.

ئەو رۆحە لە دەورانی بەرزەخی رزقی پێ دەدرێت هەروەها مەعرفەتی زیاد دەبێت بەڵام ئینسان دەرکی پێ ناکات.

جا ئەو رزقانەی لە دەورانی بەرزەخی ئەدرێت تایبەت بە ئەوانە نیە کە لە رێگەی خودا شەهیدن لە سورەتی حج گشتی (تعمیمی) دەکات بۆ مسوڵمانان شەهید و غەیرە شەهید.

﴿وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓاْ أَوۡ مَاتُواْ لَيَرۡزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾ (حج ٥٨).

ئەوانەی هەموو شتیان تەرك كرد بۆ خودا كۆچیان كرد جا یا كوژران یان مردن خودا رزقی باشیان پێدەدا.

بەلام ئایەتی: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٞ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمۡ تَخۡتَصِمُونَ ﴿٣١﴾﴾ (زمر: ٣٠ـ٣١). بە پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام دەفەرموێت تۆ مردووی ئەوانیش مردوون نافەرموێ دەمرن.

١- نافەرموێ (تموت ) دەفەرموێت (میت) وەك ئەوەی ئێستا مردوون.

٢- لە جملەی (اسمیە) كە (اسم) ە بۆ (ان) میت خەبەرە.

٣- بونی حەرفی تەئكید كە (ان)

بەلام لە رۆژی قیامەت دەست دەكەن بە كێشمە كێش لەگەڵ ئەهلی باطل هەرروەها دەفەرموێت :

﴿كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِ﴾.

هیچ كەس جیاواز ناكاتەوە بە كۆ (جمع) دەفەرموێت چ ئەوانەی شەهید دەبن چ ئەوانەی لە كۆچ كردن دەمرن و چ لە غەیرە ئیمانداران لە ئادەمەوە تا كۆتایی بە مسوڵمان و غەیرە مسوڵمان دەمرن.

یانی ئێستا بووە بە سێ شوێن

١- دەفەرموێت: هەرچی هەیە دەبێ بمرێت.

٢- دەفەرموێت: تۆ و ئەوانیش مردوون ئەی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام.

٣- دەفەرموێت: ئەوانەی لە رێی خودا کوژران و لە کۆچ کردن مردن زیندوون.

ئەمەی دەفەرموێت: مردوون و هەموو دەبێ بمرن ئەمە بۆ بەشی لاشەیە پەیوەندی بە هەر چوار سیفەتەکە هەیە کە نامێنێ (١) نمو (٢) تولد مثل (٣) احساس بالحواس (٤) حرکة ارادیة بەڵام ئەوەی دەفەرموێت: کە زیندوون ئەمە بۆ ئیماندارانە کە حەیاتی مەعنەوی بەردەوامە.

لێرەدا دوو ژیان و دوو مردن هەن ژیانی ئینسانی ژیانی حەیوانی بەشی رۆح و بەشی لاشە هەروەها مردنی ئینسانی مردنی حەیوانیە، بەم پێیە نزیك دەبینەوە لە داوا (مطلب).

## ( ئەو کەسانەی هاواریان لێدەکرێت، لە حاڵی مەرگدان ئایا گوێیان لێدە بێت یان نا؟ ئیتر ئایا دەتوانن خۆشی ببەخشێت یان خراپە و ناخۆشی لادت؟ )

ئەو کەسانەی هاواریان لێدەکرێ ئایا هاوارەکە دەبیستن ؟

بە شێوەیەکی تر ئایا لادانی ناخۆشی پێدانی خۆشی بە دەستە ؟

جواب : دیارە بیستنی دەنگ بریتیە لە گوێی ئینسان وە بیستن یەکێکە لە چوار سیفەتە زیندووەکە ئەگەر ئەوانە نەمان مردوون.

بۆمان پەیوەندیان بە ژیانی حەیوانیە کە مەربوتە بە بەشی ماددی مرۆڤەوە.ئەو کەسەی وا دەمرێت هەر کەسێك بێت لە پێغەمبەران وعلیهم السلام هەتا کۆتایی لە بەشی (حەیوانی) ئەم چوار سیفەتە دەمرن.

فەرقی مردووی ئیمانداران لە گەڵ مردووی کافران ئەوەیە کە لە ژیانی بەرزەخی مرۆڤی مسوڵمان رۆحی رزق و رۆزی هەیە، بەڵام بە شێوەیەك کە ئێمە نازانین.

کەسێك ئیدعای ئەوە بکات کە مردوو دەبیستێت وەك ئەوەیە ئیدعا بکات کە مردوو دەبینێت و دەڕوات. یان سەرماو گەرمای دەبێت یا بۆنی خۆش و ناخۆشی دەکات.

بەڵام بۆچی ئیمتیاز بە بیستن دەدەن بەس ؟

ڕەنگە بەعزە کەسێك لە مەوردی سەڵاوات دانەوە ریوایەتێك کراوە دەکەونە اشتباوە.

دەڵێت لە حدیثەکە( هەر کەس سەڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەری خودا علیە الصلاة والسلام لە حەفتا رۆژ جارێك دەبردرێتە لای پێغەمبەری خودا علیە الصلاة والسلام بە هۆی مەلائیکە.

ئەگەر دیقەت بکەی باسی بیستن ناکات.

حەدیسی تر ریوایەت کراوە لە مەوردی کوژراوانی غەزوەی بەدر حەفتا نەفەر لە سەرانی کوفر کوژران خرانە ناو چالێکەوە بە ناوی (قلیب) پێغەمبەری خودا علیە الصلاة والسلام چووە سەریان یەکە یەکە بە ناوی خۆیان بانگی کردن :

(ابا جهل – عتبه – شیبه – فلان )

هل وجدتم ما وعدم ربکم حقا    فقد وجدت ما وعدنی ربی حقا.

ئەریٚ ئێوە ئەوەی خودا وادەی پێدان دەستان کەوت عەزابێك کە وادەی پێداون لە لەحزەی دەرچوونی رۆح من ئەوەی وادەی پێدام دەستم کەوت.

لێرە یەکێك لە صحابە رضي اللە عنهم پرسیار دەکات ئایا گوێیان لێت دەبێت لێرە لە جوابە کە ئشکالێك پەیا دەبێت لە نەقلی حەدیسەکە.

(ابن عمر) لەو ساڵە منداڵ بوو لە کاتی چوون بۆ غەزوەی بەدر پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام وتی ئیجازە نیە منداڵێك بێت.

(ابن عمر) جوابەکەی گێراوەتەوە بەڵام دایکە عائیشە (رضي اللە عنها) راستی دەکاتەوە ئەمە لە (صحیحی بخاری) هەم ئیشتیباکەی (ابن عمر) وە هەم ڕاست کردنەوەکەی دایە عائیشەی تێدایە.

بەڵام ئەوانەی دەیانەویٚ کەڵك وەربگرن لەم حەدیسە بەشی یەکەم باس دەکەن بەڵام راستکردنەوەکەی دایە عائیشە باس ناکەن،

(ابن عمر) رەزای خوای لیٚ بیٚ وا دەگێڕێتەوە دەڵێت پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام فەرمووی وانە بێت ئێوە لەمان باشتر ببیستن.

بەڵام عائشە رضي اللە عنها دەفەرموێت (ابن عمر) اشتباهی کردووە.

عائیشە رضي اللە عنها دەفەرموێت پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام وای فەرمووە ( ئێستا دەزانن کە ئەوەی من گوتومە راستە چونکە ئێستا وان لە عەزاب دا )

لێره عائیشه رضي الله عنه استناد بەیەك له ئایات دەكات

سورەتی فاطر ٢٢ ﴿وَمَآ أَنتَ بِمُسۡمِعٖ مَّن فِي ٱلۡقُبُورِ﴾.

ئەی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام تۆ ئاوا نیت كه بتوانیت دەنگ بگەیەنیت بەوانەی كه له ناو قەبردان، لێرەدا (من فی القبور) واتا ئەوانەی لەناو كوفرن، لێره ﴿مَّن فِي ٱلۡقُبُورِ﴾ ئیستعارەیه وەرگیراوه بۆ كافرەكان بەكار هاتووه.

لێره لەوانەیه ئەوانه بڵێن: ﴿مَّن فِي ٱلۡقُبُورِ﴾ لەگەڵ كافرەكانێتی نەك لەگەڵ مردوو، بەڵام ئەوان غافڵن لەسەر ئەسڵێك كه ئیستعاره لەسەر ئەو ئەسڵە موبتەنیه.

استعاره : یانی مبنی لەسەر ئەسڵی تشبیه.

واتا وشەیەك له مەعنای خۆی هەڵیگری بۆ مەعنای تر بەكاری بێنی )

بۆ نمونه / دەڵێی عەلی وەك شێره (له ئازایەتی)

ئەمجاره بۆ ئەوەی زیاتر بگەیەنی كه عەلی وەك شێر ئازایەتی هەیه، له مەعنای ئەسڵی خۆی هەڵیدەگری

دەڵێی ( ئەمرۆ شێرەكەم له مزگەوت دیت )

یانی دەبێت علی و شێر له ئازایەتی نزیكی یەكتر بن، بەڵام شێر دەبێت ئازاتر بێت ئەمجا دەتوانین بڵێین علی وەك شێره یانی ئەسڵی ئازایەتی لێره هی شێره.

جا لەم ئایەتەدا تەشبیهی كافر دەكات بۆ كەسێك كه لەناو قەبر دایه.

كەواته لێره ئەسڵی نەبیستن هی ئەوه كه لەناو قەبردایه. یانی تەشبیهی كافر كراوه به نەبیستن كه ئەم نەبیستنه هی ئەوەیه كه له ناو قەبره ئەسڵی نەبیستن هی مردووه ئەم نەبیستنه (استعاره ) كراوه بۆ ئەوه كافر بشوبهێنیٚ بەم نەبیستنه.

یانی ئەوەی لەناو قەبره دەنگ نابیستیٚ وه كافریش دەنگی حەق نابیستیٚ.

(علما) تەوزیعیان داوە : کە ئەم (وجەالشبە) روی شەبەهە دەبێ بەهێزتر بێت لە (مشەبە) یانی بەهێزتر بێت لەوەی تەشبیە دەکرێت.

لێرە شوبهاندنی کافر کراوە بەوەی لەناو قەبردایە یانی نەبیستنی دەنگ مەعروفترە بەوەی لەناو قەبردایە، بۆیە کافر دەشوبهێندرێت بە ئەوەی لەناو قەبردایە.

ئەگەر چی لەم ئایەتە ئیستعارەیە، بەڵام باشتر ئەگەیەنێ چونکە عائیشە ئاوا رەدی ابن عمر رضي الله عنهم دەداتەوە کە جوابی پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام ئاوا نەبووە کە ئەوان گوێیان لێدەبێت.

یانی پێغەمبەری خودا علیە الصلاة والسلام بۆیە ئەم قسانەی کردووە بۆ ئەوە سەحابیەکان بە خۆیاندا بچنەوە نەك ئەوەی قسەیان لەگەڵ بکات.

**(وه هەروەها بە شێوەیەکی تەواو مەسئەلەی تەلْقین دێتە ژێر ئەم مەوردەوە ئەگەر قەرار بێت ئەم تەلْقینە جائز بێت بۆ ئەوەی وا لە ناو قەبردایە نەفعێکی هەبێت ).**

لێرە بۆمان دێتە پێشەوە :

یا تەکلیف و بانگەواز هێشتا بەردەوامە.

یا(اعوذ بالله)نسبەتی زوڵم دەدرێتە پاڵ خودا، کە یەکێك بە ئیمانەوە مردووە ئایا خودا رێگەی لێدەگرێت کە نەتوانێ جوابی پرسیاری مەلائیکەت بداتەوە.

وە هیچ حەدیسێك لە پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام نەقڵ نەکراوە کە یەکێك مرد تەلْقین بدرێتت.

جارێك لە (ئیمام احمد) دەپرسن ئایا ئەم تەلْقینە چی یە ؟

(امام احمد) دەفەرموێت نازانم خەڵکی دەوری شام ئەم کارە دەکەن.

(امام احمد ) وا دەڵێت کە موسنەدی هەیە ٣٠ هەزار حەدیس.

سێ دانە حەدیس کە یەکێکیان سەنەدەکەیان مقدارێك زەعیفە. لە تابعینەوە نەقڵ دەکرێت.

دەفەرموێتت : (کانوا یستحبون ان یقال) کە پێیان خۆشبوو لەلای مردوو ئەمە بگوترێت، بەڵام کانوا یستحبون کێن بەیان نەکراوە کە سابقینی ئەوەلین بوون یا بەیعەی رضوان بوون یا دوای فەتحی مەکە بوون ئاوا شتێك دەلیل نیە.

بەرزەخ لە لوغە بە مەعنای ( حد فاصل) لە بەینی دوو شت لە قورئان لە سێ شوێن هاتووە.

وەك (بینهما برزخ لا یبغیان)

کە ئەو دوو بەحرە حاجزێك لە بەینیان دایە نایەڵێت تێکەڵ بن.

ئەمجارە لە مەرحەلەی مەرگی هەر کەسێك حاجزێك لە بەینی دونیا و ئەو.

ئـەوەی کـە گوتمـان لـە بـەرزەخ عـەزاب هەیـە بـۆ کافرەکـان لەسـەرەتای رۆح دەرچوونیشی.

﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ ۖ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ﴾ (الانعام: ٩٣). وەختێك کە ستەم کاران درۆ بە دەم خوداوە هەڵدەبەستن یا دەڵێن وەحیمان بۆ هاتووە یان دەڵێن ئەمە چی یە ئێمەش دەزانین لەم شتانە بڵێین.

ئەگەر چاوت لێ بێت ئەم سـتەم کارانـە لـە نـاو گێـژاوی مەرگـدا مەلائیکەتـەکان دەستیان درێژ دەکەن‌و دەڵێن خۆتان رزگارکەن ئـەمرۆ عـەزابی زیللـەت دەخـۆن لـە بەرامبەر ئەو قسانەی دەتانکرد کـە نەتاندەویـست تەسـلیمی ئایـاتی خـودا بـن‌و لـە ئاست ئایەتەکانی خودادا خۆتان بە لوت بەرزیەوە رادەگرت.

لە سورەتی مؤمن– غـافر ٤٦ لەگـەڵ نیـوەی ئایـەتی ٤٥ لـەبارەی فیرعـەون و ئالی فیرعەون دەفەرموێت :

﴿وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا﴾.

عەزابی ناخۆش نیـشتە ملـی ئـالی فیرعـەون بـەیانی و ئێـواران ئاگریـان پێـشان دەدرێ ئەمە لەکاتی مردن.

﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓا۟ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ﴾.

وە لەو رۆژەی قیامەت بەرپادەبێ دەستور لە خوداوە دەدرێت کـە ال فیرعـەون بخرێنە ناخۆشترین عەزاب.

فەرقی قیامەت و ناو قەبر ئەوەیە قیامەت بە (اشد عذاب) ناو دەبا.

وه له سورەتی نوح ئایەتی ٢٥ بەیاندەکات کە لە لەحزەی مردنیانەوە دەخرێنە ناو ئاگر تا قیامەت.

﴿مِّمَّا خَطِيٓـَٔـٰتِهِمْ أُغْرِقُوا۟ فَأُدْخِلُوا۟ نَارًا فَلَمْ يَجِدُوا۟ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَنصَارًا﴾.

لەبارەی قەومی نوح کە خنکێنران یەکسەر بۆ ناو ئاگر غەیری خودا یاریدە دەرانیان دەست نەدەکەوت.

له ئاخری سورەتی واقیعە گشتی تر باسی دەکات چ بۆ سابقین چ اصحاب الیمین چ بۆ کافران و ئەوانەی قیامەتیان بە درۆ دەزانی دوای مردن یەکسەر نعمەت و عەزاب دەست پێ دەکات.

٨٨ ﴿فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾﴾ (الواقعة: ٨٨-٨٩).

کە لە پێشدا دەفەرموێت ﴿وَٱلسَّـٰبِقُونَ ٱلسَّـٰبِقُونَ ﴿١٠﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾﴾.

وەختێك جولآنەوەیەك لە ناو جاهلەکان دەست پێ دەکات پێشڕەوانی ئەم دینە بانگەواز دەکەن و ڕێ لە خراپە دەگرن. هەر کە مردن یەکسەر ئیسراحەت و بۆنی خۆشی و بەهەشتی نەعیم.

دوایی دەفەرموێت :

﴿وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنْ أَصْحَـٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩٠﴾ فَسَلَـٰمٌ لَّكَ مِنْ أَصْحَـٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩١﴾﴾.

بەلآم لە شوێن ڕێگەی (سابقین) کە (سابقین) ڕێگە ڕۆشن دەکەنەوە (اصحاب الیمین) بە شوێن ڕێگەی ئەوان دەڕۆن.

جا کە مردن مەلائیکەت سەلامیان پێ دەگەیەنن دەڵێن براکانتان (اصحاب الیمین) سەلامتان لێ دەکەن.

دوایی دەفەرموێت :

﴿وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٩٢﴾ فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٩٣﴾ وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ ﴿٩٤﴾﴾.

ئەوانە کەوا کافرن وەختێك دەمرن میوانیەکیان بۆ ئامادە کراوە لە ئاوی داغ و گڕ و ئاگرەوە.

لە هیچ حەدیسێك (صحیح مرفوع) یانی نیسبەت دراوە بەلای پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام وە هەتا لەلای صەحابەش (موقوف) لەسەر ئەوە نیە تەڵقین بەم شێوەیەی ئێستا کرابێت.

بەڵام جار جارە پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام چووەتە سەر قەبرێك و شتێکی فەرمووە بۆ ئەوەی ئەوانەی لەوێن سودی لێ وەرگرن یان دوعای خێری بۆ مردوەکە کردبێت.

ئا بەم شێوە رۆشن بۆوە ئەوەی کەوا مردووە یان دەمرێت گوێی لێ نابێت چ جای ئەوەی هاواری بۆ بکرێتت.

جا ئەوەی هاواری بۆ دەکرێ ئایا دەتوانێت بێت بە هاواری :

خودای گەورە لە سورەتی فاطر ئایەتی ١٣-١٤دا دەفەرموێت:

﴿وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ﴾.

قِطْمِيرٍ: ئەو پەلکە تەنکەی خورما

ئەوانەی ئێوە هاواریان لێ دەکەن لە غەیری خودا ئەوانە قطمیر یان بە دەست نیە.

دەسەڵاتیان نیە بە قەد قطمیر نەفع بگەیەنن.

رەنگە کەسانێك بڵێن ئەمە خطابە بۆ بتەکانی موشرکەکان، بەڵام قاعیدەیەك هەیە لە علومی شەرعی ئەوانەی مقدارێك ئاگایان لە علومی شەرعی بێت دەبێت ئەم

قاعیدەیە بزانێت، سەبەب نزولی ئایەتێك تایبەت بەوە نیە کە بڵێی تایبەت بەم مەوردەیەو رەبتی بە مەوردی تر نیە. چونکە ئەگەر وا بێت قورئان دەبا هەر بۆ ئەو عەسرە بوایەو بۆ عەسری تر نەدەبوو.

بە تەعبیری علماء:

خصوصیەتی سەبەب تخصیصی ئایەتی نازل بوو ناکات. یانی سەبەبی دابەزینی ئایەتێك تایبەتمەند نیە بەس بەو سەبەبە.

لێرە (الذین) دەفەرموێت بۆ (جمعی مذکر) ە هەتا دەبیّ بۆ (جمع مذکر) ی عاقل بەکار بێریّ.

بۆ نمونە / بۆ جەمعی پیاو بڵێین (الذین قعدو) یان (الذین جائوا) ئەوە بۆ بتەکان قورئان لە جێگای تر بەم شێوە تەعبیریان لێدەداتەوە

- ضمیري مفردی مؤنث – ها
- ضمیري مفردی مؤنث ی منفصل – هی
- ضمیري مفردی مؤنث ی منفصل – هن

﴿إِنْ هِيَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ﴾.

بەڵام لێرە بۆ بە (الذین) تەعبیر لێدەکات بۆ ئەوەی (خاص) تایبەت نەبێت بەم مەوردەوە.

جا هەر کەسێك لە هەر زەمانێك هاوار بۆ هەر شتێك بکات غەیری خودا ئەمە دەیگرێتەوە.

لە پێشدا فەرمووی : ﴿وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ﴾. لە رۆژی قیامەت ئەوانەی هاوارتان بۆ کردوون ئینکاری ئەم شرکەدەکەن.

هەروەها خودای گەورە دەفەرموێتت:

پێغەمبەران علیهم السلام و پیاوچاکان خودای گەورە محاسەبەیان دەکات: ئەرێ ئێوە بوون بەندەکانی منتان گومڕا کرد یان خۆیان گومڕا بوون هاواریان لەبەر ئێوە دەکرد.

پێغەمبەران علیهم السلام و پیاوچاکانیش تەبرئەی خۆیان دەکەن کە ئێمە نەبووین، بەڵکو خۆیان ئەم کارەیان کردووە ئێمە ئاگادار نین.

ڕەنگە بە حدودی (٥٠٠) ئایەت لە قورئان هاوار کردن لە غەیری خودا بە شرك دادەنێت، ئەو ئایەتانەی دوعا و موشتەقاتی دوعای تێدایە وە ئەو ئایەتانەی باسی ئەوە دەکات کە غەیری خودا (جلبی نفع) و دفعی ضرر) پێدانی چاکە و خۆشی و لادانی خراپە و ناخۆشی بەدەستی نیە.

## (كەس غەیری خودا غەیب دەزانێت غەیری ئەوانەی هاواریان لێ دەكرێت وەك پێغەمبەران علیهم السلام و پیاوچاكان؟)

مەسئەلەی زانینی غەیب رەبتی بە ئینسان بوون و ئینسان نەبوونەوە هەیە.

ئەگەر ئینسان هەرچی غەیبە بیزانیبا مانای ئەوەیە ئینسان نەبوو چونكە ئینسان بە دوو شت ئینسانە

١- علم ٢-ارادە.

١-علم هەوڵدان بۆ زانین.

٢-ارادە هەڵبژاردنی رێگە.

ئینسان بەوە ئینسانە كە نەزانێت لەحزەیەك دوای ئێستا چی دەبێ چونكە ئەگەر زانی عومری چەندە وە زانی سبە و ساڵی تر چی دەبێت، كەوا بوو ئەمە ئینسان نیە، چونكە ئیرادەی نیە. كەوابوو بۆچی خۆی ماندوو بكات .

بەڵام خودای گەورە ئینسانی بۆ ئەوە دروست كردووە كە نەزانێت لەحزەیەك دوای خۆی چی روو دەدات وە (علم و ئیرادەی) پێداوە بۆ ئەوەی دەركی شتەكان بكات.

بۆ ئەوەی ئیرادەی هەبێت وەختێك شتێك ئەنجام دەدات لەو زەمینە دوو دانە احتمال ی ٥٠٪ مەترەح دەبێت.

ئەمە لە چارەی نووسراوە نوێژ دەكات ئیتر نوێژ دەكات ئەمە لە چارەی نووسراوە نوێژ ناكات ئیتر نوێژ ناكات، ئەمە لە چارەی نووسراوە (قتل) دەكات ئەمەش نووسراوە نایكات.

لەم زەمینەدا دەبێت (ابتلاء) ئیمتحـان هـەبێت وە علمـی بـەکار بـێنیٚ بـۆ ئـەوە کامیان باشە وە بە ارادە باشەکەیان هەڵبژێریٚ بـۆ ئـەوەی ئـیرادەی پـارێزراو بێـت، دەبێت لە لەحزەی دوای خۆی هیچ نەزانێت.

هەڵبەتە هەموو شتێك خودای گەورە موقەدەری کردووە هـەتا ئەوانـەی ئینـسان بە (ارادە) ی خۆی ئەنجامی دەدات.

ئەمە بەهانە نیە، چونکە کەسێك بڵیٚ قەتلم کرد ئەوە بۆم رۆشن بـۆوە قەتلەکـە موقەدەر بووە لەلایەن خوداوە ئەمە کەی بەهانەیە.

لێرە خودای گەورە رێگەی چاکە و خراپەی بۆ رۆشن کردیەوە و علم و ئـیرادەی پێدای بۆ ئەوەی بزانی دوای ئەوە بە ارادەی خۆت هەڵیبژێری.

بە کابرای قاتل دەڵێت دەستی خستبووە سەر ماشـەی تفەنگـە کـە لێـرەدا ٥٠٪ ئیحتمـالی کوشـتن بـووە وە ٥٠٪ ئیحتمـالی نەکوشـتن بـوو بـەڵام تـۆ کوشـتنەکەت هەڵبژارد.

وە تۆ لە تەشریع لێت داوا کرابوو کەخراپەنەکەی کوشتن نەکەی لەسەر ئەوەیـە محاسـەبەت دەکرێـت کـە خراپـەت هەڵبـژاردووە. وە تـۆ پـێش هـەر کارێـك خـودای گـەورە علمـی پـیٚ دای بـۆ ئـەوەی بزانـی وە ئـیرادەی پـیٚ دای بـۆ ئـەوەی هـەڵی بسەنگێنی کامیان باشە کامیان خراپە.

یەکێك دەیەوێت یەکێك بکوژێت تفەنگەکـەی لەسـەر رادەگرێـت بـەڵام لـەو کاتـە تفەنگەکەی کار ناکات یان بەهەر هۆیـەك کـابرا نـەجاتی دەبێـت، ئەمـە لـە قیامـەت قاتلە بەڵام لەدونیا قاتل نیە.

وەك ئەو دوو حەدیسەی دەفەرموێت

( دوو مسوڵمان شیریان لە یەك هەڵکێشا یەکێکیان یەکێکیانی کوشت )

(قاتل ومقتول فی النار) ە

بكوژ و كوژراو بۆ له ئاگردان.

پرسیاریان كرد ئەی پێغەمبەری خودا علیه الصلاة والسلام ئەوەی كوژراوە بۆچی؟ گوتی ئەویش تەمای كوشتنی هەبوو، بەڵام ئەوی دی دەست پێشخەری كردووه.

مانای هەرچی شته لای خودا جێگیره نەفی ئەوه ناكات كه ئینسان (مختار) بێت.

یانی خودای گەوره بەعزێك له كارەكانی له رێگەی موسەخەر ئەنجام دەدات، وەك ئاگری موسەخەر كردووه بۆ ئێمه كه گەرمی ببەخشێت.

وه بەعزێك له كارەكانی له رێگەی ئەسبابی ئیختیار و هەڵبژاردن و ئیراده ئەنجام دەدات.

هەرچی كارێك ئینسان دەیكات خودا نوسیویێتی، بەڵام به ئیرادەی خۆی دەیكات.

جا لێرەدا گشت ئینسانەكاتن به پێغەمبەران و علیهم السلام و پیاوچاكان هیچ شتێك له غەیبیان نەزانیوه.( تەنیا پێغەمبەران علیهم السلام ئەوەی خودای گەوره به شێوەی وەحیی پێی گوتوون )

بەڵام مەحدوده یەك غەیب بزانین ئەویش به هۆی قورئانەوه. وەك بەهەشت و دۆزەخ و ئاوی كەوسەر و ئیتر ئەوەی له قورئان بەیان كراوه.

خودای گەوره له سورەتی (نمل) ئایەتی ٦٥ به پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام دەفەرموێتت: بڵێ هەرچی شته له ئاسمان و زەوی له مەلائیكەت و پێغەمبەران و علیهم السلام پیاوچاكان و جن هیچ له غەیب نازانن له غەیری خودا وه تەنیا غەیبێك نازانن كه پەیوەندی به خۆیان بێت، بەڵكو شعوریان نیه كه كەی زیندوو دەكرێنەوه.

شعور گوتمان بۆ دەرکی مەسائیلی زۆر باریك دەقیق و ورد.

لەم قاعیدە گشتییە تەنها یەك (استثناء) جیا کەرەوەیەك کراوە بۆ ئینسان لە ئاخیری سورەتی جن.

﴿عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ۝٢٦ إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُۥ يَسْلُكُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ رَصَدًا ۝٢٧ لِّيَعْلَمَ أَن قَدْ أَبْلَغُوا۟ رِسَـٰلَـٰتِ رَبِّهِمْ﴾ (الجـــــن: ٢٦ـ٢٨).

يُظْهِر لە (ظهر)وە هاتوە، واتە: پشت تایبەتە سەر غەیب.

ظهر دەری ئاخات.

خودا زانای غەیبە هیچ کەسێك غەیری خودا نە لە پێغەمبەران و علیهم السلام نە لە پیاوچاکان و نە مەلائیکەت و نە جن ئاگای لە غـەیبی خـۆی نیـە مەگـەر کەسـێك پێی بزانێت ئەویش کـە خـۆی پێـی خـۆش بێـت وەکـو (رسـول) رەسـول کـێ یـە ؟ مەلائیکەتە هەروەکو لە سـورەتی (تکـویر) دەفـەرموێت: ﴿إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ۝١٩ ذِى قُوَّةٍ عِندَ ذِى ٱلْعَرْشِ مَكِينٍ ۝٢٠﴾.

خودای گەورە خۆی غەیبی پێدەدات ئەویش بۆ ئەوەی غەیبەکە بپارێزێت.

هەروەها لە سورەتی (فاطر) دەفەرموێت: خودای گەورە لە مەلائیکەت رەسولی بۆ قەرار داون رێگا پاك دەکەنەوە ﴿تَنَزَّلُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا﴾.

روح : وحی – ژیان – قورئان

هەروەها مەلائیکەتی لەگەڵ بـۆ ئـەوەی رێگـا پـاك بکەنـەوە لـە کـاتی دابـەزینی وەحی

﴿لِّيَعْلَمَ أَن قَدْ أَبْلَغُوا۟ رِسَـٰلَـٰتِ رَبِّهِمْ﴾.

لێرە تایبەت دەبێت ﴿رِسَٰلَٰتِ رَبِّهِمۡ﴾ بەعنی شتێك كە ئینسان دەبێت بیزانێت لە غەیب، ئەویش تەنها ئەو غەیبانەی (قورئان – زبور – تورات – انجیل ) بەیانی دەكەن.

غەیری ئەوانە هیچ كەس هیچ شتێكی تر نازانێت لە غەیب.

كەواتە : پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام هیچ شتێكی لە غەیب نەزانیوە تەنها ئەوەی لە قورئان بۆی بەیان كراوە وە بەعزێكی تریش لە رێگەی ترەوە خودا ی گەورە بۆی روون كردۆتەوە و بەیانی كردووە.

بۆ نمونە / خودای گەورە لە قورئان باسی نزیك بوونەوەی قیامەت دەكات، بەڵام پێغەمبەر باسی نیشانەكاتنی قیامەت دەكات.

ئایا پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام ئەم نیشانانەی باسی كردووە تەنیا لە غەیب بۆخۆی زانیوێتی؟ نەخێر ئەمەش خودای گەورە بە شێوەیەكی دی بۆی بەیان كردووە.

بۆ نمونە / كاتێك موشركەكان پرسیاری (ذي القرنين) یان لە پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام كرد، ئەویش فەرموی: سبەی وەڵامتان دەدەمەوە.

ئەگەر غەیبی بزانیبا هەر ئەو دەم وەڵامی دەدانەوە، بەڵام چاوەڕێی وەحی خودای گەورەی كرد تا جوابیان بداتەوە.

هەروەكو خودای گەورە دەفەرموێتت :

﴿قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ﴾ (اعراف ١٨٨).

ئەی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام پێیان بڵێ من هەتا هیچم دەربارەی خۆم بەدەست نیە لە چاكەو لە خراپە جگە لەوەی خودا ویستی لەسەرە.

﴿وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ﴾.

ئەگەر من غەیبم بزانیبا ئەوا دەست پێشخەریم دەکرد لە خێرداو هیچ زیانێك توشم نەدەبو.

﴿إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾.

من تەنها ئاگادار کەرەوە و موژدە دەرم ئەویش بۆ کەسانێك ئیمان دێنن.

کەوابوو خەبەری غەیبی کە پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام باسی کردووە بەشێکی لە قورئان بۆی بەیان کراوە وە بەشێکی تریشی لە ڕێگەی ترەوە خودا ی گەورە بۆی بەیان کردووە.. غەیری بۆمان هیچی لە غەیب نەزانیوە.

وە لەسەر ئەم ئەساسە هاوار کردن لە غەیری خودا کە غەیب نازانن وە غەیبیش نە پێغەمبەران علیهم السلام نە مەلائیکەت و نە پیاو چاك نازانن.

لە نەتیجە ئاگایان لەوە نیە کە کەسێك هاواریان لەبەر دەکات وەك ئایەتی (٥) ی سورەتی احقاف باسمان کرد.

لێرە بەعزێك ئاخری سورەتی لوقمان دەکەن بە دەلیل دەڵێن (٥) شت لە غەیب تەنها خودا دەیزانێ بەڵام باقی ئەم (٥) شتە دەکرێت خەڵکێك بیزانن.. کە لە ئایەتەکە تێناگەن و (اشتباه ) دەکەن.

خودای گەورە دەفەرموێتت

یەکەم ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ﴾.

عندە : (حصر) بە شێوەی (منحصر) باس دەکات کە تەنیا خودایە زانستی ڕۆژی دوایی لایە هیچ کەس نازانێت، ئەمە یەکەم.

دووم : ﴿وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ ﴾.

(غیث) یانی (غوث) واتا فەریاد ڕەس – بە هانا گەیشتن واتا کەسێك خراپە و ناخۆشی لادا و چاکەو خۆشی ببەخشێ واتا غەیری خودا هیچ کەس (غوث) نیە.

ينزل الغيث : باران به هانايان دێت له نەبوونی ئاوو وشکانی رزگاریان دەکات ( ئەمە خودا دەیبارێنێ)

جا لێره که دەفەرموێت ﴿وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ﴾.

نافەرموێ (يعلم وقت نزول الغيث).

له نەتيجه ﴿وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ﴾ عەمەله علم نیه باسی علم ناکات.

چونکه به پێی زانستی سەردەم که زۆر جار دەزانن کاتی باران بارین ( ئەمەش خودا رێی پێ داوه چونکه له رێگەی زانسته نەك بلێت غەیب دەزانم )

جا لێره يەكێك لەو (٥) شته كەوت، كه دەلێن تەنها ئەم (٥) شته خودا دەيزانێت.

سێيەم : ﴿وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ﴾ دەزانێ ئەوەی له ناو رەحم دايه چی يه لێرەش نەيفەرمووه (لا يعلم ما فى الارحام الا هو ) چونکه لێرەش باسی علم دەکات باسی غەيب ناكات. وه يان حصری نەکردووه بلێ (عنده ما فى الارحام) ئەگەر حەصری کردبا هيچ كەسێك نەيدەزانی چی له ناو رەحم دايه. بەلام رێگەی پێداوه .

بەهۆی پێشكەوتنی زانست ئێستا به هۆی سۆنار دەزانن چی له ناو رەحم دايه كوره يان كچه (ئەمەش حەرام نيه چونكه به هۆی زانستی ئەم كاره دەكرێت نەك به هۆی ئەوەی بلێ غەيب دەزانم )

جا لێره دوويان لەم ٥ شته كەوت كه دەلێن بەس ئەم (٥) شته غەيبه.

چوارەم و پێنجەم ﴿وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ﴾.

وه هيچ كەسێك نازانێ بەيانی چی لێدێ و هيچ كەس نازانێ له چ زەويەك دەمرێت.

ئەم دووە (خاص) هی خوایە

﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ بەڕاستی خودا زانا و خەبەر دارە بە هەموو شتێك.

کەوابوو لەو (٥) شتەی ئەوان باسیان کرد (٣) غەیب بوون (٢) یان غەیب نەبوون. لەمانیش هیچ دەلیلێك هیچ نیشانەیەکیان نیە کە هیچ کەسێك غەیب بزانێت.

کەوا بوو لە نەتیجەی کۆتایی بە قەراری قەتعی هیچ کەس غەیب نازانێ.

حەدیسێك ریوایەت کراوە بەم عیبارەتە

(مفاتح الغيب خمسة)

کە دەڵێت بنچینەکاتنی غەیب (٥) شتن

هەتا بەلای هەندێك وا تێ دەگەن ئەم حەدیسە (صحیح)ە جواب دەدرێتنەوە لەو ئیشتیباهەی کردوویانە کە علمی غەیبیان لەم (٥) شتە (منحصر) کردووە.

لەلای عولەمای (اصولی فقە) مەشهورە کە عەدەد تێگەیشتنی مخالەفە نیە.

بۆ نمونە / یەکێك دەلێت لەم ماڵە چوار نەفەر هەن شەرت نیە چوار نەفەر بن لەوانەیە ئەو وای پێ چاك بێت بڵێت (٤) چوار نەفەر هەن وەك ئەوە نیە حصری بکات.

بڵێ لەو ماڵە چوار نەفەر زیاتری نیە.

وە قاعیدەیەك هەیە بۆ بەیانی تێگەیشتنی گشتی بۆ ئەوە باش جێگیربن لە زهندا.

بەرزترین کەس ئەوەی تێگەیشتنە گشتی یەکە (مفهوم کلی) بەسەریان باس دەکرێت جا دوایی تەعمیمی بدات بەسەر کەسانێك کە ئەم تێگەیشتنە گشتیە (مفهوم کلی) دەیانگرێتەوە.

بۆ نمونه / له تەفسیری ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ ڕیوایەت کراوه کە (مغضوب) جولەکەن

وه (ضالین) دیانن.

له حالێك له سائری قورئان هیچ نیشانەیەك دەرناکەوێت کە(مغضوب) تەنها جولەکه بن وه (ضالین) تەنها دیان بن.وه گومراهی هەتا سیفەتێکه بۆ ئەوانەی (مغضوب علیهم) ن باشتر سابت دەبێت.

بەڵام بۆچی له (حدیث) ئاوا بەیان کراوه کە ( مغضوب ) جولەکەن وه (ضالین) دیانن. بۆ ئەوەی تێگەیشتنی گشتی بدات کە ئەگەر کەسانێك وەك جولەکە و دیان بکات ئەوا وەکو ئەوان (ضال) و (مغضوب) ن.

جا له قورئان نایەت یەکە یەکە ئەوانەی (مغضوب) و (ضال) ن ناویان بێنێت، بەڵکو دێت دیارترینیان هەڵدەبژێرێ ناوی دێنێ وەك ئەوەی وەك ئەو وا بێت، ئاوا ئەویش ئاوایه، وەك ئەوەی وەك جولەکە بێت (مغضوب) ە ئەوەی وەك دیان بێت (ضال)ە.

بۆ نمونه / له قورئان باسی فیرعەون دەکات کاتێك باسی طاغوت دەکات خۆ طاغوتی تر زۆرن، بەڵام بارزیان هەڵدەبژێرێ دەکرێ بە نمونه.

وه هەروەها خودای گەورە کاتێك باسی بەسەرهاتی پێغەمبەران علیهم السلام دەکات بە (انباء الغیب) ناو براوه وه زۆریش تەئکید کراوه کە غەیری ڕێگەی وەحی ئیمکانی پەیاکردنی بۆمان نەبووه.

وه هەروەها دوای یەکێك لەو (قصص) انە دەفەرموێت ﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ ﴾.

وه ئەمە له هیچ کام لەم (٥) شتە نیە.

بۆ نمونە / لە سورەتی قصص دەربارەی موسی علیە السلام دەفەرموێت: تۆ لە مەدیەن جێگیر نەبووی تۆ لە جانبی غەربی طور نەبووی.

بۆ نمونە / دەربارەی (مریەم) دەفەرموێت: تۆ لەوێ نەبووی کاتێ قورعەکەیان کرد کام لەمانە دەبێت بە کەفیلی (مریم).

بەیان دەکات ئەگەر هۆی گوزەشتە نەقڵەکەی دابڕاو بوو دەستی بە دەستی دەم بە دەم نەگەیشتە دەستی گوێگر، بەڵکو لە دوای دابڕانێك بە شێوەی نادیار دەرهێنرابوو دووبارە باسکراوە ئەمە شتێکی غەیبە، تەنها کەسێك عالم بە غەیب بێت دەتوانێت ئەمە باس بکات.

تەنیا بە شێوەی (رسال) ەت بۆ پێغەمبەران علیهم السلام.

ئەمەش جواب بەلای ئەوانەوە کە حەدیسە کە بە (صحیح) دەزانن لە هیچ کامیان دەلیلێك نیە کە غەیب جگە لەم (٥) شتە بن.

بزانین غەیب چیە ؟

مصدر غیب : غاب – یغیب پەنها بوون ، وەك خۆر ئاوا دەبێت پەنهان دەبێت وەك (غابة الشمس)

ئەمجارە وشەی (غیب) کە مصدرە بەکار براوە بە مەعنای (اسم فاعل ) یەعنی شتێك کە غائب بێت یەعنی (مغیب عنه) یەکیشی هەیە کە شتەکە لەو (غائب) بووە ئەوە چی یە کە ئەو شتەی لێ غائب دەبێ.

بۆ نمونە / مەلائیکەیەك بە نیسبەتی بەشەر غەیبە لە بەعزێك لاوە ئێمە علمی پێ پەیا دەکەین غەیب بوونی شتێك لە شتەکان مانای ئەوە نیە کە بە تەواوی لە مرۆڤ پەنهان بووە.

ئینسان بۆ بە دەست هێنانی علم سێ رێگەی هەیە :

١–سمع (گوێ)   ٢–بصر (چاو)   ٣–قلب (دڵ)

١-سمع : كاری ئەوەیە کە شتێك خۆی ناتوانێ کەسپی بکات، ئەبێ لە کەسێکی ترەوە گوێی لێ بێت، بۆ ئەوەی تێی بگات.

٢-بصر (چاو) : ئەمە تەماشای ئەم دونیایە دەکات، کەچی دەتوانێت بە چاو بیان بینێت، زانیاریەك لە بارەیانەوە وەردەگرێت.

٣-قلب (دڵ) : دوای ئەوە (استدلال) بەو زانیاریانە دەکات کە بە چاو وەریانی گردووە، بۆ (عالم ماوراء شهادة) بۆ ئەوەی بە چاو نابینرێ.

(استدلال) لە پێشدا باسمان کرد مانای چی یە

وەختێك شتێك لە چوارچێوەی بینینی چاودا نەبوو پێی دەڵێن ئەمە (غیب) ە ئەگەر لە چوارچێوەی بینینی چاودا بوو پێی دەڵێن (شهادە) واتا ئەوەی بەچاو دەبینرێ.

بۆمان بە نسبەتی بەشەر و نمونەی بەشەر (غیب) ە وە بۆ خودا (غیب ) و شهادە) مەترەح نیە.

کە دەفەرموێت :

عالم الغیب والشهادە) یانی ئەوە بە نیسبەتی ئێوەوە غەیبە.

غەیب دەبێتە دوو بەش:

١-غیب مطلق.

٢-غیب نسبی.

١- غیب مطلق: عبارەتە لە شتێك زاتەن ئمکانی زانیاری لەوانە لە رێگەی چاوەوە بۆ ئینسان نیە. یانی بۆمان لە رێگەی چاوەوە نابیندرێتن.

هەر مەوجودێك بە نیسبەت چاوی ئینسان لەوانە نەبوو کە رەنگێکی پێ ببینرێ دیارە ئیتر توانای چاو ناتوانێ لەسەری کار بکات. وەك مەلائیکەت و جن.

پەیوەندی بە کات و شوێن نیە.(زمان و مکان)

بۆ نمونە / ئەمڕۆ مەلائیکەتێك لێرە نیە بەیانی دێتە ئێرە هیچ فەرق ناكات لە هەر كام لەم حاڵەتانە ئینسان بەم شتە لە ڕێگەی چاوەوە نازانێ، تەنها ڕێگەی ئەوەیە كە لە هەندێك لە غەیبیاتەكە زانیاری چاو بكاتە استدلال بۆ زانیاری بۆمان لە بەعزێك لاوە وە لە بەعزێكیش لەم زانیاریە غەیبیانە لە ڕێگەی گوێ وە زانیاری وەرگرێ.

٢-غیب نسبی : یەعنی شوێن و زەمان (زمان ومكان) دەبنە پەردە لە بەینی ئەوان و ئینسان كە ئەگەر ئەو پەردەیە لا ببرێ شتەكە لە ڕێگەی چاو و گوێ ئەكرێت زانیاری لە بارەیەوە وەربگیرێ.

بۆ نمونە / ئەو ڕووداوەی پەیوەندی بە نوح علیە السلام و قەومەكەی بەلام قورئان ناوی دەنێ غەیب لە حاڵێكدا ڕووداوێك ڕوویداوە خەڵكێك حازر بوون توانای چاویان هەبووە یانی ڕووداوەكەیان بینیوە، بەلام چونكە زەمان گوزەراوەو هەواڵی متەواتری ئەم سەر گوزەشتە دابڕاوە، بەلام ئێستا باس دەكرێت لەبەر ئەوە پێی دەڵێن غەیب.

هەروا بۆ ئاینده نازانێ بەیانی چ دەبینێ چی گوێ لێ دەبێ.

﴿وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا﴾ ئەمە لە ڕووی زەمان

بەلام لە ڕووی شوێنەوە (مكان) بەعزێك ڕووداو هەن كە ئەگەر ئینسان لایان بێت بە وەسیلەی بە هۆی (بصر) چاو زانستی پێ پەیا دەكات، بەلام لەبەر سنوردار بوونی ئینسان ڕێگری شوێن دەبن.

بۆ نمونە / لە مەوردی ئەسراری بەینی ژن و مێرد لە ئایەتی ٢٤ سورەتی نساء وشەی غەیب بەكار دێت.

دەفەرموێت ژنانی شایستە ئەوانەن (قانتات) بن یەك دوو (حافظات للغیب) بن یانی ئەسرار و شتێك كە لە بەینی خۆی و شوەكانیان كەس نایزانێ ئەوان دەیپارێزن دەری نابرن.

دەی بۆ ئەم ژن و شووە هیچ شتێكی غەیب نیە، بەلاّم بۆ كەسانێكی تر حاجزی شوێن (مكان) بووە هۆی بوونی، بەلاّم نە بە غەیب.

جا ئەوەی غەیبی (مطلق) كاری بە شوێن و كات نیە هەمیشە ئینسان لە رێگەی چاوەوە ناتوانێت دەركیان بكات.

مەگەر یان لە رێگەی گوێ وە زانیارییەك لە بارەیانەوە وەربگرێت یان ئایەتێكی بە چاو ببینیێ بۆ دەركی بەشێك لەم شتانە.

ئەوانەی غەیبی نسبین ئەكرێت وەختێك رێگرە شوێنیەكە (مانع مكان) یان رێگرەكاتیەكە (مانع زمان) نەمان ئینسان پێیان بگات لە رێگەی ترەوە دەكرێ (شبیهی عیلم) بەوانە بزانێت.

(شبیه علم : مەسئەلەی (مكاشفات ) لەناو ئەهلی تەریقەت دا هەروەها نزیكی ئەمە لە ناو ئەهلی (ریازەت )دا وە لە ئایینە غەیرە ئیسلامی یەكان مەسەلەی (هیپنۆتیزم ) ی زەمان شتانی تریش لەم قەبیلە هەروەها شتێك لە ئایندە پێی بگات. )

بۆمان (زاهیر) لە سەرەوە خەڵك وا دەزانن علم بە غەیبیان هەیە چونكە ئەوان وا نیشان دەدەن.

بۆ نمونە / لە (هیپنوتیزم) كابرایەك دەكرێتە خەوو دەچێت لە شاریكی تر زانیاریەك دێنێ یان دەنێردرێ بو ئایندە زانیاریەك دێنێ یان بو رابردو دەنێردرێ

هەروەها لە ئەهلی تەریقەت ئەوان بە ناوێکی تر دەیلێن (مکاشفه)

هەندێك شت لە غەیبی نسبیان دیارە دەرك كردووە.

گرنگترین شت ئەكرێ مەلاحەزە بكرێت لەمانە لە هیچ كامیان (علم) زانست نین زانستی بە مەعنای ١٠٠٪ زانستی ئینسانە.

ئەمە پەیوەندی بە رۆحە جا رۆح عالەمێكی زۆر گەورەیە یەكێك بە تەواوی لە حەقیقەتی دین نەزانێ لەم رووەوە معامەلە بكات تووشی زۆر كێشە دەبێت.

وە هەر ئەم مەسەلەی هیپنۆتیزمە هیچ پەیوەندی بە دین نیە. ئەم كەسانەی كاریان بە مكاشفە بووە لە حالێكدا لەبەر ئەوە قوەتی رۆحی خۆیان (متمركز) كردووە لەسەر شتێك، لەبەر ئەوە تەواو غەرق بوون لەم عالەمە گومانێك كەوتۆتە دڵیان (اطمئنان)یان پێ پەیا كردووە لەبەر گوێ نەدانیان بە راستی دین ئەوان (قاطعا) بەیانیان كردووە.

جا ئینكاری ئەوە ناكرێت كەسانێك لە ئەهلی تەقوا خەفای رۆحیان بگاتە سنورێك جار جار شتێك بكەوێتە دڵیان لە شێوەی (الهام)، بەڵام ئەم شتە بە شێوەی گومانە چونكە ئێمە عەقیدەمان وایە كە هیچ كەس غەیب نازانێت غەیری خودا، بەڵام ئەو كەسە حەقی ئەوەی نیە شتێك دێتە ناو دڵیان خەتەرەیەك دێتە دڵیان یەكسەر بەیانی بكات. چونكە ئەم خەتەرەیە لە دڵی زۆر كەس هەیە.

بۆ نمونە / لە كەسانی سادە جار وایە یەكێك دانیشتوە بیری خزمێكی دەكات لە ناكاو خزمەكەی دێتە ژوورەوە. یان لە رێگا دەڕوات لە دڵیا دەڵێت بریا ئێستا فلانم لەگەڵ بووایە لە ناكاو فلان لە بەرامبەری پەیا دەبێت ئەمە شتێكی سادەیە.

بۆمان خاتراتێكن بە شێوەی (شعاع) ی (نوری) لە بەینیان دێت (تماس) ێك پێكدادانێك لە بەینی دڵی یەكێكەوە بە دڵی یەكێكی تر روو دەدات.

زیاتر ئەو کەسانەی لە پلەی بەرزی تەقوان خۆشەویستی دونیایـان لـە دلّدا نیـە زیاتر شتی وا دێت بە دلّیاندا، بەلاّم ئەم خەتەراتە یەقین نین، ئەمە لە رووی راسـتی شتەکەوە.

بـەلاّم ئیعتیبـاری لای خـودا و لـە شـەریعەتدا ئـاوا شـتێك تـەنیا بـە شـێوەی دلّخۆشکەر دروستە لە لای خودا.

١-یانی هەر ئەوەندە ئەو کەسە بلّێت رەنگە ئاوا بێت دلّخۆشکەر بێت.

٢-هیچ حوکمێك لەسەری نادرێتت، بـۆ نمونـە بلّێـی شـتێك حـەرام دەکـات یـان حەلاّلّ دەکات.

هەروەها لە مەوردی خەون حـەدیس هەیـە نـاوی نـاوە (مبـشرە) (رۆیـا) خـەون موژدە دەرە دلّخۆش کەرە یانی ئینسان لە رێگەی خەوە وە (تماس) دەکات لەگـەلّ کەسێك یان لەگەلّ مـردوو تـەنها حـەقی ئەوەیـە دلّـی خۆشـبکات، حـوکم دەر نـین، ئـەویش لـە سـنورێك نەگاتـە (جـزم ) و (قطـع) دان بـە ئـەم شـتە فەقـەت گومانێـك دروست بکات.

ئەمەش جوابێك بۆ ئەوانەی دەلّـێن ئـەهلی تەسـەوف لـە رێگـەی (مکاشـف)ەوە شت دەزانن ئەمە زانین نیە.

بەم شێوەیە رۆشن بۆوە کە شتێك تەنیا ئینسان زانستی غەیبی پیّ پـەیا بکـات ١٠٠٪ ئەویش (رسالات)ە واتا (قورئان)

قورئان باسی برێك شتی غەیب دەکات یەقینمان هەیە کە بۆمـان هـەن بـەلاّم بـە چاو نایان بینین.

بەلاّم لێرە جیاوازی لە بەینی کەسەکان هەیە بە پێی تێگەیشتنی (فهم) بـۆ ئـەم (رسالة).

خودای گەورە لە سورەتی فرقان دەفەرموێت:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانًا ﴾.

ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ئەگەر ئێوە لە خوابترسنو تەقوای خوا بکەن ئەوا شتێکی واتان پێ دەدات کە جیاوازی لە نێوان راستو چەوتدا بکەن.

ئەمە لەبارەی غەیب (منحصر) بوونی بۆ خودا کە تەنیاو تەنیا خودا غەیب دەزانێت، بێجگە لەوەی خودا خۆی بەیانی کردووە لە ڕێگەی (رسالات).

## شەفاعەت

شەفاعەت چ لە دونیا چ لە ئاخرەت (قیامەت)

لە چەند رێگەوە باسی شەفاعەت دەکەین.

١- مانای شەفاعەت.

٢- بەکار هێنانی وشەی شەفاعەت لە ناو خەڵکیدا.

٣- نەفی کردنی شەفیع بە (مطلق) ی.

٤- شەفاعەت لە غەیری خودا نەفی یە.

٥- تەوزیعاتێك ئایا لە قیامەت رێگا دراوە بەکەس شەفاعەت بکات.

١-شفاعەت - شفع شتێك بدرێت بە پاڵ شتێك.

یانی درانی کەسێك بە پاڵ کەسێکی تر بۆ تەئیدی ئەو کەسە.

بۆ نمونە / لە ئایەتی ٨٥ ی سورەتی نساءدا وشەی شەفاعەت بەکار هاتوە بۆ یارمەتیدان لە بەینی خەڵکی.

﴿ مَّن يَشْفَعْ شَفَاعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٌ مِّنْهَا ۖ وَمَن يَشْفَعْ شَفَاعَةً سَيِّئَةً يَكُن لَّهُۥ كِفْلٌ مِّنْهَا ﴾

یانی هەر کەس هاوکاری کەسێکی تر بکات لە کاری خێر پشتی بگرێت ئەویش بەشێك لە ئەجری ئەم کارەی بۆ دەنووسرێ وە هەر کەسێك پشتی کەسێك بگرێ لە کاری خراپ ئەویش بەشێکی تەواوی هەیە لە پاداشتی ئەم کارە.

لەم ئایەتە وشەی شەفاعەت هەم بە شێوەی مصدر هاتووە (شفاعة) وەهەم بە شێوەی مضارع هاتووە (یشفع) ئەمە بۆ مانای وشەی شەفاعەت لە لوغەت کە گوتمان یانی کەسێك پشتی کەسێك بگرێت لە هەر کارێك.

جا ئـەم شـەفاعەتە لـەم رووەوە پەیوەنـدی هەیـە بـە عەقیـدە، یـانی ئەوانـەی دەیانەوێ شەفیع قەرار بدەن بۆ خۆیان هەم لە دونیا قەرار بدەن هـەم لـە ئـاخرەت ناوبردنی ئەم کارەش بە شرك لە قورئان لە قەڵەم دراوە.

چ کەسێك لە دونیـا شـەفیع بـۆ خـۆی قـەرار بـدات بـەو جۆرەی قورئـان روونـی کردۆتەوە وە چ لە قیامەت بۆ خۆی قەرار بدا هەردوو شێوەکەی قورئـان مـەحکومی کردووە و بە شرك داناوە.بەوجۆرە مەعنا لوغەویەی وشـەی شـەفاعەت بـۆ ئـەوەی ئینسان یەکێکی تر بکات بە تکا کاری. لە لایەکی تریـشەوە کـە خـودا بـۆ ئـیرادەی ئەم جیهانە سونەت و یاسایەکی داناوە حاکمی کـردووە کـە تـەواوی مـەخلوقات بـە کافر و مسوڵمان گشتی دەیانگرێتەوە. لێرە (استثناء) لە هیچ کەسێك نیە.

بۆ نمونە / بەشێك لە مەوجودات بە ئاگر دەسووتێن چ مسوڵمان چ کافر بە جیـا کردنەوە حاڵەتێکی تایبەت وەك لە زەمینەی نەجاتی (ابـراهیم) (علیـه الـسلام) جـا سونەن و یاساکانی بە (استثناء) بۆ شتێك. سەرەوە حاکم )ە.

لێرەدا هیچ شتێك غەیری خودا ناتوانێت شتێك یا کەسێك (استثناء) بکات.

بۆ نمونە / لە کاتی ئاگر ئینسان دەبێ خۆی لە ئاگر بپارێزێ ئەگینا دەسـووتێ. هەر کەسێك باوەڕی وا بێت بە بـەکار هێنـانی فـلان شـت ئـاگر نـاتوانێ بیـسووتێنێ ئەمە شەفیعی بۆخۆی بەکار هێناوە.

بۆ نمونە / سونەتی خودا وایە هەر قەومێك لـە مەسـەلەی تەوحیـد لایـان دابێـت ئاگادار کرانەوە لەم کارەو موژدەیان درابێ ئەگەر بێنە سـەر رێـی راسـت وە (اقامـە حجە) کران وازیان نـەهێنا، ئـیتر تووشـی هیلاکـەت و لەبـەین چـوون دەبـن، لێـرەدا کەسـانێك باوەڕیـان وابێـت سـونەت و یاسـاکانی خـودا لەبـەر خـاتری کەسـانێك دەگۆڕدرێتن، ئەوە لە قورئاندا ئەم عەقیدەیە مەحکوم کراوە و رەت کراوەتـەوە بـە شرك دانراوە.

یانی لە مەوردی قیامەت سونەت و یاسای خودا وایە کە کەسێك لە دونیا کار و کردەوەی چاکی کردبیّ ئیماندار بێت وە ئەگەر گوناحێکی کردبێت تۆبەی لەسەر کردبێت ئەمە دەچێتە بەهەشت. وە هەر کەسێك لە کوفر و خراپە ژیانی دونیای گوزەراندبێت دەچێتە دۆزەخ.

لە قورئاندا ئاوا بەیان کراوە وە ئەمەش یاسایەکی نەگۆڕە، خوداش ئەم گەردوونەی لەسەر بنچینەی ڕێسا و یاسا دروست کردووە هەڕەمەکی نیە.

ئەگەر کەسێك باوەڕی وا بێت کە کەسێك هەیە لای خودا نازی دەڕواو پشتوانی ڕزگاری دەکات، ئەمە تووشی لادانی عەقیدەی گەورە بووە شتێکە قورئان لە چەند جێگە بە شێوەی جیاواز (عبارات مختلف) ڕەتی کردۆتەوە، ئاوا عەقیدەیەکی بە شیرکی گەورە داناوە (شرك الاكبر) کە بەشێکە لە شرك لە (امری تسخیری)

١-کە بەخشندەی ئامادەیی بە شتەکان تەنها خودایە وە هەر کەسێك باوەڕی وابێت کە هۆیەك تەئسیرێك لە غەیری خوداوە ئەدرێت بە شتێك لە مەخلوقات ئەمە تووشی شرکی گەورە بووە.

٢-لە دوای ئەوەی مەخلوقات تایبەتمەندی و ئامادەیی جیاکەرەوەیان پیّ بەخشرا کەوتوونەتە جوڵانەوە هەماهەنگ بوون لە بەینی یەکتر، هەر کەسێك باوەڕی وابێت کە کەسێك غەیری خودا بە شێوەیەك بەشداری دەکات وە لە ڕووی ئەوە بێت کە لەلای خودا نازی دەڕوات، ئەوە تووشی شرکی گەورە بووە (شرك الاكبر).

لەبەر ئەم جۆرە لە شرك بە درێژایی تاریخ بەر لە پیغەمبەر (نوح) علیه السلام تا پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام مللەتی جۆراو جۆر تووشی بوون، لەبەر ئەمە عەقیدەی ئینسان تێك دەدات وە ئاسارێکی خراپی زۆر گەورە دروست دەبێت لە ژیانی ئینساندا، قورئان زۆر گرنگی پیّ داوە بە شێوەی یەکێك لە شێوەکانی

گەورەی شرك ئەم عەقیدەیە بە شەفاعەت باس كردووە رەتـی كردۆتـەوە چ ئـەوەی پەیوەندی بە دونیا بێت چ ئەوەی پەیوەندی بە قیامەت بێت.

وەختێك كەسێك حاكم دەبێت بەسەر شوێنێك نیـزام و یاسـایەك دەردەكـات كـە خەڵكی پابەندی بن جا ئەم نیـزام و یاسـایە لەگـەڵ عـادات و هـەڵس و كـەوتی ئـەم خەڵكە تێكەڵ دەبێت، لێرە قورئان باسی شتێك دەكـات لـە نیزامـی جـاهیلی دەڵـێ مەیكەن بەڵام شتێكی تر لە جێی دا دەنێت.

یانی كە (اصطلاح) ێك لـە جـاهیلی بـەكار بـراوە لـە قورئانـدا زۆر لەمانـە بـەكار هاتووە بەڵام بە شێوەی رەحمانی.

بۆ نمونە / لە نیزامی سـەر زەویـدا ئەمـە هەیـە وەختێـك یاسـایەكی گـشتی دەر دەكرێ بۆ لەشكرێك ئاوا نیە یەكە بە یەكە بە كەسەكان بڵێـی بـەڵكو ئاوایـە لەسـەر ئەم سـەعاتە فـو دەكرێتـە شـەیپور گشتی حـازر دەبـن، دەی تەماشـا دەكـەین لـە قورئان مەوردی فوو تێكردن بە شـەیپور بـاس كـراوە لـە كـاتی مردنـی گـشتی و لـە كاتی زیندوو بوونەوەی رۆح و جەستەكان وە لە كاتی بانگ بۆ حیساب.

قەرار دانی شەفیع لە دادگای دونیاوی دوو شتی هەیە :

١-گەورەی دادگا علمی تەواوی نیە.

٢-ئینسان دارای هەوەسە.

بۆ نمونە / كابرایەك نا فەرمانیـەك دەكـات، دەیبەنـە دادگـا ئـەم كابرایـە ئەگـەر توانی خۆی رزگـار بكـات لـە علمـی سـنوور داری گـەورەی دادگـا یـان لـە هەوەسـی گەورەی دادگا بۆ ئەوەی شتێكی پێ بدات تا بەرائەتی بۆ دەربكات. بـەڵام هەمیـشە وا نیە ئەم ئینـسانە خـۆی بتـوانێ قـسە بكـات بۆیەئـەكرێ بـە كەسـێكی تـر پـشتی ببەستێ وەك (محامی ) پارێزەر یان واستە.

ئاوا مەسەلەی شەفیع پەیوەند بووە لەگەڵ دادگا دونیاویەکان، جا ئەم کەسە تاوانبارە ئەکرێ خۆی رزگار بکات لە حوکم بەدوو هۆ، یەکەم یان دادگا نازانێ بە تەواوی ئەم کەسە تاوانبارە ئازادی دەکات، دوەم دادگا دەزانێ تاوانبارە، بەڵام بە هۆ واستە شەفیع قەرار دەدا خۆی رزگار دەکات. وە پێچەوانەی ئەمەش هەیە کە کەسێك هیچی نەکردووە بەڵام تاوانبار کراوە، جا ئەم کەسە یەکەم دەترسێ بە هۆی نەزانینی گەورەی دادگا لەبارەی ئەوەی کە ئەوبێ تاوانە تاوانەکە بەسەر ئەودا بسەپێنرێ.

دووەم لەوە دەترسێ لە هەوەسی گەورەی دادگا کە نەوەك بە تاوانباری دابنێ لەبەر ئەمە وای کردووە ئەم کەسە یەکێك ببات بۆ ئەوەی پشتوانی لێ بکات (وکیل مدافع) لەبەر ئەمە لە ناو دونیا وەختێك وەحی دابەزی یە بەیانکراوە کە ئاوا تەسەور نەکەن کە لەلای خوداوە ئەمەش روو دەدات وا نەزانن بێ تاوان بە تاوانبار دادەنرێ تاوانبار بە بێ تاوان دادەنرێ، چونکە دادگای خودا یەکەم هەم زانستی تەواوی هەیە وە دووەم لە هەواو هەوەس بە دوورە.

لە نەتیجە هیچ کام لە تکا کار و شەفیعێك لە دادگای خودا نیە. کەوابوو ئەوانەی دڵیان خۆش کردووە بەوەی کەسێك هەیە لای خودا دەبێتە شەفیعیان ئەمە لە دادگای خودا دا نیە. وە ئەوانەی پیاوچاك بوون زاڵم نەبوون بە دڵیان فەرەح ئاوا شتێك لەلای خودا نیە.

وە کەسێك باوەڕی وابێت لە دادگای خودا دەکرێت شەفیع ببێ لە کوێ ئەمەی هێناوە کە خودا ڕێی پێ نەداوە وە ئەو کەسەی بە شەفیعی دەزانی لای خودا نازی دەڕوا لەبەر ئەوەی فڵان زۆر بە تەقوایە ئەم باوەڕە شرکە، وەکو ئەوە وایە بڵێت فڵان کوڕیخودایە نازی دەڕوات چونکە نەوەی اسرائیل وەختێك دەیانگوت:

﴿نَحۡنُ أَبۡنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ﴾.

بەو مانایە دەیانگوت کە ئێمە لای خودا نازمان دەروات نەك بەو مانایەی کە کوڕی خودان. واتا کەسێك باوەڕی وابێت بڵێت لە دادگای خودا شەفیع هەیە ئەوە وەکو ئەوەیە بڵێن خودا کوڕی هەیە.

لە ئەنجام باوەڕ بوون بە شەفاعەت بەم شێوەیە شرکی گەورەیە.

یەکەم : وەکو ئەوەیە باوەڕی وابێت خودا زانستی تەواوی نیە.

دووەم : وەکو ئەوەیە باوەڕی وابێت خودا بە هەوس حوکم دەکات وە هەر کەسێکیش ئەم باوەڕانەی هەبێت بە لادانێکی گەورە لە دین لای داوە.

وە لە رووی رەوشت و رەفتاریشەوە:

کەسێك باوەڕی وابێت کە کەسێك هەیە لای خودا پشتوانی بکات، دیارە هیچ شتێك نیە بۆ ئەوەی پابەند بێت بە بەرنامەی خودا، یانی هەرچی شتە ئەنجامی بدات لە خراپە دوای ئەوە کەسێك هەیە لای خودا بیپەڕێنێتەوە. دیارە ئەم شتە لەناو جۆرێك لە مسوڵمانان بە تایبەتی ئەوانەی پێیان دەڵێن ئەهلی تەریقەت شعرێك بە زمانی هەورامی هەیە دەیخوێننەوە، ئەوان دەڵێن کە بۆیە لە دونیا دەستم گرت بە تۆ لە سارای مەعشەر هیچ باکم نەبوو. مانای ئەوە ئیلتزام کێشە نیە دەی دیارە ئینسان ئاوا باوەڕێکی پەیا کرد دیارە لە بینشو ئیلتزام هیچی پێوە نامێنێت. بۆیە گەورەترین لادان لە دین تووشی بووە ئەویش دڵی خۆشە لای خودا شەفیعێك هەیە بۆی. ئا لەبەر ئەمە بە شێوەی جۆراو جۆر نەفی شەفیع کراوە لە دونیاو لە قیامەت یەکلا کراوەتەوە بۆ خودا هیچ کەسێکی تر ناتوانێ لەم زەمینەدا دەخاڵەت بکات.

لە هەندێك ئایات لە قورئان شەفاعەت بە تەواوی نەفی کراوە، بەڵام ئەگەر ئینسان دیقەت بدات ئەم شەفاعەتەی بە شرك دانراوە لەگەڵ ئەم شەفاعەتەی ڕێی پێدراوە تەنیا لە ناو وەك یەکن ئەگەر نا لە ماناو ناوەڕۆکدا زۆر جیاوازن، پێشتر باسی ئەو شەفاعەتەمان کرد کە باوەڕ بوون پێی شرکی گەورەیە، بەڵام ئێستا بزانین ئەو شەفاعەتەی لەلای خودا ڕێی پێ دراوە چیە؟

## ئەو شەفاعەتەی خودا ڕێی ئیداوە

لە دوای ئەوەی کاری دادگا لە ڕۆژی دوایی تەواو دەبێت لەلایەن خوداوە حوکم بۆ کافر دەرچوو بۆ دۆزەخ وە حوکم بۆ مسوڵمان دەرچوو بۆ بەهەشت، لە دوایی ئەوانەی مستەحەقی لێخۆشبونن ئیزن دەدرێت لەلای خودا بە شەهیدی هەر قەومێك دوعای خێر بۆ ئەو قەومە بکات کە شەهید لەسەر ئەوان بووە، خودا ئەم لێخۆشبوونەی ئەوان موستەحەقن رەبتی دەدا بە دوعای ئەم شەهیدەوە وەك ئەوەی ئاخیری ئیمزایەك بۆ بەهەشت، جا لێرە رەنگە حیکمەتەکەی ئەمە بێت شەهیدەکان لە دونیا لە تەرەف زۆرداران زۆر مەوردی ئیهانە بوون لەوێدا خودا رەبتی چونە ناو بەهەشتی جۆرێك لە مسوڵمانان ئەکا بە دوعای ئەم شەهیدە بۆئەوەی بیدا بە رووی زاڵم و زۆرداران.

خەڵکی یەکە یەکە حازر دەبن لە دادگای قیامەت هەروەها لە ئایەتی (٨٠–٩٥) سورەتی مریەم وە لە ئایەتی ٩٤ سورەتی انعام بەیان دەکرێ.

﴿وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَىٰ كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَاكُمْ وَرَاءَ ظُهُورِكُمْ﴾ (انعام: ٩٤).

لەو کاتەی مجرم گیانی دەکێشرێ مەلائیکەت هەواڵی تووشبوون بە عەزابیان پێ دەدەن لە رێگەی خودا ئەمەیان پێ دەگەیەنرێ: ئەوە ئێوە یەکە یەکە هاتوونەتە لای ئێمە هەروەها چۆن یەکەم جار دروستمان کردن تەنها بوون وە هەرچی لە دونیا پێماندان بە جێتان هێشت.

٨٠ مریم

(لە دوای ئەمە وەڵامی وتەکانی ئینسانی کافر ئەڵێ من ئەهلی سەروەت و ماڵ بووم لە دواییش هەر وا دەبم. خودای گەورە دەفەرموێت :

﴿وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ﴾.

ئەوەی ئەوە دەڵێ لە دوایی دەستم دەکەوێ بە دەست ئەو نیە خۆی بە تەنیا دەگەڕێتەوە.

٩٥ مریم ﴿وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَرْدًا ﴿٩٥﴾﴾.

هەمویان یەکە یەکە دێنەوە بەر دەستی خودا.

ئەمە بەرنامەی خودایە کە خەڵکی یەکە یەکە بە بێ پشتیوان و شەفیع دەچێتە لای خوداو دادگایی دەکرێ.

وە هەر کەس بە پێی کار و کردەوەی خۆی حوکمی بۆ دەردەچێ وە دوای ئەوەی حوکم دەرچوو خەڵکی دەکرێن بە دوو بەشەوە مسوڵمان و کافرەکان، جا مسوڵمانەکاتن بەر لەوەی بچنە ناو بەهەشت، کە هێشتا دەستوری کۆتایی دەرنەچووە لێرەدا نەقشێك بۆ شەهیدانی ئەم میللەتانە لە درێژایی تاریخ لە قورئان بەیان کراوە، نەقشێك بۆ گشتی شەهیدەکان کە دەڵێین گشتی شەهیدەکان رەنگە مەلائیکەتیش بگرێتەوە چونکە ئەوانیش شەهیدن، لێرە بەڵام دوعای خێریان رێگە پێدراوە لەلای خودا دوعای خێر بکەن بەڵا ئەم دوعای خێرە هیچ شتێك ناگۆرێ یانی هەروا لەوە و پێش باسمان کرد کە ئەو دوعایە وەختێك دەکرێ کە کاری دادگا تەواو بوو دەستور دەرچووە لەلایەن خوداوە هەروەك لە کاتی زیندوو بوونەوە گشتی خەڵك نامەی پێ دەدرێت ئەوەی بەهەشتی یە بە دەستی راستی وە ئەوەی دۆزەخی یە بە دەستی چەپی، بەڵام دواییشی لەسەر گشتی ئەم کارانەیان لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێ.

جا وەختێك کاری دادگا تەواو بوو ئیزن بە شەهید دەدرێت دوعا بۆ خەڵکێك بکات، کە ئەم خەڵکە لە دادگای خودا دەرچوون و بەهەشتین.

ئەمە وەکو دوعایە چونکە ئینسانی مسوڵمان کاتێك دوعا دەکات دەبێت هۆ (اسباب) ی جێ بەجێ کردبێ بۆ ئەوەی دوعایەکەی گیرا بێت. خودای گەورە دەفەرموێت :

﴿رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا﴾ لێرەدا هۆی لێخۆشبوون ئیمان هێنانە واتا خودایە ئەوە ئێمە ئیمانمان هێنا کە تۆ داوات کردبوو خودایە تۆش لێمان خۆشبە. واتا کەسێك ئیماندار نەبێت بڵێت خودایە لێم خۆش چۆن دەبێت ئەگەر هەموو پێغەمبەران و علیهم السلام پیاوچاکانیش دوعای بۆ بکەن خودا لێی خۆش نابێت. هەروەها جائز نیە کەسێك دوعا بۆ یەکێك بکات کار و کردەوەی چاکی نەبێت هەروەها لە سورەتی (توبە) ئاگادار کراوە بە پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام بۆ ئەوەی پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام هەروەها مسوڵمانان حەقیان نیە دوعای خێر بۆ ئەو کەسانە بکەن کە مشرکن (اقامە حجە) کراون، ئەگەرچی خزمیش بن دایك و باوکیش بن بەڵێ پێغەمبەر ابراهیم (علیە السلام) دوعای خێری بۆ باوکی کرد کە باوکی مشرك بوو ئەمە شتێکی تایبەت بووە کە لە پێشدا وەعدەیەکی پێ دابوو چونکە ابراهیم (علیە السلام ) خلاف وەعدی نەبوو ئەم دوعایەی کرد هەر وەفا بۆ وەعدەکەی وە دوعایەکەشی هیچ ئەنجامێکی نەبوو ناش بێت هەرچەند خوشەویستی خودایە چونکە مەرجەکانی دوعای تێدا نەبوو.

بۆ ئەوەی رۆشن بێتەوە دوعای لێخۆشبوون بۆ کەس قبوڵ نیە تەنیا بۆ کەسانێك کە مستەحەقی لێخۆشبونن.

خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَالَّذِينَ جَاءُو مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ ﴿١٠﴾﴾ (حشر: ١٠).

لێرە دەفەرموێت (لنا) یانی ئێمەی ئیماندار وە بۆ ئەوانەی لە ژیاندان وەختێك دروستە ئەم دوعایە بکات دەبێت شایستە بێت واتا ئەوەی دوعای بۆ دەکەی دەبێ ئیماندار بێت بەڵام بۆ مسوڵمانانی بەر لە خۆی کوچکردوان و پشتوانان (انصار ومهاجرین) دەگرێتەوە وە هەرچی مسوڵمانانی دواییش دەگرێتەوە.

یەکێکی تریش لەو دەلیلانەی کە دوعای خێر لێخۆشبوونیان تەنیا بۆ کەسانێك پێویستە کە مستەحەقی لێخۆشبوون بن.

ئایەتی ٧-٨-٩ غافر یا مؤمن ﴿الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾.

ئەوانەی تەختی فەرمانڕەوایی خودا هەڵدەگرن وە ئەوانەی کەوان بە دەوری تەختی فەرمانڕەوایی خودا تەسبیح و حەمدی خاوەنی خۆیان دەکەن و ئیمانیان پێ هەیە وە داوای لێخۆشبوون دەکەن بۆ ئەوانەی ئیمانیان هێناوە.

جا بزانن دوعا بۆ کێ دەکەن بۆهەموو کەسێك یا لە چوار چێوەی قاعدەیەك دا تەنیا بۆ کەسانێك

﴿رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَحْمَةً وَعِلْمًا فَاغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا وَاتَّبَعُوا سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ﴾.

خاوەنەکەمان بە رەحمەت هەموو شتێکت داپۆشیوە وە زانستت سەرتاپای بوونەوەری داپۆشیوە دەی لە گوناحی ئەوانە خۆشبە کە تۆ بەیان کردووەو شوێن ڕێگاکەی تۆ کەوتون وە لە عەزابی ئاگری بە گڕی دۆزەخ بیانپارێزە.

لێرە ئەوان دوعا بۆ کەسانێك دەکەن ﴿لِلَّذِينَ تَابُواْ وَٱتَّبَعُواْ سَبِيلَكَ﴾ یانی ئەوانەی تۆبەیان کردووەولەسەر تۆبەکەیان بەردەم دەڕۆن بە ڕێگای خوادا. دەی کەسێك تۆبە بکات مستەحەقی لێخۆشبوونە لە قورئاندا خودا دەفەرموێت ئەوانەی تۆبە دەکەن و ئیمان دێنن خودا لێیان خۆش دەبێت، دەی مەلائیکەتی نزیکی خودا بۆ کەسانێك دوعا دەکەن کە خودا لێیان خۆش بووە.

کاتێك دُوعا دەکەی زەمینەی کارەکەت فەراهەم دەکەی بە (توکل) لەسەر خودا ئینجا دوعا دەکەی.

بۆ نمونە / مەلایەك لە خوتبە دوعا دەکات دەڵێ خودا حوکمی ئیسلاممان بۆ بچەسپێنە جا لێرەدا دەبێت تۆ دەعوە و بانگەواز بکەی تەواوی ماندووبوونت ئەنجام بدەی بە (توکل) لەسەر خودا ئنجا دوعا دەکەی.

بۆ نمونە / کاتێك دوعای باران بارین دەکەین دەبێ پێشتر تۆبە و داوای لێخۆشبوون بکەین لە خودا لەو گوناحانەی کردوومانە، ئینجا دوعای باران بارین دەکەین هەروەکو خودای گەورە دەفەرموێت :

﴿فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَٰرًا ﴿١٢﴾﴾.

لێرە خودا ڕێگە بە مەلائیکەت و پێغەمبەران علیهم السلام و راستگۆیان و شەهیدەکان ( ملائکە – امبیاء – صدیقین – شهداء ) دەدات کە هەر کامیان بۆ گروپ و کۆمەڵێك کە لە گەڵیاندا ژیاون، بەڵام مەلائیکەت بە شێوەیەکی گشتی

دوعای خێر دەکەن لە دوای ئەوەی ڕۆشن بۆوە ئەوان موستەحەقی ئەو شتەن کە ئەوان دوعای بۆ دەکەن.

لەسەر ئەم ئەساسە ڕۆشن بۆوە نەوعێك لە پاڕانەوە (دوعا) هەیە لە قیامەتدا لە دوای ئەوەی خودا ڕێیان پێدەدا ئەویش وشەی شەفاعەتی بۆ بەکار دەهێنرێت، جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەم شەفاعەتەی یەکەم کە باسمان کرد باوەڕ بوون پێی شرکی گەورەیە.

جا ئەوانەی دوعای خێر دەکەن لە دوای ئەوەی خودای گەورە ڕێگەیان پێدەدات ئەم دوعایەش وشەی شەفاعەتی بۆ بەکار هێنراوە. ئەوانە کێن ؟.

١- انبیاء (پێغەمبەران) علیهم السلام : ئەوانەی رسالەتیان بۆ هاتووە.

٢- شهید (شەهید) : ئەمەش دیارە کەسێك لە ڕێی خودا شەهید بووە.

٣- صدیقین ( ڕاستگۆیان ) : ئەمە مەعلوم نیە کێ یە تەنیا لە ناخ و کار و کردەوەی ئیمانی خۆی خوا دەزانێ.

ئەمە لەبەر ئەوە جائزە :

١- وەکو ئەوە نیە بڵێی خودا کوڕی هەیە نازی دەڕوا شەفاعەتمان بۆ دەکات.

٢- وە بەم شێوەش نیە کە هەوەس بدرێتە پاڵ خودا.

٣- وە بەم شێوەش نیە سیفەتی نەزانین بدرێتە پاڵ خودا.

بەڵام ئەمە خودا ڕێگە بەمانە دەدات دوعا بکەن.

## (ئێستا دەلیل بە چەند ئایاتێك كە رێگە بە شەفاعەتی یەكەم نادات وە رێگە دان بە شەفاعەتی دوەم)

لەو ئایەتانەی بە شێوەی تەواو (مطلق) رێگە بە (شفیع) نادەن یەكێكیان ئایەتی ٥٢ سورەتی اعراب كە لە مەوردی كافرەكان لە دوای ئەمەی لە چەند ئایەتێك بەیان دەكرێت، ئەوانەی مستەحەقی دۆزەخن دەچنە دۆزەخ وە ئەوانەی مستەهەقی بەهەشتن دەچنە بەهەشت وە كەسانێكیش هەن وان لەسەر (اعراف) ئەمە حەسارێكە لەم بەینەدا، ئەویش رەئی جیاواز هەیە كە چ تەبەقەیەكن دەچنە ئەوێ دوایی بەیانی گفتوگۆیەك لە بەینی ئەهلی بەهەشت و ئەهلی دۆزەخ وە دوای ئەوە گوفتارێك ئەهلی ئەعراف دەفەرموێت :

﴿وَلَقَدْ جِئْنَاهُم بِكِتَابٍ فَصَّلْنَاهُ عَلَىٰ عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ (اعراف: ٥٢).

ئەو كەسانەی دین و ئاینو خۆیان كردە جێی گەمە و دونیایان گرت وە رۆژی قیامەتیان لە بیر چۆوە نیشانەی هاتنە پێشی قیامەتیان خستە پشت گوێ بەلاّم وا نەبێ ئێمە وێلّمان كردبن، لە پێشدا بۆمان روون نەكردبنەوە و (اقامە حجە) مان نەكردبن، بەلّكە لە ژیانی دونیا كتێبمان بۆ ناردن تەواوی شتەكانمان بۆ رۆشن كردنەوە و دیارە كەسانێك نایانەوێ ئیمان بێنن ئیتر مستەحەقی ئەم رەحمەتە نین دەفەرموێت :

- ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُ﴾.

لە دونیا لە بارەی ئەوانەی ئەم كتێبە پشت گوێ دەخەن چاوەروانی چین.

جا ﴿يَوْمَ يَأْتِي تَأْوِيلُهُ يَقُولُ الَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبْلُ قَدْ جَاءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ﴾.

ئەو رۆژەی ئەوەی وا لەوەو پێش وا لەبیر چووبووە وە شتێك لەبارەی قیامەت لەم کتێبە بەیانکرابوو ئەوان خستبوویانە پشتی گوێ، ڕۆژێك ئەوان دەزانن ئەمە ڕاستی بوو ئەوانەی ئەوەیان لەبیر چوو بوو دەڵێن ئای نێردراوی خاوەنەکەمان شتێکی ڕاست و دروستیان پێ گوتین، حەقیان بەیان کرد بەڵام ئێمە بە گوێمان نەکردن.

دەی ﴿فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَآءَ فَيَشۡفَعُواْ لَنَآ﴾.

دەی خۆزگە ئێمە تکا کارانێکمان شەفیعانێکمان ببن کە شەفاعەتمان بۆ بکەن ڕزگارمان بکەن لەم عەزابە کە ئێمە کاری خراپمان کرد پێی گەیشتین.

﴿أَوۡ نُرَدُّ فَنَعۡمَلَ غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُ﴾.

یان بمانگەڕێنەوە بۆ دونیا بۆ ئەوەی کردەوەمان بگۆڕین بە چاکە.

بەڵام نا ﴿قَدۡ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ﴾.

تازە خۆشی و سەعادەتیان لە دەستدا تازە وە ئەو قسانەی هەڵیاندەبەست کە گوایە ئێمە ئەگەر زیندوو بکرێتینەوە شەفیعەکانمان پێماندەگەن تکامان بۆ دەکەن، بەڵام ڕۆشن بۆوە ئەمەی دەیانگوت هەڵە بوو تەنیا کار و کردەوەی خۆیان بە کەڵکیان بێت.

لە ئایەتی ١٠٠ی سورەتی شعراء نەفی شەفیع دەکات، بەڵام بە نسبەت بەو کەسانەی کە مستەحەقی عەزابن، کە چەند ئایەتێك لەوە و پێش دەفەرموێت ئاگری دۆزەخ دەخرێتە بەرچاوی سەر لێشێواوان لە دوای ئەوەی حەقیان بۆ ڕۆشن بۆوە لەبەر سەر لێشێواوی خۆیان لاڕێیان گرت، جا چەند ئایەتێك بە شێوەی سەرزەنشت دەفەرموێت: ئەوانەی غەیری خودا عیبادەتیان دەکرد، ئەوانەی بە ناونیشانی شەفیع بۆ خۆتان قەرارتان دابوو، ئێستا هیچ کام لەمانە دەتوانن

کۆمەکتان بکەن؟ نا جواب نیە، هەم ئەوانەی کردوویانن بە شەریکی خودا وە هەم خۆیان هیچ کاریکیان پێ ناکرێت. دەفەرموێت: سەرلێشێواوان لەگەڵ ئەوانی تر کە دەکرێنە ناو دۆزەخ دەیکەن بە کێشمە کێشم هەریەکە و ئەویتر تاوانبار دەکات، کێ ووتی بە شوێن من وەرە. لێرەدا سەر لێشێواوان دەڵێن : ﴿فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ﴾ ئێمە کە مجرمین لە ڕێی راستی لامان دا هیچ شەفیعێکمان نیە.

﴿وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ﴾ وەهەروەها دۆستێکی وامان نیە کە داخ بێت بۆمانو تکامان بۆ بکات و رزگارمان بکات.

ئەوە لێرە نەفی شەفیع دەکرێت بۆ کەسانێك کە مستەحەقی دۆزەخن، قسە لەسەر زاری خۆیان نەقڵ دەکرێ.

وە دەردەکەوێ عەقیدەیەکی پوچبووە هیچ ئەساسێکی نیە ئەوان دەیانگوت لە قیامەت شەفیعمان دەبێت.

ئەو شەفاعەتەی باسمان کرد شرکە وەکو ئەوە وایە بڵێت غەیب دەزانم چونکە نە لە قورئان باسکراوە نە لە حەدیس.

بەڵام ئەم شەفاعەتەی لە قیامەتدا رێگەبە ( مەلائیکە و – پێغەمبەران و علیهم السلام – راستگۆیان و – شەهیدان ) دەدرێت دوعا بکەن ئەمە لە قورئان باس دەکات ئێمە لە قورئانمان وەرگرتووە.

وە هیچ کەس ناتوانێت بڵێت من دەکەومە بەر دوعای (مەلائیکە – انبیاء – صدیقین – شهداء) چونکە گوتمان ئەم دوعایە لە دوای تەواوبوونی دادگا دەکرێ، دوای ئەوەی دوعای بۆ دەکرێ روون بۆوە دەچێتە بەهەشت.

دەی کێیە ئەمین بووە لە مەکری خودا؟ کێیە غەیب دەزانێ کە بە ئیمانەوە لە دونیا دەردەچێ تا بتوانێ ئاوا شتێك بۆ خۆی قەرار بدا؟.

یەکێکی تر لەو ئایەتانەی بە شێوەیەکی تەواو (مطلق) نەفی شەفیع دەکات ئەویش دەربارەی کافرەکان (ئایەتی ٤٨ سورەتی مدثر) گفتو گۆی ئیمانداران لە بەهەشت لە بارەی کافرەکان لە دۆزەخ کە رویان دەکەنە کافرەکان، ئەرێ ئێوە بۆچی چوونە دۆزەخ ناو سەقەر ئەوانیش دەڵێن لە نوێژکەران نەبووین خواردنی هەژارانمان نەدەدا زەکاتمان نەدەدا زیاتر لەمە لەناو شتی باطل و بێ هودە بووین وە رۆژی جەزامان بە درۆ دەخستەوە ئاوا وەختێك یەقین هاتە بەرمان، ئیتر فائیدە نەبوو ئیمان هێنان، جا دەفەرموێت :

﴿فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ﴾، ئیتر تکای تکاکاران هیچ سود بەوان نادات.

هەروەها ئایەتی ١٨ سورەتی غافر یا مؤمن ) نەفی شەفیع دەکات لە باسەکە لەگەڵ کافرەکان وەختێك عەزاب و هیلاك نازڵ دەبێت لە بۆ بێ باوەڕەکان دوای ئەوەی کە تێگەیەنران بە تەواوی (اتمام حجە) کران، لەو وەختە بەیان دەکات کەسیان نیە بێت بە فریایان تکایان بۆ بکات لە یاسای خودا، دوای (اتمام حجە) ئەگەر ئیمان نەهێنن ئیتر عەزابی خودا نازڵ دەبێت، دەفەرموێت:

﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْءَازِفَةِ إِذِ ٱلْقُلُوبُ لَدَى ٱلْحَنَاجِرِ كَٰظِمِينَ ۚ مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ﴾.

دوای ئەوە بەیان دەکات هەر کەس بە پێی کەسپ و سەعی و کاری خۆی پاداشتی دەدرێت بێ ئەوەی زوڵم لە هیچ کەسێك بکرێت.

ئەفەرموێت هۆشداریان بدەرێ لە رۆژی بەلایەك خەریکە وا نزیکە دێت (ازفە) مانای زمانەوانی (ازفە) نزیکبوونی رووداوێك بە جۆرێك واتەنگبووبێتەوە خەریکە روو بدات ( بەیانی هیلاك و بەلایەك کە لە قیامەت روودەدات نزیکە) کەس ناتوانێت قسەیەك بکات هەر لەو رۆژە.

بۆ ئەوانەی کە زاڵمن غەیری ڕێگەی خودا ڕێگەی تریان گرتووە لەو ڕۆژە (حمیم) بۆ وان نیە.

﴿حَمِيمٍ﴾: ئاوی داغ (دۆستی گیانی ئەوەی بۆی دەسووتێت بە تەواوی توانای دیفاعی لیَ بکات )

﴿وَلَا شَفِيعٍ﴾ ئەوە لێرەش نەفی شەفیع دەکات بۆ ئەوانەی زاڵمن، واتە ڕێگەی حەقیان بۆ ڕۆشن بۆتەوە، بەڵام غەیری ئەم ڕێگەیان گرت لە دونیا.

ئایەتی ١٢ - ١٣ سورەتی ڕۆم، لێرەش نەفی شەفاعەت دەکرێ بە شێوەیەکی تەواو بۆ مجرمەکان.

﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُبْلِسُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿١٢﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَآئِهِمْ شُفَعَـٰٓؤُا۟ وَكَانُوا۟ بِشُرَكَآئِهِمْ كَـٰفِرِينَ ﴾

لە ورۆژەی قیامەت بەرپا دەبێ تانباران نائومێدو مەئویس دەبن. بۆ ئەوان نیە لە شەریکو پەرستراوەکانیان تکایان بۆ بکات (نەك تکایان بۆ ناکەن بەڵکو)ئەوان بەهاوبەشیو شەراکەتەکانیان بێ باوەڕ.

لێرەش نەفی شەفاعەت بە شێوەی (مطلق) دەکات .

هەروەها لە ئایەتی ٩٤ سورەتی انعام هەر بەم شێوە نەفی شەفیع دەکرێ.

﴿وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَٰدَىٰ كَمَا خَلَقْنَـٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَـٰكُمْ وَرَآءَ ظُهُورِكُمْ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَـٰٓؤُا۟ لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴾.

بەر لەم ئایەتە باسی ئەوە دەکات ئەوانەی تووشی زوڵم و شرك دانان بوون بۆ خودا وە پڕو پاگەندەی ئەوە دەکەن کە وەحیان بۆ هاتووە ئدعای (نبوة) دەکەن،

ئەوانەی ئاوها پڕ رویی دەکەن، ئەوە چی یە کە دەڵێت منیش دەتوانم هەر وەك ئەو پێغەمبەرە بکەم، منیش شتێکی ئاوا بێنم، دەفەرموێت: ئەوانەی تووشی ئەم زوڵمە بوون دەفەرموێت ئەگەر بیانبینن وا لە ناو کێژاوەکانی مەرگدا مەلائیکەت دەڵێت ئا دەی گیانەکاتننتان دەرکەن بە شێوەی سەرزەنشت بە هێز هەر ئەو وەختە ئەیننێنە سەر دڵیان .

﴿ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ عَذَابَ ٱلۡهُونِ بِمَا كُنتُمۡ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ وَكُنتُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِهِۦ تَسۡتَكۡبِرُونَ﴾.

ئەوە ئەمڕۆ لە لەحزەی مەرگ بە دواوە ئێوە سزاتان دەدرێت وە بە عەزاب و زەلیلی لەبەر ئەوەی درۆتان هەڵدەبەست نسبەت بە خودا شتێك ناحەق باطل و پوچ بوو دەتان گوت خۆتان بەرزتر دەگرت لەوەی بە پێی ئایاتی خودا کار بکەن، دوای ئەمە دەفەرموێت: دەی ئێوە هەر کام بە تاك و تەنیا هاتوونەتەوە بۆ لامان وە ئەو نعمەتانەی پێماندان لە دونیا بە جێتان هێشت ئەرێ ئەو شەفیعانە وا بە گومانی خۆتان داتانانابوون گومانتان وابوو رزگارتان دەکەن، ئەرێ ئەوانە نابینین لەگەڵتان بە شێوەی (استهزاء) گاڵتە پێ کردن. لە عەزاب رزگارتان بکەن خۆ بەینی ئێوە و ئەوان پچڕاوە وە ئەو گومانە پوچەتان لێ گوم بووە. ئەوەش لەگەڵ کافرەکان کە دەلێ کەس نیە ببێ بە شەفیعتان.

هەروەها لە سورەتی یونس ئایەتی ١٨ دەفەرموێت:

﴿وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ﴾.

ئەوانەی تووشی زوڵمی بێ سنور بوون عبادەتی غەیری خودایان دەکرد وە ئایاتی خودایان بە درۆ خستەوە دەفەرموێت: ئەوانەی عبادەتیان دەکەن نە

دەتوانن زیانتان پێ بگەیەنن وە نە دەتوانن چاکە و خۆشیتان بۆ بێنن وەختێك رەخنەیان لێ دەگیرێ دەڵێن بەڵام تکا کارمان دەبن لای خودا، چونکە بۆمان باشن شەفاعەتمان بۆ دەکەن ئەمە کەی خراپە.

پێیـــــان بڵـــــێ ﴿قُلْ أَتُنَبِّئُونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾.

دەفـەرموێت ئێـوە شـتێك بـە خـودا دەڵـێن لـە ئاسمانـەکاتن و زەویـدا کـە ئـەو نەیزانیوە، یانی ئێوە شەفیع و تکا کارتان داناوە کە خودا شتی وای باس نەکردووە دەشێ ئێوە شتێکتان زانی بێ کە خودا پێی نەزانی بێ بە شێوەی (استهزاء) پاك و بێ گەردی بۆ خودا بۆ ئەو شرکەی ئێوە دەیکەن.

ئایەتی ٢٣ سورەتی یس

ئەو یەك نەفەرەی سێ دانە پێغەمبەرەکە چوونە نـاو شـارەکە موەفـەقبوون کـە بـەس ئـەو هیدایـەت بـدەن ئـەو نەفـەرە روو لـە تایەفەکـەی خـۆی دەکـات ئـاوا دەفەرموێت :

﴿ ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً إِن يُرِدْنِ ٱلرَّحْمَٰنُ بِضُرٍّ لَّا تُغْنِ عَنِّى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا وَلَا يُنقِذُونِ ﴾.

ئەوە من غەیری خودا فەریادرەسانێك بۆ خۆم قـەرار بـدەم فەریادرەسـانێك کـە ئەگەر خودا شتێکم بەسەر بێنێ هیچ کارێکم بۆ نەکەن و هیچیان پێ ناکرێت من ئاوا شتێك دەکەم نا چۆن کاری وا دەکەم.

لێرەش ئەم ئینسانە ئیماندارە کە حەقی بۆ رۆشن بۆتـەوە دەڵـێ ئیمکـانی نیـە یەکێك خودا بناسێ بڵێ شەفیعمان هەیە لای خودا شەفاعەتمان بۆ دەکەن.

ئایەتی ٤٤ سورەتی (زمر) دەفەرموێت:

﴿قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعٗاۖ لَّهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴾.

بە شێوەیەکی یەکلا کەرەوە (حصر) دەفەرموێت: پێیان بڵێ شەفاعەت گشتی هی خودایە چون بەشێکە لە کاری فەرمانڕەوایی و زەوی و ئاسمان و فەرمانڕەوایی گشتی هی خودایە.

ئەو ئایەتانەی بەیانی ئەوە دەکەن شەفاعەت ئاوها نیە ئینسان لە لای خۆی قەرار بدا کە شەفاعەت هەیە کەسانێك دەبن بە شەفیعیان بەم شێوەیە بە ئایەتی قورئانی خودای گەورە رەدیان دەداتەوە وە بە مجرم و کافر دایان دەنێ چونکە تووشی شرکی گەورە بوون.

تا ئێرە گەیشتینە ئەوەی کە هەر کەسێك ئاوا شتێك قەرار بدات کە من شەفیع و تکا کارێکم دەبێت، دەگاتە فریام لە قیامەت بە شێوەیەك لە شێوەکان بۆمان بێ بەش دەبن لە شەفاعەتی دوعای مەلائیکەت و پێغەمبەران وعلیهم السلام راستگۆیان و شەهیدەکان.

هەر لەبەر ئەمەیە شەفاعەت گشتی هی خودایە و لە دەست خودایە کەسێك ناتوانێ ئاوا شتێك قەرار بدات وەختێك لە قورئان باس دەکرێت وشەی (من دون) بەکار دەبرێ یانی شەفیع و شەفاعەت لە غەیری خوداوە نیە تەنها هی خودایە.

هەروەها لە سورەتی انعام ئایەتی ٥١ دەفەرموێت:

﴿ وَأَنذِرۡ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحۡشَرُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ لَيۡسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِيّٞ وَلَا شَفِيعٞ لَّعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ﴾.

بەیانی خەتەرێکە هۆشداریە بەوەی کە عەزابی خودا دێ، بەڵام بەکێ هۆشداری دەدەی ئینسانی داعی دەبێ بزانێ لەگەڵ کێ قسە دەکات باس باسی هیدایەت و

گومڕاییـه هۆشـداربەوانه بـدە کـه ترسـی ئـەوەیان هەیـه ڕۆژێـك کـۆ دەکرێنـەوە دەبرێنەوە بۆ لای خودا، ترسی ئەوەیان هەیە لە غەیری خودا شەفیع و تکا کاریـان نیە.

هەروەها لە سورەتی (یس) خودای گەورە دەفەرموێت :

﴿ إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ اتَّبَعَ الذِّكْرَ وَخَشِيَ الرَّحْمَٰنَ بِالْغَيْبِ ﴾.

هۆشداری بۆ گشت کەسێك نیە بۆ کەسانێکە ئـستعدادی ئیمانیـان هەیـه ترسـی خودایان لە دڵدایە.

دەفەرموێت: بۆ ئەوانە هۆشداری بکـه ئەوانـەی ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ ئەوانـەی ترسـی خودایان لە دڵدایە بۆ ئەوەی کارێك بکەن خۆیان بپارێزن لە عەزاب.

لەم ئایەتە بەیانکراوە کەسانێك وا دەچنەوە بەردەم خودا ( ولی و شـەفیعیان ) نیە.

ولی : واتە کەسێك پەیوەنـدی نزیکـی لەگـەڵ کەسـێکی تـر هـەبێت کـه بتـوانێ کۆمەکی بکات بە شێوەی سەربەخۆ یان کەووتۆتـه ژێـر دەسـتی چـاوەڕێ کۆمـەکی ئەوەوە.

شفیع: ( وکیل مدافع) تکا کاری هەیە داوای بۆ دەکـات لـەلای خـودا بـۆ ئـەوەی لێی خۆش بێت، وەك (واسطة) بچێت لای خودا واستەی بۆ بکات.

ولی: خۆی دەست بەکار دەبێت.

شفیع: وەك تکاکار.

ولایة: جمعی ( ولی).

ئەفەرموێ ( من دونه) یانی شەفیع و وەلیمان نیـه غـەیری خـودا، دەفـەرموێت: کەسانێك کە ئەم ڕاستیە دەزانن ئنزاریان بکە.

ئەگەر دیقەت بکەین لە زەمینەی ( ولایة) لە ئایەتێکی تر بۆمان ڕۆشن دەبێتەوە کە شەفاعەت غەیری خودا (من دون الله) بە شێوەیەکی (مطلق) نیە چونکە لە ئایاتی تر بەیان کراوە ئیمانداران لە قیامەتدا (ولی) یان هەیە.

بۆ نمونە /

٣١ فصلت خودای گەورە دەفەرموێت بە زمانی مەلائیکەت:

﴿ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ﴾.

لەوێ دەفەرموێت: لەو ڕۆژەی کە دەگەڕێنەوە شەفیع و وەلی نیە غەیری خودا، لێرەش مەلائیکەت دەڵێن ئێمە (ولی) ئێوەین لە دونیا و قیامەت، چون بڕیار لە هەر زەمینەیەك لە دەست خودایە ئەگەر ئەو قەراری دا کەسێك شەفیعی کەسێك بێت هەڵبەتە بەم شێوە ناکە کە باسمان کرد، قورئان ناوی دەبا بە شرك، بەم شێوە دوعایە بڕیاری دا کەسێك وەلی کەسێك بێت ( واتا خودا ڕێی دا دوعای خێر بکات ) دەبێت وە ئەگەر بڕیاری نەدا نابێت.

جا مشرکەکان بە گومانی خۆیان ( شفیع – ولی ) بۆخۆیان قەرار دەدەن ئیتر لە (ولایة – شفاعة) بە شێوەیەکی تەواو بێ بەش دەبن.

بەڵام ئەوانە ئیماندارن هەر لە دونیا پەیوەندی (ولایة) (ولی) لە بەینی خۆیان پەیا دەکەن ئیمانداران (ولی) یەکترن دەبنە (ولی) یەکتر.

هەروەك لە سورەتی (توبە) خودای گەورە دەفەرموێت :

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ﴾.

پەیوەندی نزیکیان بە یەکترەوە هەیە ئیتر کە (جلب النفع) – (دفع الضرر) لە هێنانی خۆشی و لابردنی ناخۆشی بە شێوەی هۆ (سبب) بۆ یەکتر ئەکەن، ئەمە لە دونیا یانی لە چوارچێوەی (اسباب ومسببات).

بـۆ نمونـە: ﴿يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ﴾.

یانی بۆمان لە چوارچێوەی (اسباب ومسببات) خودای گەورە ڕێ دەدات ببن بە وەسیلەی لابردنی ناخۆش و هێنانی خۆشی لەسەر یەکتر.

لەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ ئیمانداران پەیوەندی (ولایە) تیان لەلایەن یەکتر هەیە.

هەروەها لەم ئایەتە بەیان دەکات مەلائیکەت پەیوەندی (ولایە)تیان لەگەڵ ئیمانداران هەیە هەم لە دونیا و هەم لە قیامەت.

ئەمە چون ئەم ولایە لە بەینی مەلائیکەت و ئیمانداران وە لە بەینی ئیمانداران خۆیان بڕیارێکە لەلایەن خوداوە، ئیتر مانای ئەو (ولایە)تە نابێت کە مشرکەکان بە گومانی خۆیان بۆ خۆیان قەراری دەدەن.

بۆ نمونە لەسەر (ولایە) تی مەلائیکەت بۆ ئیمانداران لە دونیا ئەوەیە کە مەلائیکەت موژدەیان بۆ دێنن و جێگیریان، دەکەن بۆ نمونە لە (غەزوەی احد) (ملائکە)ت کۆمەکیان دەکەن و لەگەڵ ئەوان شمشێر دەوەشێنن وە سوپای دوژمن شکست پێ دەدەن وە هەروەها غەیری بۆمان خودا خۆی ڕێ بە مەلائیکەت دەدا، بۆ نمونە دوعای خێر بکات هەروەکو لە ئایەتی ٧-٨-٩ ی سورەتی غافر باسمان کـــــرد ﴿ٱلَّذِينَ يَحْمِلُونَ ٱلْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِۦ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾.

کە دوعای خێر بۆ مسوڵمانان دەکەن.

ئا بۆمان شێوەیەکن لە (ولایە) هەروەها (شفاعە) تێك کە بە مانای دووەم لە قیامەت (مانای دوعا) کە بۆمان لەلایەن خوداوە بریار دەدا بەو مانایە نا کە کافر و مشرکەکان بۆ خۆیان (شفاعە) و (ولایە) قەرار دەدەن.

ولی : ئیتر راستەوخۆ دەست بەکار نابێت، بەڵکو خودا رێی پێ دەدات کە ئەو مەلائیکەت بچێت لەفڵان غەزوە یارمەتی ئیمانداران بدات یان رێ دەدات دوعای خێر بۆ کەسانێك بکەن کە مستەحەقی ئەم دوعای خێرەن.

دەی لە ئایەتی ٣١ سورەتی (فصلت) خودای گەورە بەیان دەکات کە مەلائیکەت لە ئاخرەت (اولیاء) ی ئیمانداران بەپێی ئەم ئایەتە رۆشن دەبێتەوە کە (لیس لهم من دونە ولي) وە لەلایەکی تر غەیری خودا (ولی) یان نیە.جا مانای ئەوەیە لە غەیری خودا (وەلی) یان نیە ئەگەر خودا قەرار بدات دەبێت.

وەك بۆ مەلائیکەت بریاری دا ئەوە بو، بەڵام ئیتر تیگەیشتن و مانای غەیری ئەوەیە کە مشرکەکان بۆ خۆیان قەراری دەدەن.

هەروەها لەم ئایەتە دوو شت نەفی کراوە (شفیع) (ولی) (من دونە) جگە لە خودا.

(ولی) زانیمان ئیتر مانای ئەوە نیە ئیتر (ولی) نەبێت ئەگەر خودا رێی دا بە شێوەیەکی سنووردار.

(شفیع) لە لای غەیری خوداوە شەفیع نیە ﴿قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعًا﴾.

هەروەها لە ئایەتی ٧٠ی سورەتی (انعام) خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَذَرِ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ وَذَكِّرْ بِهِۦٓ أَن تُبْسَلَ نَفْسٌۢ بِمَا كَسَبَتْ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيٌّ وَلَا شَفِيعٌ وَإِن تَعْدِلْ كُلَّ

عَدۡلٖ لَّا يُؤۡخَذۡ مِنۡهَآۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أُبۡسِلُواْ بِمَا كَسَبُواْۖ لَهُمۡ شَرَابٞ مِّنۡ حَمِيمٖ وَعَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ ﴾.

ئەوانەی وا ئاینی خۆیان بە گەمە وەرگرتووە بە ناونیشانی سەرگەرمی گرتوویانە وە ژیانی دونیا خەڵەتاندوونی ئەوان وێڵ بکە کارت پێیاندا نەبێت ئەوە ناکەن کە خۆت پێیانەوە ماندوو بکەیت چونکە مەسەلەی بانگەواز پەیوەندی هەیە بە بەرامبەر کە چەند ئیستعدادی هەیە بۆ وەرگرتن وە ئەوانەی لە دەروونی خۆیان ئیستعدادی ئەوەیان نیە تۆ ناتوانی بیانگۆڕی کەوابوو تۆ لە دوای ئەوە کە وەزیفەی خۆت رۆشن کردۆتەوە ئیتر وێڵیان بکە کارت پێیان نەبێت، یاد ئاوەری ئەو کەسانە بکە کە ترسی ئەوەیان هەیە رۆژێك دێت لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێ لەوەی کە کردوویانەلە حاڵێکدا لە غەیری خودا نە شەفیع و نە وەلی یان نیە، وە ئەوانەی کوفریان دەکرد دوای ئەوەی بۆیان رۆشن ببۆوە جا حەق ئەوەیە عەزاب بدرێن.

هەروەها لە سورەتی (سجدة) ئایەتی ٤ خودای گەورە دەفەرموێت :

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ مَا لَكُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِيّٖ وَلَا شَفِيعٍۚ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴾. (الله) ئەو کەسەیە کە ئاسمان و زەوی و ئەوەی لە بەینیاندایە لە (٦) رۆژ دروستی کردوون یانی لە شەش دانە زەماندا دروستی کردوون بە کەیفیەتی خۆی لە دوای ئەوە راست لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی وەستا ئەوەی کە دەفەرموێت (ستة ايام) لە ئایەتی تر تەوزیعی داوە رۆژێك لەلای خودا وەك هەزار ساڵە لای ئێوە وە هەزاریش لە محاوەراتی عەرەبیدا بۆ (تحدید) نیە یانی هەزاری رێك دوای ٩٩٩ بەر لە ١٠٠١ بەڵکو بۆ (تکثیر) ە کە نەتیجە ئاوای لێ دێ شەش رۆژ یانی شەش مەرحەلە زەمانی درێژ کە لەم شەش

مەرحەلە لە دوی ئاسمانەکانن و زەوی دروست کردوە لە چوار مەرحەلەش لـەو رزق و رۆزی و بەرەکاتێك نسبەت بە زەوی تیایدا دروست کرد.

کە لە سورەتی (فصلت) خودای گەورە دەفەرموێت : (استوی) بـە شـێوەیەکی کورت یـانی تـەواوی دەسـەڵات و فـەرمانڕەوایی بەسـەر عالـەمی هەسـتی، هـەروەها دوای ئەم دروست کردنە خودای گەورە دەفەرموێتت بۆ ئێوە نە (شفیع) و نە (ولی) نیە غەیری خودا.

وەختێك قورئان قاعدەیەك دادەنێ بە شێوەی (استثناء) روون کردنەوە دەدات چ لە عەینی ئایەت یان ئایەتی تر.

بەڵام ئەگەر قاعدەیەك بە شـێوەی (حـصر) دایمەزرانـد تـەواو ئـیتر بـە شـێوەی (استثناء) باسی لێوە ناکات.

بۆ نمونە / وەختێك دەفەرموێت بە شێوەی قاعدە:

﴿ قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ ﴾ النمــل: ٦٥ .لێــــرە ئــــیتر قاعدەیەکی گشتی دادەنێـت، هـیچ کـەس غـەیری خـودا غـەیب نـازانێ لـە دوایـیش وەختێك (استثناء) بەم شـێوە ناکـات کەسـێك غـەیری خـودا غـەیب بزانـێ، بەڵکـە دەفەرموێتت : ئەگەر ئێمە بە شێوەی وەحـی (وحـی) ریـسالەت بنێـرین بەشـێك لـە غەیب روون بکەینەوە.

دەی لێرە نەفی شەفاعەت دەکـات بـە شـێوەیەکی گشتی وە چۆن جۆرێکی تـر شەفاعەت هەیە کە رێگـە بـاس دەکـات بـۆ (استثناء) باسمـان کـرد کاتێـك خـودای گەورە نەفی شەفیع دەکات (من دون) بەکار دێنێ واتا لە غـەیری خوداوە شـەفاعەت نیە، بەڵام خودا ئەگەر رێگەی دا بە (ملائکة – انبیاء – صدیقین – شـهداء) دوعـای خێر بکەن ئەمە ئیزنی خۆیەتی.

لە سورەتی (زمر) ئایەتی ٤٣ خودای گەورە دەفەرموێت :

﴿ أَمِ اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ شُفَعَاءَ ۚ قُلْ أَوَلَوْ كَانُوا لَا يَمْلِكُونَ شَيْئًا وَلَا يَعْقِلُونَ ﴾.

ئەرێ راستی لەلایەن غەیری خوداوە تکا کار و شەفیعیان بۆ خۆیان قەرار داوە، دەفەرموێت: پێیان ئایا ئەگەر ئەو شەفیعانەتان هیچ شتێکیان لەبەر دەستدا نەبێ وە هەتا ئاواش کە خاوەن دەرك نەبن عەقڵیان نەبێ با دڵیان پێ خۆش بکەن ئەوانە دەکەن بە شەفیعی خۆتان ئیعتیماد دەکەنە سەر ئەوانە.

لا یملکون شیئاً : لە مەلائیکەت وپێغەمبەران علیهم السلام هەتا دوایی هیچ کامیان نابن بە شەفیعیان.

وە ئەوەی تر (لا یعقلون) : کە بۆمان بەندە خراپەکانن وە هەم مەوجوداتی بێ شعور وەك بەرد و پەڕۆك.

ئەمە قاعدەی نەفی شەفاعەت بە شێوەی (مطلق) کە نەفی شەفاعەت دەکات لە غەیری خوداوە.

جا لێرەدا با بزانین ئەم ئایەتانەی باسی کافر و زاڵم و مشرك دەکات، بەڵام هەر کەسێك کافر مسوڵمان مشرك زاڵم ئەگەر باوەڕی وابێت کەسێك هەیە لەلای خودا نازی دەڕوا وە کەسێك لە دونیا دەست نیشان بکات بە شێوەی سەربەخۆ کە ئەمە شەفاعەت بۆ ئێمە دەکات لە رۆژی دواییدا، ئەمە تووشی ئەو هەڵەگەورەیە بووە لە عەقیدە کە یەکێکە لە شێوەکانی شرکی گەورە وە ئەگەر راستی بۆ رۆشن بۆوە وازی نەهێنا لەم بارەوە ئیتر خودا هیچی لێ قبوڵ ناکات وە ئەگەر حەقی نەزانی هەر ئەوەندە مشرکێکە کە خودا عەزابی نادا چونکە نازانێ (تەبینی بۆ نەکراوە).

كەوا بوو باوەڕ بوون و ئیعتماد بەشەفاعەت بەو مانایەی باسمان کرد کە شرکی گەورەیە، ئەگەر دیقەت بکەی دەبێت لە یەکێك لە چوار زەمینەی شرکی (توحید) چونکە وتوومانە کە شرك و تەوحید پەیوەندی دەبێ بە زەمینەی (خلق – امر).

لە (امری تسخیری – ابتلائی ) ڕۆشن دەکات کە لە زەمینەی (افعال) فەقەت خودایە (فعلی) دروست کردووە تەئسیری کردووە بە (اسباب) تەئسیرەکە زاتی نیە سەربەخۆ نیە وە لەسەر ئەم ئەساسە ئینسان دەبێ یەقینی ببێ هەر (فعل) لە هەر شتێك ببێ فەقەت (فعلی) خودایە.

ئیعتماد بوون بە شەفیع بەم شێوەیە دەبێت لە یەکێك لە مەسئەلە ئەساسیەکانی شرك.

لە هەندێك جار شرکی عبادی بۆ بەکار دەهێنرێت.

چەند ئایەتێك بۆ سەرەنجامی ئەوانەی باوەڕیان وایە لە ڕۆژی قیامەت شەفیعیان هەیە لەبەر ئەوە لە دونیا ئلتزامی تەواویان نیە تەرکی فەرمانی خودا دەکەن، چونکە دەڵێن شەفیعمان دەبێت لە قیامەت.

خودای گەورە لە سورەتی (بقرە) لە ئایەتی ٢٥٤دەفەرموێت :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا بَيۡعٞ فِيهِ وَلَا خُلَّةٞ وَلَا شَفَٰعَةٞۗ وَٱلۡكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾.

خطاب بەوانەی کە ئیمانیان هێناوە دێنێتەوە بیریان کە ئەو شتەی لێرە دێنێتەوە بیریان ملتزم بن پێی دەفەرموێت ((انفاق) بکەن ببەخشن کە هی خۆتان نیە هی ئێمەیە، لەسەر ئەمە دەستوری ئێمە جێ بەجێ بکەنو ئەوەی زیادەیە لە پێویستی هەڵینەگرن بەر لەوەی ڕۆژێك بێت لەو ڕۆژە نەفرۆشتن هەیە یا ئینسان بە

شێوەی ئەوەی لە دونیا شتێکی هەیە ببەخشێ لە پێناو خودا بۆ ئەوەی خۆشیەك بۆ خۆی بە دەست بێنێ نە (خلە) دۆستی گیانی بە گیانی.

. (خلە) لە وشەی خلل بە مانای رەخنە.

کە دۆستێك رەخنە بکات لەوەی ئینسان ئیستیفادە بکات لەو رۆژە ئەمەش نیە، هەروەها شەفاعەت و تکا کار نیە، ئەوانەی کە کوفریان کردووە دوای ئەوەی راستی یان بۆ رۆشن بۆتەوە ئا ئەوانە ستەم کارن، دیارە جەزای ستەمکاران چۆن دەبێت.

لەم ئایەتە بە شێوەی (مطلق) بە (لا)کە بە ئیستیلاحی (علماء)پێی دەڵێن (نفي جنسي) وە نەفی شەفاعەت کراوە وە هیچ جۆرە شەفاعەتێك نیە لەم رۆژە.

لەوانەیە کەسێك بلێ (من دون) تێدا نیە بە (مطلق) هەموو شەفاعەت نەفی کردووە.

جوابی ئەمە ئەوەیە ئەم شەفاعەتەی شرکە و باوەڕ بوون پێی تووش بوون بە شرکی گەورەیە ئەمە لەگەڵ ئەوەی تر کە باسمان کرد فەقەت لە لەفز وەك یەکن.

خودای گەورە لە ئایەتی ٤٨ ی سورەتی بقرە دەفەرموێت :

﴿وَاتَّقُوا يَوْمًا لَا تَجْزِي نَفْسٌ عَنْ نَفْسٍ شَيْئًا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَاعَةٌ وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا هُمْ يُنْصَرُونَ﴾.

خطاب به بەنی ئیسرائیل ئەوانەی لەبەر مەغرور بوونیان بەمەی کە دەڵێن: لەلای خودا مەنزلەتێکی وامان هەیە ئەگەر نا فەرمانیش بکەن خودا عەزابیان نادا.

یەکەم عەزابیان دەدا لەبەر ئەوەی سەرپێچی و نا فەرمانی خودایان کرد، بە رەوشت و بەرنامەی خۆیان خطاب بەمانە دەفەرموێت: خۆتان بپارێزن لە رۆژێك

هیچ جۆره کەسێك ناگاته فریای کەسێکی تر وه هیچ کەسێك ناتوانێ شەفاعەت بکات لەو رۆژه هیچ جۆره فیدیەکی لێ قبولْ ناکرێت.

خودای گەوره له ئایەتی ١٢٣ ی سورەتی بقره دەفەرموێت :

﴿وَٱتَّقُواْ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا تَنفَعُهَا شَفَـٰعَةٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ﴾.

هەر عەینی ئەو ئایەته فەقەت جێگەی دوو وشه گۆڕاوه لەوێ دەفەرموێت (لایؤخذ منها عدل) لێره دەفەرموێت (لا یقبل منها عدل) لەوێ دەفەرموێت ( لایقبل منها شفاعه) لێره دەفەرموێت ( لا تنفها شفاعه) هەروەکو یەکن که ئەینێ بەسەر دەستیان که ئینسان ئەگەر بۆخۆی کاری نەکردبوو هیچ شتێك دەردی ناخوا له قیامەت.

بۆ نمونه / ئەو بڵێ من نەوەی فلان پێغەمبەرم علیهم السلام یان بڵێ کوڕی فلان شێخم ئەم جۆره شتانه لەقیامەت کار ناکات، بەڵکو هەر کەس به پێی سەعیو کاری خۆی، بۆیه بیر لەمه مەکەن ئەگەر کار و کردەوەی خراپتان بوو کارتان تەواوه.

ئێستا چەن ئایەتێك که وشەی ئیزنی تێدایه له مەورودی شەفاعەت :

خودای گەوره دەفەرموێت له سورەتی بقره ئایەتی الکرسي.

﴿مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ﴾البقرة: ٢٥٥ .ئەوه کێ یه ئەو کەسەی لای خودا شەفاعەت دەکات بێ ئەوەی خودا خۆی ئیزنی بدا.

اذن : یانی ئیجازەیەك که تەرەف به گوێ بیبستێ .

( اِذن — اُذن) گوێ

لێرە دوو داوایە

١- نەفی شەفاعەت بەو کەسانەی خودا ئیجازەی نەداون.

٢- ئیستثنایەکە کە ئەکرێت، ئەگەر خودا ئیجازە بدا، بەڵام ئەم تێگەیشتنە زەعیفە.

ناکرێت ئێمە لە زەمینەی شەفاعەت بینشێك وا پەیدا بکەین.

ئەم ئایەتە ئاوا دەکرێ ئێمە فەهم بکەین کێیە بە بێ ئیجازەی خودا شەفاعەت دەکات، ئێ خۆ خوداش ئیجازە نادات واتا نیە،

جا ئیستثنایەکە دوو مەترەحە کە دەکرێ ئیجازە بە بەعزێك نەفەر بدات یا هەر ئیجازە نادات.

ئەمە ناکرێتتە مەبنی بۆ عەقیدە ئەبێ لە ئایاتی تر کۆمەك وەربگرین.

خودای گەورە لە سورەتی یونس لە ئایەتی ٣ دەفەرموێت :

﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ﴾.

ئەم بەشە لە پێشدا لە ئایەتی ٤ ی سورەتی (سجدە) خوێندمانەوە (یدبر الامر) لەوێ نەبوو لە وشەی (دبر) یانی دوا (تدبیر) ئەوەیە کە ئینسان فەرمانڕەوایی بکات لە زەمینەیەك ئەمر بکات بە لەنەزەر گرتنی سەرەنجامی ئەم زەمینەیە کە لێرە دەفەرموێت خاوەنەکەی ئێوە (الله) کە زەوی و ئاسمانی لە ٦ رۆژ دروست کرد دوایی راست چوە سەر تەختی فەرمانڕەوایی.

(استواء علی العرش) (تدبیر) ی ئەمر دەکات فەرمان دەربکات بۆ هەموو شتێك وە سەرەنجامی هەر فەرمانێك لەلای هەیە وە دیارە بەرەو کوێ دەچێ وە لە

ئـاخیری سـورەتی (شـوری) دەفـەرموێت ﴿إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ﴾. هەرچـی شـتە سەرەنجام بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە.

﴿مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ إِذْنِهِۦ﴾.

(ما) بۆ نەفی یە (من) کە لە دوای هاتووە پێی دەڵێن (مـن ) زائـدە بـۆ تەئکیـدی نەفیەکە مانای هیچی لێدەگیرێ هیچ شەفیعێك نیە مەگەر دوای ئیزنی خودا.

ئەمیش هەروەك جوملەکەی( اية الكرسى) دوو دانە فەهمی لێ دەکرێ

١- ئەگەر خودا ئیجازەی دابێت.

٢- یاخود ئیجازە نادات، قەت نابێت.

لێرەش بە تەواوی رۆشن نەبۆتەوە دەبێ بچین بۆ ئایەتی تر.

خودای گەورە لە سورەتی طه ئایەتی ١٠٩ دەفەرموێت :

﴿يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَرَضِيَ لَهُۥ قَوْلًا﴾.

لـە دوای بـەیانی تێکـچوونی ئـەم عالەمـە ئیـشارەی بـۆ دەکـات وەختێـك کـە زیندوودەکرێنـەوە دەبرێنـە بـەردەم دادگـای خـودا دەفـەرموێت: لـە ئـاوا رۆژێکـدا شـەفاعەت و تکـا هـیچ سـوودێکی نیـە وە لـە هـیچ کەسـەوە دەرد نـاخوا ئەگـەر شەفاعەت بکات تکا بکات مەگەر کەسێك کە خودا ئیزنی بدات.

جا لێرە

١- خودا خۆی دیاری دەکات کێیە.

٢- جۆری دوعایەکەی بۆ دیاری دەکرێت چی بڵێ.

ئەم ئایەتەش وەك ئەم دوو ئایەتی ترە لێرەش دەکرێ کەسێك بڵـێ شـەفاعەت هەیە کاتێك خودا ئیزنی دا، جـا لێـرەش بینـشێك ناکـەین هـەر چـەندە ئیستـسناکە زیاتر تەوزیح دەدات.

﴿إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَرَضِيَ لَهُۥ قَوْلًا ﴾.

ئەمە زیاد کراوە.

تەوزیعێك بۆ ئەوانەی دڵیان خۆش دەكەن باوەڕیان وایە كە كەسانێك لە قیامەت دەبن بە شەفیعیان بۆ ئەوەی ئومێدی ئەوانە ببڕێت.

﴿ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴾.

هەرچی لەبەر دەستیانە ئەوانەی واگومان دەكەن كە شەفاعەت بكەن وەئەوانەی خودا ئیجازەیان پێ دەدات، بیكەن هەرچی لەبەر دەستیانە لەوەی مەعلومە بۆیان لە گوزەشتە كەبوە بە شەهادە بۆیان لە پشتی سەریاندایە غەیبە و لە ئایندەیانە كە پێیان نەزانیوە، جا هیچ ئومێدێك نیە لەم زەمینەیە كەبتوانن كارێك بكەن وەك تكا كار.

هەر چیەك هەیە لە علمی خودا یە ئەگەر نا هیچی لێ نازانن دڵخۆش نەكەن بە كەس كە شەفیعتان بن لەلای خودا.

هەروەها خودای گەورە لە سورەتی (مریم) ئایەتی ٨٧ دەفەرموێت :

﴿لَّا يَمْلِكُونَ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَنِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَٰنِ عَهْدًا ﴾.

لە پێشدا دەفەرموێت ئەو ڕۆژە كە خەڵكان كۆ دەبنەوە دەیانبەنە بەردەم دادگای خودا هەروەها لەو ڕۆژە موجرمەكان لێدەخورێن بەرەو دۆزەخ.

وشەی (ورد) لە مصدری (ورود) ئەسڵی ئەوەیە كە ئینسان بچێتە سەر ئاوێك.

لێرە بە شێوەی ئیستهزا وشەی (ورد) بۆ ئەوان بەكار دەبا كە ئەم دۆزەخە ئاوێكە ئامادەمانكردووە بۆ ئەوان تا ئەوان بچنە سەری، كە ئاو نیە ئاگرە لە دوایی دەفەرموێت: هیچ كام لەوان دەسەڵاتی هیچ جۆرە شەفاعەتێكیان نیە مەگەر

کەسێك کە عەهد و پەیمانێکی لای خودا ی رەحمان ببێ یانی پێشینەیەك لە دونیا کە ئیزنی ئەوەی بدا.

ئەمەش هەروەها دوو ئیحتمالی هەیە:

١- کەسانێك ببن پێشینەیەکیان هەبێ لە دونیا _ گەیشتن بە مەرتەبەی شەهید_ بەڵکو خودا ئیزنیان بدا شەفاعەت بکەن ( ئەم شەفاعەتەی باسمان کرد وەکو دوعا) .

٢- غەیری ئەو کەسەی لە خودای رەحمان عەهدێکی وەرنەگرتبێت کەسی تر ناتوانێ شەفاعەت بکات.

دەی خۆ کەسێك نیە عەهدێکی لەم زەمینەیەدا سەندبێ کەوا بوو بۆ هیچ کەس شەفاعەت نیە.

لێرەش ماوە هێشتا بە تەواوی فەهم ناکرێتت.

خودای گەورە لە سورەتی (نجم) ئایەتی ٢٦ دەفەرموێتت :

﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغۡنِي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ أَن يَأۡذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرۡضَىٰٓ﴾.

چەند مەلائیکەت وان لە ئاسماندا کە تکایان هیچ ئیستفادەیەکی نیە مەگەر دوای ئەوەی کە خودا ئیزن بدات بۆ کەسێك کە بیەوێ و رازی بێت.

ئەلێرەش زیکری ئەمە دەکات مەگەر بە ئیزنی خودا مەترەح دەکرێ، لێرەش هەم دوو ئیحتیمال مەترەحە.

١- مەگەر دوایی بە ئیزن و ئیجازەی خودا ئەوان کارێك بکەن. خۆ ئەویش ئیجازە نادات بەهیچ جۆرە قسەیەك، لەم زەمینە دا مەترەح نیە.

٢- ئەوە هیچ شەفاعەت و تکایەك لە رێی مەلائیکەتەوەش نیە.

خودای گەورە لە سورەتی (نبأ) لە ئایەتی ٣٧و ٣٨ دەفەرموێت :

﴿رَّبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا ٱلرَّحۡمَٰنِۖ لَا يَمۡلِكُونَ مِنۡهُ خِطَابٗا (٣٧) يَوۡمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ صَفّٗاۖ لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنۡ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَقَالَ صَوَابٗا (٣٨)﴾.

لە دوای ئەمە کە سەرەنجامی جەزا و پاداشت ئەکا لە کۆتایی بەیانی پاداشتی لەخوا ترسان دەفەرموێت : کە ئەمە پاداشت و جەزایە لە تەرەف خاوەنە کەت، دەفەرموێت، خاوەنی ئاسمانەکاتن و زەوی و هەرچی لە بەینیاندایە مەگەر هەر خۆی کەیفیەت و کەمیەتی رەحمەتی خۆی بزانێ کە هیچ کەس دەسەڵاتی ئەوەی نیە لە رۆژێکی ئاوا لە رۆژێك کە (جبرائیل) و مەلائیکەت (صف-صف) دەستە دەستە رادەوەستن لە حزوری (رب العالمین) هیچ کامیان قسە ناکەن مەگەر کەسێك کە خودا ی رەحمان ئیزنی بدا ئەویش قسەی دروست بکات (صواب).

بۆ نمونە / (صواب) ئەوەیە دوعای خێر بۆ کەسێك بکرێتت کە شایستەی ئەم دوعایەیە.

بۆ نمونە / لە تەحریمی خوێن بە شێوەی (مطلق) تەواو نەفی خوێن دەکات، بەڵام چۆن لە دوایدا جگەر و سپل جائزە بخورێ.

لێرە وشەیەك هەیە لەبەر چاو (زاهرا) گشتیە.

قاعیدەیەك لە مەوردی فەهمی شتێك لە عیبارەتێك وشەیەك گشتی تێدابێت، لە زەمینەی تایبەتی شتێك کە گشتی بێت بە ئیستسنای هەندێ کەس لە گشتیە.

بۆ نمونە / لە شوێنێك شتێك بە قاعیدەی گشتی بەیان دەکرێت، لە دوایدا ئایا بە چ شەرائتێك دەتوانین هەندێك لە کەسەکان لەمە ئیستسنا(جیا) بکەین کە نەیانکەینە ئەوەی ئەم قاعیدەیە بیانگرێتەوە کە ئەو وشەی گشتیەی تێدا باس کراوە.

قاعدەکە ئەمەیە کە ئەگەر هاتوو لەفزێك گشتی لە عبارەتێکدا باس کرا، لە دوایی بە دەلیلێك دەرکەوت کە تەواوی خەڵك بەم لەفزە مەقسود نین، ئەبێت بگەڕێین بە شوێن زابتەیەك کە بۆچی ئەم لەفزە گشتی یە تەواوی خەڵك ناگرێتەوە.

بۆ نمونە / لە حەرام کردنی خوێنی ئاژەڵ لەو ئایەتانەی خوای گەورە دەفەرموێت: لەسەرتان حەرام کراوە مردار و خوێن و گۆشتی بەراز و ئەوەی بە ناوی غەیری خوداوە سەر دەبڕدرێت. لەویَ لە سیَ جێگە لە ئایەتەکاندا بە شێوەی (مطلق) تەواو زاهری حەرام دەکات دەی چۆن لە دوایدا جگەر و سپل کە خوێنە جائزە بخورێن، بۆ ئیستسنا بوون لەم شتە گشتی یە ئەوا وشەی خوێن دەبیَ تەواوی (مشتقات)ی خوێن بگرێتەوە کە جگەرو سپلیش بگرێتەوە، بەلاَم چۆن ئەوان ناکەونە بەر حوکمی تەحریمەوە ئەمە لێرە وشەیەکمان هەیە (زاهرا) حەرامە، بەلاَم هەندێك لە مراد لێی بەدەرن ئەبیَ بگەڕێین بە شوێن شتێك حەتمەن لێرە شتێك کە ئەگەریش (زاهرا) نەمان دیبیَ دەبیَ دیقەت بکەین بیدۆزینەوە کە زابتەیەك ببێت لەم زەمینەیە، بە پێی ئەو زابتە ئەسڵەن هەر لە یەکەمەوە ئەو کەسە هەر موراد نەبوو فەقەت لەبەر چاو وا دیار بوو موورادن.

بۆ نمونە / لە حەرام کردنی خوێن

وەختێك تەماشای یەکەم ئایەتێك دەکەین لەم زەمینە کە نازلَ بووە لە سورەتی (انعام) دا تەماشا دەکەین وشەی (دم) بە (نکرە) بەیان دەکات (الدم) (وقف)ێکی بۆ زکر دەکات یانی خوێنی ڕژێنراو، ئەمجارە لەم سیَ سورەی تردا (بقرە – مائدە– نحل) بە (ال) بۆ (عهد)ە وەك بلێی پیاوێك هاتە لام یان پیاوەکە هەڵسا لێرەش. دەفەرموێت (الدم) خوێنەکە، خوێنەکە چیە؟ (دما مسفوحا) خوێنی ڕژێنراو نەك گشت خوێنێك، کەواتە تەماشا دەکەین هەر لە یەکەم حوکمی تەحریم

نازڵ نەبوو بەس جگەر و سپل ئا ئەوەیە ئەم دوانە حوکمی تریان هەیە (حرام) نین (حلال)ن.

ئەم مەسەلەی تایبەت کردنی هەندێك لە تاکەکانی گشتی بەدەر بکرێت لێی حوکمێکی تر سابت بێت، ئەبێ بگەڕێین بە شوێن شتێك بزانین زابتەیەك قاعدەیەك قەیدێك شتێك هەیە کە تەواوی خەڵك لەو گشتیە ناگیرێت، ئا ئەم زابتە گشتیە نایگرێتەوە جا بە پێی ئەوە لەم زەمینەدا ئاوا دەبێت لە زەمینەی شەفاعەت.

لە پێشدا بە شێوەی گشتی دەفەرموێت: کە شەفاعەت ولایەت نیە وە لە چەند ئایەتێکیش بە قەیدی (الا بإذنه) کە دەکرێت یەکێك لەم دوو ئیحتمالە فەهم بکرێتت ئەمە ئەگەیەنێت کە لە جهەتی غەیری خوداوە شەفاعەت ولایەت نیە.

جا ماوەتەوە بزانین لە جهەتی غەیری خوداوە ببێت یان نەبێت ئەوە مەوردی باسە.

وەختێك دەگەینە ئەو ئایەتانەی کە قەیدی ( من دون) یان تێدایە لە جهەتی غەیری خوداوە شەفاعەت ولایەت نیە، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ ئەو ئایەتانەی بە شێوەی (مطلق) نەفی شەفاعەتی کردووە.

بۆ نمونە / ئایەتی ٢٥٤ ی سورەتی (بقره) بە شێوەی (مطلق) نەفی شەفاعەتی کردووە، بزانین لە خودی ئایەتەکە دەبێت شتێك فەهم بکرێتت، ناکرێتت قورئان لە جێیەك شتێك نەفی بکات هیچ قەید و شەرتێکی تێدا نەبێت وە لە دوایی لە جێیەکی تر تایبەتی بکاتەوە، دەبێت لە خودی ئەم ئایەتە شتێك بێت ئیجازەی تایبەتمەندی ئیستسنا بۆ دوایی بکات کە دەفەرموێت (ولا شفاعه) شەفاعەت یانی ئینسان دڵی بۆ ئەوە بروات کە لە ڕۆژی دوایی یەکێك تکای بۆ دەکات ودەبێتەواستەی و رزگاری دەکات، بەم شێوە نیە، بەڵام ئەوەی کە دوایی باسی دەکەین کە ئیستسنا هەیە فەقەت ناوەکەی شەفاعەتە.

بۆ زیاتر تەوزیع لەم زەمینەیە دووبارە سەر دەدەینەوە لە ئایەتی ٨٦ لە سورەتی (زخرف) هەروەها یەك دوو ئایەت بەر لە ئەو لەو چەند ئایەتە ئیشارەت کراوە بۆ ئەوە کە کەسانێك ئەکرێ ببن کە خودا ئیزنیان پێ بدات بۆ شەفاعەت بۆ کەسانێك کە خودا لێیان خۆشبووە جا ئەوان لەم زەمینە دا شەفاعەت بکەن.

ئایەتی ١٠٩ سورەتی (طه)

﴿إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَرَضِيَ لَهُۥ قَوْلًا﴾.

ئایەتی ٨٧ لە سورەتی (مریم)

﴿إِلَّا مَنِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَٰنِ عَهْدًا﴾.

ئایەتی ٨٦ سورەتی (زخرف)

﴿إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾.

ایه ٢٦ سورەتی نجم: ﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغْنِي شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ﴾.

بە تەوجیهی دەلیلە قاطعەکە کە گوتمان لەسورەتی (فصلت) ئایەتی ٣١ دا هەیە ئەم ئایەتانە ئاوایان لێ فەهم دەکرێ.

ئایەتی ١٠٩ سورەتی (طه): ﴿إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَرَضِيَ لَهُۥ قَوْلًا﴾.

ئەگەیەنێت کە کەسانێك لە بەندەکانی خودا کە خودا ئیزنیان بدات وە خودا خۆی دابنێ بۆیان نەوعێك لە دوعابکەن وە ئەوانیش ئەم کارە دەکەن.

ئایەتی ٨٧ سورەتی (مریم): ﴿إِلَّا مَنِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَٰنِ عَهْدًا﴾.

بەیان دەکات کە ئەو کەسانە کەسانێکن عەهدێکیان لەگەڵ خودا بێت، پێشتر پەیمانێکیان لە خودا سەندبێت، کە لەسەر ئەم پەیمانە بتوانن ئەم کارە بکەن.

ئایەتی ٨٦ سورەتی (زخرف): ﴿إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلۡحَقِّ وَهُمۡ یَعۡلَمُونَ﴾.

بەیان دەکات کە ئەم پەیمان و عەهدە عەهدی شەهادەت بە حەق لە رووی عیلمەوە یانی کەسانێك کە شەهادەت بە حەقیان لە رووی علمەوە دابێ گەیشتونە دەرەجەی شەهید، بۆمان عەهدیان لە خودا سەندووە یانی خودا قسەی بەمانە داوە کە لە رۆژی قیامەت دوای تەواو بوونی دادگا لە سنورێك کە خودا خۆی دیاری دەکات رێگە بە کەسانێك دەدات کە دوعای خێر بکەن بۆ کەسانێك کە شایستەی ئەو دوعایەن.

ئایەتی ٢٦ سورەتی (نجم): ﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغۡنِي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ أَن يَأۡذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرۡضَىٰٓ﴾.

یەكێك لەمانەی تەسریح کردووە کە مەلائیکەتن چۆن لە ئایەتی ١٨ی سورەتی (ال عمران) بەیانکرا ئەوانەی شەهادەت بە حەق دەدەن یەکەم خودا خۆی وە مەلائیکەت وە اول العلم لە جن وانس غەیری ئەوان کە خودا ئیزن و رەزای بێ، کە ئەوانەن وا عەهدیان لە خودا سەندووە کە عەهدەکەیان عبارەت بەوە شەهادەت بە حەقیان دابێ لە رووی تەوحیدەوە اول العلم بن وە بەشێك لەمانە مەلائیکەتن بۆمان ئیجازەی دوعای خێریان دەبێ، خودا خۆیشی بەر لە گشت کەس وەك لە ئایەتی ٤٤ لە سورەتی (زمر) ( قل لله شفاعة جميعا ) خودا لە دەستی خۆیەتی شەفاعەت، ئەو شەهید و شاهدیە کە دەمێنێتەوە بۆ غەیری خودا یە اول العلم لە جن وانس وە ئەوانەش وا گەیشتونە دەرەجەی شەهادەت بە حەق بە علمەوە ئەوانیش شەفاعەتیان دەبێ بە مانای دوعا چونکە لە ئایەتی ٦٩ ی سورەتی (نساء) ئیمانداران دەکرێن بە چوار بەشەوە ( نبيين – صديقيين– شهداء – صالحين)

جارێ قاعدەیەکمان هەیە وەختێك چەند کەسێك لە سیفەتێکدا وەك یەکن، بەڵام وەختێك بمانەوێ لە یەکیان جیا بکەینەوە جارێ ئەو کەسەیان کە سیفەتی زیادەی نیە هەر بەو ناوە بانگی دەکەین، بەڵام ئەوەی سیفەتی زیادەی هەیە لەسەر ئەمە بەو سیفەتە بانگی دەکەین.

بۆ نمونە / کۆمەڵە پیاوێك لەو شوێنێکن یەکێکیان دکتۆرە یەکێکی تریان ئەندازیارە ئەوانی تر سیفەتی تایبەتیان نیە، جا بۆ ناوهێنانیان پیاوە دکتۆرەکە بە دکتۆر بانگ دەکرێ وە ئەندازیارەکە بە ئەندازیار بانگ دەکرێ، بەڵام ئەوانی تر لەبەر ئەوەی سیفەتی جیا کەرەوەیان نیە هەر بە پیاو بانگ دەکرێن.

بۆ نمونە / تەواوی ئەوانەی کە مشرکن بە مشرك ناویان دەبەین، بەڵام ئەوانەی ئەهلی کتابن بە مشرك ناویان نابەین بە وجودی ئەوەی کە مشرکن، بەڵام بە سیفەتە تایبەتەکەیان کە ئەهلی کتابن ناویان دەبەین هەرچەندە مشرکیشن.

دەی (نبیین) صالح هەن شەهیدیش هەن، بەڵکو لەمانە زیاتر تیایانهەیە بەم سیفەتە ناو دەبرێن.

وە (صدیق) صالح و شەهید هەن، بەڵام بە سیفەتە ممتازەکەیان کە صدیقە ناو دەبردرێتن (شهید) صالح هەن ،بەڵام بەو سیفەتە ممتازەیان ناو دەبردرێتن، بەڵام (صالح) فەقەت ئەو سیفەتەیان هەیە بۆیان دەکرێ بە ناونیشان و ناوهێنانیان.

نبی : ئەوانەی لە رێگەی وەحیەوە هەوڵدەدەن بۆ هیدایەتی خەڵکی.

صدیق : صدیق (صیغە مبلاغە) بە ئەوانەی کە بەڕاستی راستیان وتوە لە روانگەی ئیمان وە لە ژیانیان رەنگدانەوەی پێوە دیارە.

شەهید : ئەمە کەسێك بە (قول و عقیدە) بە کارو کردەوەی لاالە الاالله شەهادەت بە تەوحید بدا لە هەموو ژیانی.

جا وەختێك كەسێك شەهادەت دەدات لێی قبوڵ دەكرێ، وەختێك ئەم كەسە بابەت گیری پێچەوانەی قسەكەی نەبێت.

كاتێك ئینسان دەڵێت ( اشهد ان لااله الا الله) لەو وەختە دروستە پێی بوترێ (شاهد)، هەروەك كەسێك لێدەدات پێی دەوترێ (ضارب)، كەسێك دەكوژێ پێی دەوترێ (قاتل)، كەسێك كۆمەك دەكات پێی دەوترێ (ناصر)، ئەگەر ئیدامەی نەصرەتەكەی داو بوو بە بەرنامەی پێی دەوترێ (نصير)

كەسێكیش یەكەمجار شەهادەتی بە تەوحید دا رووی كردە طاغوت و گوتی بزانن كە حەقی (الوهیة) هی خودایەو ئێوە حەقی ئەوەتان نیە، ئەمە ئیتر پێی دەوترێ (شاهد)، بەڵام ئیتر لەسەر ئەمە بەردەوام بوو رەنگی داوە لە ژیانی، پێی دەوترێ (شهید) ئیستا شەهید بە كەسێك دەڵێن كە بكوژرێ وە هەتا عبارەتی وا بەكار دەهێنن لە قورئاندا بۆ كوژران (قتل فی سبیل الله) بەكار هاتووە نەك (شەهادەت).

كەسێك كە وتی (اشهد ان لا الە الا الله) دوای ژیانی لەگەڵ گونجاند ئەوە شەهیدە.

ئەو شەهیدانە دەبن بەسێ بەشەوە :

١-نبیین ٢- صدیقین ٣- شهید..

دەی بۆمان چ لە مەلائیكە و چ لە مۆمنین ئا ئەو ئایەتەی ٨٦ لە سورەتی (زخرف) بەیانی كردووە دەیگەیەنێت بە كۆمەك، ئایەتی ٢١ لە سورەتی (فُصلت) بۆمان ئیجازەی دوعای خێریان دەدرێتێ لە قیامەتدا.

﴿إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلۡحَقِّ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ﴾.

كەسێك وا هاواریان لەبەر دەكرێ هیچیان لەبەر دەست نیە لە شەفاعەت، تەنیا كەسانێك شەهادەتی بە حەقی دابێ لە رووی عیلمەوە وە لەسەر ئەوە چووبوون،

بۆمان ئیجازەی دوعای خێریان پێ دەدرێت بۆ ئەو کەسانەی کە خودای گەورە ئیزنی بەهەشتی داون یان ئەوان شتێك ناگۆڕن لە بڕیاری خودا.

( مەسەلەی دقیق ئەمەیە لێرە)

جا شەهیدی هەر قەومێك بۆ قەومی خۆی / مثلا / محمد علیه الصلاة والسلام بۆ میللەتی خۆی وە هەر ئەمجارەی وا لە هەر عەسرێك ئەوانەی وا بەڕاستی شەهیدن ئەوانیش بۆ ئەو قەوم و کەس و کاری خۆی ئیجازەی دوعای خێری پێ دەدرێت وە مەلائیکە بۆ گشت مؤمنین، جا هیچ کەس بۆی نیە کەسێك دیاری بکات بۆ ئەوەی بڵێ ئەمە دوعام بۆ بکات لە قیامەت، هیچ کەس بۆی نیە ئەم وەسفانە بە (جزم) بەکار ببا چونکە خودای گەورە دەفەرموێت ﴿فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ﴾.

ئێوە خۆتان تەزکیەی خۆتان مەکەن هەر خودا دەزانێ کێ تەقوای هەیەو لە خوا ترساوە. کەوابوو ئێمە دەست نانێینە سەر کەسێك غەیری( نەبیین) وە غەیری( سابقین الاولین) لە مهاجرین و انصار لە ریگەیەك نەگوڕ رۆشن کرابێتەوە کە بۆمان فلان وەسفیان هەیە.

بەڵکو لە عەسرێك کەسانێك هەن (اتمام حجە)دەکەن بەسەر خەڵکیدا وە ئەوان مەفهومی شەهید تێیان دا (تحقیق) دەکات بۆمان، هەر کام پەیوەندی لەگەڵ ئەو قەومی خۆیان دا هەیە کە لە دوایاندا، کە لە دوای ئەمە کاری دادگا تەواو بوو بۆ ئەوەی ئەوانیش عەلاقەیەکی روحیان بە نیسبەت بەم تەرتیبە دراون خوداش ئیجازەیان دەدا کە ئەو عەلاقەی خۆیان دەردەبڕن، داوا دەکەن خودایە ئەوەی شایستەی لێخۆشبوونە بی بەخشە، دەقەکە ئاوای لێ دێ ( کە خودایە خۆت بڕیارت داوە بیبەخشی منیش حەز دەکەم بیبەخشی) حەقیقەتی شەفاعەتی دوعا

ئەمەیە هەتا دوعای خێری دونیـاش ئاوایـە، ئـەوە نیـە کـە مەلائیکـەت دوعـای خێـر دەکەن بۆ مؤمنین ﴿لِلَّذِينَ تَابُوا۟ وَاتَّبَعُوا۟ سَبِيلَكَ﴾ دوعا دەکەن.

دەی کەسێك تۆبەی کردووە رێگەی غەیری خودای بەرداوە خودا وەعدەی داوە لێی خۆش بیّ ئێستا مەلائیکەش ئەمە دەڵێن ( یانی خودایە هـەرخۆت بریـارت داوە لەوە خۆش بی منیش پێم خۆشە رازیم بەم بریارەت ) یـانی هـیچ گۆڕانکارییـەك روو نادات تەنیا خودا لەبەر حکمەتێك کە خۆی دەیزانـیّ رەبتـی دوعـای ئـەم شـەهیدانە دەدات. ئەمە قاعیدەی شـەفاعەت جـۆری یەکـەمی باسمـان کـرد بـاوەڕ بـوون پێـی شرکی گەورەیە و هیچ مؤمنێك نابیّ باوەڕ بەمە بکات، کە داخەکەم ئەمڕۆ زۆرێك لـە مسوڵمانان تووشی ئەمە بوون.

بەڵام دووەمینەکەیان تەماشا دەکـەین ئیجـازەی دوعـای خێـر کـە بـۆ کەسـانێك مستەحەقی ئەم دوعایەن، دوای ئەمە کە کاری دادگا تەواو بوو بیّ ئەوەی لـە دونیـا کەس دیاری بکات، بڵیّ فلان دوعام بۆ دەکات، بیّ ئەم دیاری کردنە، چـونکە بـەس خودا دەزانیّ کیّ شایستەیە ئەم دوعایە بکات.

جا لێرە بووە بە شتێکی فەرعی کـە ئیجـازە بـدرێت بـە کەسـانێك دوعـای خێـر بکەن شتێك عەقیدە نیە لە مەسائیلی ئەسڵی عەقیدە نیە.

احادیثی زۆریش هەن لەم زەمینە کە بەعزێکیان خراپ فەهم دەکرێت.

بۆ نمونە / حەدیثێك هەیە ( شفاعتی لأهل الکبائر من أمته) شەفاعەتم بۆ ئەهلی گوناحە گـەورەکان لـە ئومـەتم. دەقیـق فـەهمیان نـەکردووە، کـەخودای گـەورە لـە ئایەتی ١٧–١٨ ی سورەتی نساء بەیانی کردووە کە کەسانێك وا لەسـەر (سـیئات) بن تا نزیکی مەرگیان وەختێك ئیتر هیچ رێگەیان نەماوە دەست کەنە تەوبە وە ئیتر تۆبەیان لیّ قبولّ ناکرێت، بەس ئەهلی کەبائر کەسانێکیان دەکەونە بـەر شـەفاعەت تووشی کەبیرە بووبن، بەڵام تەوبەیان کردوە، ئەوەی لە سورەی فرقان لە کۆتـایی

دەفەرموێت کە (عبادالرحمن) نە توشی عبادەتی غـەیری خـودا دەبـن وە نەتووشـی قەتلی بە غەیری حەق دەبن وە نەتووشی زینا دەبن ئەگەر هەر کەسێك تووشی هەر کـام لەمانـە بێـت ئـەوا تووشـی گونـاح و تاوانێـك بـوو ئەیخاتـە دواوە، لەبـەر ئـەوە ئستسنا دەکات دەفەرموێت :

﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ﴾، بێجگە لەوانـەی لـە دوای ئـەوەی تووشـی یـەکێ لـەو سـێ کـارە بـوون تۆبەیان کـردووە و ئیمانیـان هێنـاو کـردەوەی پاکیـان ئەنجامداوە ئەوانـە نەتـەنها گوناحەکەیان خودا چاوپۆشی لێدەکات، بەڵکو دەیگۆڕێت بە چاکە.

دەی ئا بۆمانن مستەحەقی شەفاعەتن یەعنی کەسێك تووشی کەبیرە ببێ لەوەو دوا تـەوبە بکـاتو بگەڕێتـەوە خـودا خـۆی وەعـدەی لێخۆشبوونی پێـداوە، ئیجـازە دەدرێت بە پێغەمبەری خـوداش علیـه الـصلاة والـسلام دوعـای لێخۆشـبوونیان بـۆ بکات. نەك کەسێك کە لەسەر (کـەبیرە) چـووبێ تـا ئـاخر، ئـاوا نیـە کـە خـودا لێـی خۆش بێ وە لە نەتیجە هیچ کەسێك ڕێگە نادرێت دوعای بۆ بکەن.

وە کەسانێکیش نەفی دەکەن (اجتهاد)یان بەوەیە کەوا دەزانـن ئـەم استثنایانـە مەفهومێکی تریان هەیە ئەو وەختـە ڕەبتـی ئایـەتی سـورەتی (فـصلت) نایـدەن بـە ئەوانەوە کە نایزانن بۆ چی نایدەن.

﴿ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ﴾، کـە دەلیلـی قاتعـە، لەمـە کێشە نیە چون لە مەسەلەی ئەساسی عەقیدە نیە.

بەڵام ئاگـادار بـن ئـەو شـەفاعەتەی باسمـان کـرد کـە بـاوەڕ بـوون پێـی شـرکی گەورەیە ئەمە لە مەسەلەی عەقیدەیـەو بـاوەڕ بـوون پێـی تـاوانێکی گەورەیـە، کـە ئەویش شرکی گەورەیە، خوداش قەت لە شرك خۆش نابێت.

بەڵام لەوەیان مایەی ئەوە نیە بیکەینە (اختلاف) کەسێك بڵێ خودا رێگە بە هیچ کەس نادا دوعای خێر بکات لە رۆژی دوایی وە کەسێك بڵێ رێگە دەدات ئەمە نابێتە لختلاف ئەم وا بزانێ ئەویان گومڕا بووە وە ئەویان وابزانێ ئەمیان گومڕا بوە، نا.

بەڵام ئەوانەی شەفاعەتیان بۆ دەکرێت،

٢٣ سبأ ﴿وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ﴾.

شەفاعەت لەلای خودا بۆ هیچ کەس سودی نیە مەگەر بۆ کەسێك کە خودا ئیجازەی پێ بدا.

٢٦ نجم ﴿إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ﴾.

کە ئەبێ خودا رازی بێت بۆ ئەوە تا دوعای بۆ بکرێت.

﴿لَا يَسْبِقُونَهُۥ بِٱلْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِۦ يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ مُشْفِقُونَ ﴿٢٨﴾﴾ (انبیاء: ٢٧ـ٢٨).

لە بارەی مەلائیکەوە کە جوابی عقیدەی مشرکین کە ئەیانکەن بە کوری خودا، چینێك بەیان دەکات کە بەندەی بەرێزی خودان وە بە فەرمانی ئەو کار دەکەن وە هەرچی لەبەر دەست و پشت سەریاندایە خودا دەیزانێ رابردوو ئایندەیان وە بۆ غەیری کەسێك کە ئەو رازی بێت تکا ناکەن لێرەش بەیانی کردووە کە ئەو کەسەی دوعای بۆ دەکرێ دەبێ لەوانە بێ خودا لێی رازی بێت.

﴿وَلَا يَمْلِكُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ (زخرف: ٨٦).

ئەو کەسانەی وا ئەوانەی هاواریان لێدەکەن غەیری خودا هیچ کامیان دەسەڵاتی شەفاعەتی نیە، مەگەر کەسێك کە شهادەتی بە حەقی دابێ وە بە ئاگایی و لە رووی علم و زانستەوە ئەم شهادەتەی دابێ.

بۆ تەوزیعی ئەمەی کێیە شەهادەی بە حەقی دابێ بە عیلمەوە.

﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْعِلْمِ قَآئِمًۢا بِٱلْقِسْطِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ (ال عمران: ١٨).

لەوێ سێ دەستە لە شهداء بەیان دەکرێ بەر لە گشتێك بۆ خودا خۆی شاهیدە شهیدە بە توحید دوای ئەوە (مەلائکە) دوای ئەوە (اول العلم) لە (جن و انس) شەهادەتیان داوە کە کەس غەیری خودا جەلبی نەفع و دەفعی زەرەری نیە، شەهادەتیان داوە بەم حەقە ئەمە حەقەکەیە کە لە ئایەتی ٨٦ سورەتی (زخرف) دا دەفەرموێت: بەوەی کە خودا بە هەر کەسێك بەشی رێکی خۆی پێداوە لە بەشی (امری تسخیری) وە لە (امری ابتلائی) و( تشریعی)) ئاوا بەرنامەیەکی داناوە کە ئەگەر مراعات بکرێت هەر کەس بەس رێکی خۆی بەو جۆرە پێی دەگات.

(تەوزیحێك لە اولو العلم)

علم وعالم لە قورئاندا غەیری ئەم مانایە یە کە لەلای خەڵکدا هەیە :

بۆ نمونە / لای خەڵك عالم ئەوەیە یەکێك لە عیلمەکان بزانێت.

بەڵام لە قورئاندا لە ئایەتی ٩ لەسورەتی (زمر) وە ئایەتێك بەر لە ئەو تەوزیع دراوە.

ئەهلی علم لە فەرهەنگی قورئاندا ئەو کەسانەن کە شەویان بە (قیام) و( سجود)ەوە دەگوزەرێنن، ئەوانەی کەحەقیان بۆ رۆشن بۆتەوەو مولتەزم بوون بە

حەق، ئیلتزامێکی وا کە ئاسایش و رەحەتیان پـێ تـەرك ئـەکات، هـەڵیان دەنـێ بـۆ ئەوەی تەحەمولی ناخۆشی بکەن لە بەر رەزامەندی خودا.

اولو العلم – (الذین یعلمون) یان بۆ بەکار دەهێندرێت، نە ئەوەی لە رشـتەیەك زانستی ئیختصاصی بێت.

لە ئایەتی ١٨ ال عمران (اولو العلم )بۆ ئەو کەسانەیە بەراستی خودایان ناسـیوە وە شـهادەتیان بەمـە داوە، یـانی بـە تـەواوی وجودیـان لـە حـەیاتیان فکریـان بـە عەمەلیان ئـەو یـا داوە کـە خودایـە، هـەر ئـەو حەقـەی کـە لەئایـەتی ٨٦ سـورەتی (زخرف) دا دەفەرموێت :

بۆ ئەوەی رونتر بێت لە قورئان الولو العلم بە کێ دەوترێ :

ئایەتی ٨–٩ (زمر)

﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعْمَةً مِّنْهُ نَسِىَ مَا كَانَ يَدْعُوٓاْ إِلَيْهِ مِن قَبْلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلًا ۖ إِنَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ ﴿٨﴾ أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ وَيَرْجُواْ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ۗ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٩﴾﴾.

لە پێشدا بەیانی بێ سەباتی ئینسان دەکات کە وەختێك توشـی زیانێـك دەبێـت دەگەڕێتەوە بۆ لای خوداو هاواری لێ دەکات، بـەڵام وەختێـك کـە خـودا نعمـەتێکی پێ دەدا ئەو هاوارانەی کە لەوە وپێش کردبووی لە بیری دەچێتەوە و دێـت شـەریك بۆ خودا قەرار دەدا، لـە فـەرمانڕەوایی و فـەریاد رەسـی دا (الوهیـە – ربوبیـە) بـۆ ئەوەی خەڵك لە رێی خودا دەرکات هەرەشەی لێدەکات دەفەرموێت بە (مبلـغ) بڵـێ کەمێك بەرخوردار بە لە نەتیجەی کوفرەکـەت یـانی دەزانـین بـۆ حـەیاتی دونیـا بـۆ ئەوەی حەقت خستە پشت گوێ.

ئەم مووددەتە فرسەتە لە دەستی دەرنەچیٚ چونکە تۆ لە اصحابی ناری، لە ئاگر دوور ناکەویەوە، ئیتر دوایی لە دوای ئەمە قیاسێك باس دەکات، ئەریٚ ئەو کەسێك بە رەغبەتی خۆی لە درەنگی شەودا ساجدو قائمە ( جا ئەو مەسئەلەی (وقت) ی شەو لە ئایاتی تردا زۆر بەیانکراوە کە حەدی اقل نوێژی مەغریب و عیشایە، دوای ئەوەش نوێژی وەترە، کە لە دوای عیشا تا بەر لە نوێژی بەیانی لای کەمی یەك رەکاعەتە.

بە تایبەت بۆ ئینسانی داعی یەکەمجار بە شیوەی تەکلیف بۆی دەبێت کە قیام اليل بکات لە دوای ئەمە کە مەرحەلەیەك گوزەرا (تخفيف) دەبیٚ.

جا دەفەرموێت:

﴿ أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْآخِرَةَ وَيَرْجُوا۟ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ﴾.

ئایا کەسێك بەردەوام وە بەر ەغبەتی خۆی( قيام الليل)ی هەیە وە لە ئاخرەت حەزەر دەکات ئەمە وەك ئەوەبوو لە پێش دا بەیانمان کرد لە ئایەتی پێشوودا؟ نا.

﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾.

بلیٚ ئەوانەی کە دەزانن لەگەڵ ئەوانەی کە نازانن وەك یەکن.

کام بوون ئەوانەی کە دەزانن ئەوانەی شەو نوێژیان هەبوو.

﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ ئەوانە بوون کە فەرموی ﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ....... إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾.

تەنها ئەوانەی دارای (لوب) ن دارای عەقلی پاك، ئەوانەی بیر دەکەنەوە فەرقی ئەم دوانە دەردەکەن.

ئایاتێك کە( قطعا) ئەم مەسەلانەی پیٚ سابت دەکریٚ:

٣١ فصلت ﴿ نَحۡنُ أَوۡلِيَآؤُكُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ﴾.

مەلائیكەت لە زمنی ئەو قسانەی دەیكەن بە نسبەت بەوانەی استقامەیان لە رێگەی تەوحیدە لە زمنی ئەو بەشارەتانەدا دەیدەن، ئەوەش دەڵێن كە ئێمە هەم لە دونیا هەم لە ئاخرەت (اولیا)ی ئێوەین.

اولیاء : ولی یانی قەرار گرتنی دوو یان چەن شتی بە شوێن یەكدا بە بێ ئەوەی شتێك بێتە بەینیان، نە بێتە فاصیلە و رەبتیان بەیەكەوە بێت.

وەختێك ئاوا دوو یان چەند شتێ بە شوێن یەك قەراریان گرت بێ مانعە، یانی پەیوەندی نزیكیان بەیەكەوە هەیە.

دەر نەتیجە وەلی لە لوغەتی عەرەبی بەكاهێنراوە بۆهەر مەوجودێك یان هەر كەسێك لەگەڵ هەر كەسێكی تر دا راستی یەكی ببێت و نزیكیان بەیەك بێت.

بۆ نمونە / باوك لەگەڵ منداڵ پەیوەندی هەیە، پێی دەڵێن (ولی امر)

مۆمنین لەگەڵ یەكدا وەلی یەكن چونكە پەیوەندیەك لە بەینیاندا هەیە، نەهی لە منكر دەكەن ئەمر بە معروف دەكەن یان (مشتركن) لە نوێژ كردن .

وەلی لە قورئاندا، كەسێك بە ڕشتەیەك تایبەت بێت بە ئیدعایەكی تایبەتەوە، ئیتر وەلی یە هەتا وای لێهاتووە.

بۆ نمونە / بەعزێك لە علماء لە كتێبەكانیان نوسیویانە فلان كەس دەستێكی باڵای بووە لە ویلایەتدا وەك ئەوەی ولایەت علمی نحو خوێندن بووە كە دەستێكی باڵای بووبێ.

له حالێکدا له قورئاندا تەوزیح له مەوردی وەلی ئا بەم جۆره دەدات.

یونس ٦٢-٦٣-٦٤

﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ﴾.

ئەها ئەولیائی خودا نه ترسیان لەسەره نسبەت به ئاینده که ئەفعێکیان بۆ نیه یان زەرەرێکیان توش بێت وه ئەخەفەت دەخۆن نسبەت به گوزەشته هیچ نارەحەتیەکیان نیه ئەفعێکیان دەرچووه ئێستا ئاساری ئەوه ماوه ئینجا کێن ﴿أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ﴾ ئەوانەی ئیمانیان هێنا به ناسینی رێی خودا تەسلیم بوون، کەوتنه ناو ئارامی وه له حەیاتیان دا تەقوایان بوو، ئەوشتانەی خودا نەهی لێ کردبوون لەوانه خۆیان دەپاراست، بۆمان هەم له دونیا و هەم له ئاخرەت موژدەیان بۆ هەیه.

لێره پەیوەندی ﴿أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ﴾ و خودا بەم شێوه بەیانکراوه، له تەرەف بۆمان وه ئیمان وتەقوا له تەرەف خوداوه (بشری) له دونیا و ئاخرەت، له بەین هەر کەسێك و خودا ئاوا پەیوەندیەك بوو ئەوه وەلی یه.

جا له زەمینەی وەلی نابێ چینێك جیا بکرێتەوه بلێن ئەمه وەلی یه قسەی دەڕوا لەلای خوا ئەوه تاوانه.

جا قەرار وایه هەرچی (مؤمن)ه وەلی بێت، وەلی خودا بێت، ئەگەر وەلی نەبێ دەبێ مراجعەی ئیمانی بکاتەوه.

دەلیلی ئەمەیش ئەوەیه له مەوردی بەسەرهاتی قەومەکانی رابردوو قەومی نوح قەومی هود علیهم السلام وه غەیری ئەوان، وەختێك دەفەرموێت کافرەکانمان لەناو

برد وه ئەوانەی ئیمانیان بوو تەقوایان بوونەجاتمان دان دەفەرموێت ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴾ ئەوانمان رزگار کرد لە عەزاب.

خۆ لێرەش فەرموویەتی ﴿أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ﴾ ئەوانەن ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴾ دەی مەعنای ئەوەیە هەرچی پەیڕەوی ئەو پێغەمبەرانەیە علیهم السلام گشتی وەلی بووە. چونکە تەعریفەکەی ئەولیا کرا نەگۆڕە بەسەریان، کەوا بوو دەبێ هەرچی ئیمانداری راستەقینەیە وەلی بێت.

ئەگەر کەسێك وەلی نەبێت مانای ئەوەیە لە ئیمانەکەی (زوعف) هەیە، نەبوەتە مایەی تەقوای بەردەوام، دەبێ مراجەعەی خۆی بکات.

ئەمجارە کەسێك کە لەگەڵ خودا ئاوا پەیوەندیەکی پەیدا کرد لە لایەن ئەمەوە ئیمان و تەقوا، لە لایەن خوداوە (بشری) لە دونیاو قیامەت، جا ئیتر چەند ولا یەتێکیش لەمە سەرچاوە دەگرێ، (من دون الله) نیە لە تەرەف خوداوەیە،

لەگەڵ مەلائیکە کە عبادی خودان بەندەی بێ چون وچەرای خودان، پەیوەندی ولایەت بەرقەرار دەبێ.

٣١ فصلت: ﴿ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْآخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِيٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ ﴾.

لەگەڵ (مؤمنین)ی تر پەیوەندی وەلایەتی بەر قەرار دەبێ ٧١ التوبة:

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ ﴾.

جا ئێستا رابتەی اولیاء و مەلائیکە و مؤمنین چیە؟

٧-٨-٩ غافر گۆشەیەك لەم پەیوەندیە ولایەتە بەیان دەكرێت.

﴿ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيُؤۡمِنُونَ بِهِۦ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾.

ئەوانەی كە تەختی فەرمانڕەوایی خودا هەڵدەگرن، ئەوانەی لە دەوری بارەگای خودان ئەوانە( تسبیح و حمد)ی خاوەنەكەی خۆیان دەكەن و ئیمانیان هەیە و(استغفار) دەكەن بۆ ئەوانەی ئیمانیان هێناوە لە جن و انس.

استغفار بەم شێوە:

﴿رَبَّنَا وَسِعۡتَ كُلَّ شَيۡءٖ رَّحۡمَةٗ وَعِلۡمٗا فَٱغۡفِرۡ لِلَّذِينَ تَابُواْ وَٱتَّبَعُواْ سَبِيلَكَ وَقِهِمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ۝٧ رَبَّنَا وَأَدۡخِلۡهُمۡ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدتَّهُمۡ وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ۝٨ وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ يَوۡمَئِذٖ فَقَدۡ رَحِمۡتَهُۥۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ۝٩﴾.

لەم سێ ئایەتە گۆشەیەك لە پەیوەندی مەلائیكە لەگەڵ (مؤمنین) بەیان دەكرێت، داوای مەغفرەت بۆ ئیمانداران بەم شێوە دەكەن، خاوەنەكەمان رەحمەت و علمی تۆ بە هەموو شتێك گەییوە، جا تۆ داپۆشە گوناهی ئەوانەی گەڕانەوە بۆ رێگەی تۆ وە لە عەزابی ئاگری بڵێسە داری دۆزەخ بیانپارێزە، خاوەنەكەمان بیانبە ناو بەهەشتەكانی خۆت كە خۆت وەعدەت پێداون وە خۆیان لە( ئاباء و أزواج و ذریات)یان كە تۆ هەر شتێك ئرادەی بكەی دەیكەی هیچ شتێك رێت لێ ناگرێت وە لە ناخۆشیەكان بیانپارێزە بەراستی هەر كەس تۆ لەو رۆژە لە ناخۆشیەكان

بیپارێزی ئەوە رەحمت پێ کردووە بەزەییت پێدا هاتۆتـەوە وە ئـا ئەوەیـە دەسـت کەوتنی مەتڵەبی گەورە.

لێرە.مەلائکە لەگەڵ (مۆمنین) پەیوەندی بە بەشێوەی دوعا کردن کار دەکەن.

٣١ فصلت (ملائکە دەڵێن ئێمە هەم لە دونیا و هەم لە ئاخرەت وەلـی ئێـوەین ) یانی ولایەتی مەزهەری هەیە لە دوعـای مەلائیکەتـەکان وە مەزهـەری دوعـا وەکولـە غەزوەی بەدر مەلائیکە کۆمەکی مسوڵمانیان کرد.

هەر کەسێك دەڵێت ئیجازە بە مەلائیکە نادرێتت لە قیامەت دوعا بکەن با دەلیل بێنێ ئایەت بێنێ کە نیە.

لە زەمینەی پەیوەندی مۆمنین لە قیامەتدا:

٦٧ زخرف ﴿ ٱلۡأَخِلَّآءُ يَوۡمَئِذِۭ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾.

لەو رۆژە دۆستانی گیانی دوژمنی یەکن بێجگە لە بەین (مۆمنین)،

## ئەوانەی شەفاعەت نایانگرێتەوە:

١٨ غافر ﴿مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ حَمِيمٖ وَلَا شَفِيعٖ يُطَاعُ ﴾، ئەم رستە لە دوای بەقیەی ئایەتە مەتڵەبێکە، هەندێك دەڵێن لە مەوردی قیامەتدایـە بـە تـەوجوه بـە رەوەنـدی ئایەتەکانی لەوەو پێش کە لە مەوردی هلاکی دونیا لە دونیای اتمام حجـە دایـە، لـە دوای ئەو رستە ئەمە ئەفەرموێ: پێشەکەی ئەمەیە ﴿ وَأَنذِرۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡأٓزِفَةِ إِذِ ٱلۡقُلُوبُ لَدَى ٱلۡحَنَاجِرِ كَٰظِمِينَ ﴾ لەپێشدا فەرموویەتی کە هۆشدار بە رۆژی قیامەت بدرێت بە خەڵك، جا لێرەش دەفەرموێت وە هۆشداریشیان پێ بدە بۆ رۆژی ئـەو بەلایـەی کـە تەواو نزیکە.

(ازفه) ئەوەندە نزیکە کە وەختی تەنگ بۆتەوە زۆری نەماوە کە بێتە بەر، وەختێك کە لە داخا ئەوانەی وا گرفتاری بەڵا و ناخۆشی دەبن دەسەڵاتیان نیە کە دیفاع بکەن لە خۆیان وە هەرچی ئومێدیان بو گشتی رووخاوە، لە داخا دڵیان گەیشتە لای حەنجەرەیان هیچیان بۆ ناکرێت ئا لەوا رۆژێکدا ﴿مَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ﴾.

لە ئاوا رۆژێکدا بۆ زاڵم نە دۆست گیانی هەیە کە بگەیەتە فریایان وە نە تکا کار گوێی بۆ رادەگیرێ قسەی لێ وەربگیرێ.

جا هەرچی زاڵمە قەتاو قەت دوعای خێریان بۆ ناکرێت، بە پێی ئەو تەفسیرە دەڵێت (أزِفَه) بەڵایەکە لە دونیا نازڵ دەبێ دوای اتمام حجە هەر ئەو مەتڵەبەی ئێمە دەگەیەنێت وەختێك لە دونیادا بۆ هیلاکێك پێشەکی عەزابی قیامەتە، کە لە زۆرێك لە ئایاتی قورئاندا دەردەکەوێ لە دونیادا بۆ نەجات لەو هیلاکیە دوعای خێر و تکا و ناڵە بۆ زاڵم قبوڵ ناکرێتت، رۆشنە کە لە قیامەتیش لە دادگای خودا قبوڵ ناکرێت.

کەوابوو ئەوانەی ایجازەی دوعای خێریان بۆ دەکرێ غەیری زاڵمن.

جا بۆ ئەوەی بزانین غەیری زاڵم کێن ئەبی زوڵم و موشتەقاتی زوڵم لە قورئاندا ملاحەزە بکرێتت لە چی بەکار هاتوە، هەر کەسێك زوڵم راست بو بەسەری ئیتر ئیجازەی دوعای خێری بۆ نادرێت لە قیامەتدا، هەر کەسێك زوڵم راست نەبوو بەسەری ئیجازەی دوعای خێری بۆ دەدرێت.

بۆ نمونە / لە جێگەیەك خەڵك ئەکا بە سێ بەشەوە (سابقین بالخیرات – مقتصد – ظالم )

١-(مؤمنين) دەرەجە يەکەمن پێشڕەون، ئەکەونە بەر خەڵکی تر لە هەوڵدان لـە خێرو چاکە و مایەی سەعادەت و خۆشبەختیەوە.

٢-مقتصد : میانڕەوان ٣-زاڵمەکان لـە دوای چـەند ئایـەتێك لـەو تەقـسیمە بەیان دەکات، کە بۆمان وان لە دۆزەخ.

بە عبارەتێکی تر لە سورەی( واقعه) بەیان دەکات، کە سابقین عبـارەتن لەوانـە کە نزیکی بارەگای خودان، لەبەر ئەوە کە جوڵانەوەیەك وا لە جاهلیەت پەیدا بووە ئەوان پێشڕەو بوون ڕێیان ڕۆشن کردۆتەوە بۆ خەڵکی، دەرەجە دووش کە مقتـصد کەسانێکن کە بەشوێن سابقینن، لە دوای ئەمە کـە ئـەوان ڕێیـان ڕۆشـن کردۆتـەوە، چون پەیڕەوی ئەوان بوون. وە بە تەعبیرەکی تر (اصحاب اليمين)ن.

بەڵام بەشی سێیەم ئەوانەن کە لە سورەی واقیعە هەر لەو تەقسیمە کە ئـەیکات بە (ضالين مكذبين) ناویان دەبا کە جەزایان دۆزەخە، عەزابی ئەبەدی.

جا هەر لەم نمونە لە قورئاندا زۆر بەیانی حەقیقەتی زوڵم دەکات، دیاری کردنـی ئەوانەی زاڵمن کە ئینسان ئەکرێ بە جۆرێك لەو ئایاتە مراجعە بکات، مەعنای زاڵمی بۆرۆشن بێتەوە بزانێ زاڵم بە کێ دەوتـرێ لـە قورئـان وە دەر نەتیجـە بزانـێ کێیـە ئەوانەی ئیجازەی دوعای خێریان بۆ نادرێت.

بۆ نمونە / وەك لوقمان دەفەرموێت بە کوڕەکەی :

﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ لە مقەددمەی سورەتی لقمان ئەوەی کە تووشـی شرك بێت زاڵمە بە زوڵمێکی گەورە، ئیتر وا لە بانترین دەرەجەی زوڵمە.

دەی هەر کەسێکیش وە لەمەوپێش باسمان کرد خۆی شەفیعێك بۆ خۆی دیاری بکاتو بڕیار بدا کە کەسێك تکای بۆ دەکات، دەگاتە فەریای لە دادگای خودا، ئەوە توشی شرك بووە زاڵمە بە زوڵمی زۆر گەورە، ئەوانە ناکەونە بەر دوعای خێر.

کەوابوو تەنها کەسێك ئەکەوێتە بەر ئەم دوعای خێرە کە (مرتکب) توشی هیچ شیوەیەك لە شیوەی شرك نەبوبێ، بۆیە ئیجازەی دوعای خێری بۆ دەدرێت لەلایەن خوداوە.

هەروا خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾.

لێرە دیاری دەکات گوناحی شرك شایانی بەخشندە نیە لەبەر ئەوە ئیجازەی دوعای خێریش بە هیچ کەس نادرێت لەم زەمینەدا لە خواری ئەوە دەفەرموێت: بۆ هەر کەس کە ویستی مەغفرەت دەکات بە نسیب کە تووشی هەر گوناحێکی تر بووبێت.

هەروەك (مەشیئە) زۆر کەس لە غەیری ئەو مەعنا وا هەیەتی (اشتباه) دەکات یانی متوجه نابن، کە وەختێ خودای گەورە دەفەرموێت ﴿يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ﴾ یا ﴿يَهْدِى مَن يَشَآءُ﴾ یا ﴿يُضِلُّ مَن يَشَآءُ﴾ یا غەیری بۆمان پەیوەستی ئەکا بە مەشیئەتەوە یان هەروا بێ بەرنامەیە لە حاڵێکدا ئەگەر ئینسان کەمێك ورد بێتەوە لەو ئایەتانە دەورو بەری ئەم ئایەتانە کە ئەم وشەی تیا بەکار هاتووە بۆی رۆشن دەبێتەوە کە (مشیئە) لەسەر بەرنامە و نیزامێکە، خودای گەورە دەفەرموێت : من هەر کەس گەرەکم بوو تێری دەکەم وە هەر کەس گەرەکم بوو برسی دەکەم، بۆ ئەم گەرەك بوونە (اسباب)ی داناوە ئەگەر کەسێك( اسباب)ی تێربوونی جێبەجێ کرد خۆراکی خوارد خودا گەرەکیەتی ئەو تێر بێت.

مەگەر ( مشیئە)تێك تایبەت دەخالەت بکاتو تێر کردنی لە نانەکە بسێنێتەوە ) ئەگەر کەسێك ئەسبابی تێر بوونی فەراهەم نەکرد خوداش گەرەکیەتی کە ئەو کەسە برسی بێ، ئەگەر کەسێ حازر نەبوو کە گوێ بگرێ بۆ هیدایەت وە بە

ئیرادەی خۆی رێی خودای هەڵبژارد (خوداش گەرەکیە کە گومڕای بکات) ئەگەر کەسێك گوێی ئەگرت بۆ هیدایەت و ئیرادەی خودا حەقی هەڵبژارد خوداش گەرەکیە ئەو هیدایەت بدات.

وە مەعریفەت و عەزابیش هەر بەم شێوەیەیە:

﴿يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ﴾.

(مشيئة) مانای ئەوەی کە تۆ بە دوای ئەوەی حەقە نەکەوی کە بۆت رۆشن کراوەتەوە، دەی خودای گەورەش گەرەکیە عەزابت بدات.

بۆ نمونە / لێرە دەفەرموێت غەیری شرك ئەگەر کەسێك تووشی گوناحێکی تر بێ لێی خۆش دەبم ئەگەر گەرەکم بوو.

لە ئایەتی ١٧ و ١٨ ی سورەتی نساء: ﴿إِنَّمَا ٱلتَّوْبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٧﴾ وَلَيْسَتِ ٱلتَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ إِنِّى تُبْتُ ٱلْـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمْ كُفَّارٌ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٨﴾﴾. وەك باسمان کرد رۆشنی کردۆتەوە کە ئەوانەی وا تووشی گوناهی گەورەن ئەگەر زوو پەشیمان ببنەوە تەوبەیان کرد یانی مرتەکەبی بونە یان لە شوێنەواری فشاری غەریزە و شەهوەت و ئەوانەوە بوو لەلەحەزەی زوعفی بەشەرییە هەوای غەلەبەی کردە سەری وە تووشی کارێك لەم کارە گەورانە بوو، بەڵام لەعەینی حاڵدا تۆبەی کرد و پەشیمان بۆوە ئەمە لەوانەیە کەخودا لێی خۆش بێ.

بەڵام لە ئایەتی ٨ دەفەرموێت: ئەوانەی وا هەر گوناح ئەنجام دەدەن تا وەختێك مەرگیان نزیك دەبێت دەزانن تازە هیچیان پێ ناكرێت لەو كاتە تۆبە دەكەن، نە لەوانە تۆبە قبوڵ دەكەین وە نەلە كافرەكان، یانی لەگەڵ كافر لەلای یەك باسیان دەكات كەوابوو ئەوەی وا دەفەرموێت: ﴿يَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ﴾.

(مشیئە) ەكە لێرە نیشان كراوە بۆ ئەوانە نیە كە هەر لەسەر گوناحی گەورەن واز نایەنن تا نزیك بوونەوەی مەرگ كە دەزانن هیچیان لە دەست نایەت.

ئێستا بزانین ئەو شتەی كە لە بۆ( صحابە) دەڵێن (رضي الله عنه) وە بۆ ئەوانی تر دەڵێن (رحمه‌الله)

ئەمە علمای سەلەف مسوڵمان زانیویانە كە دەشێ هەر كەسێك چۆن مستەحەقە ئاوا دوعای خێری بۆ بكرێت لە قورئانیشدا تەماشایان كردووە خودا بۆ (صحابە) بۆ( سابقین الاولین) وە ئەوانەی(متبع بالاحسان)ن ئاوا فەرمویەتی من رازی بووم لێیان............ ئایەتی ١٠٠ سورەتی (توبە).

چۆن دەزانن خودا لەوان رازی بووە وەختێك ناوی كەسێك لە سابقین لە متبعین بالاحسان دینین دەڵێین (رضي الله عنه) یانی چی دوای ئەوە كە زانیویانە خودا لێیان رازی بووە بەڵامیش دوعا دەكەن كە خودا لێیان خۆش بێ.

ئەمە زۆر رۆشنە بۆ ئەوە كەسانێك (اشكال) بگرن بڵێن وەختێك كەسێك خودا لێی خۆش بووە ئیتر فائیدەی چی یە ئیجازەی دوعای خێری بۆ بدات توجە بەمە بكەن یان مەسەلەن بۆ فەرق لە بەینی صحابە و پێغەمبەران علیهم السلام تەماشا دەكەین، خودا لە مەوردی محمد علیە الصلاة والسلام دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ﴾ وەختێك زانیمان خودا صەڵاوات لەسەر ئەو

لێدەدات لە دوای ئەوە دەفەرموێت ئێوەش سەڵاوات بدەن ئەوانیش ئیتر (مؤمنین) صەلاوات لێدەدەن بە حەقی خۆیان زانیوە بە تەکلیف بۆ ئەو صەڵاوات لێبدەن نەك (رضي الله عنه) وە هەر کەسێك مستەحەقی هەر دوعای خێرێك بێت دەبێت لەو جۆرە دوعای خێری بۆ بکەن.

ئا بەم جۆرە بەیانی ئەسڵی شرك لە فەریادرەسدا، یانی ئومێد بە غەیری خودا پەیا کردن بۆ ( جلب النفع و دفع الضرر) وە هاوار لێکردنی لەسەر ئەم ئەساسە.

لە حەدیسێك کە ترمزی (رحمه الله) ریوایەتی دەکات وە دەرەجەی (حَسَن)ی پێ دەدات کە حەدیس لە لەحازی دەرەجاتەوە یا (صحیحه- یا حسن - یا ضعیفة-یا موضوع ) :

موضوع : ئەرزشی نیە کاری پێ ناکرێت.

ضعیف : بۆ ئەوە ناشێ استنادی پێوە بکرێت.

بەڵکو صحیح وحسن دەکرێ استنادیان پێ بکرێت.

بە تایبەت وەختێك ئەو مەوزوعەی وا حەدیسە کە بەیانی دەکات.

لە قورئاندا ئەسڵەکەی بەیان کرا بێت بە شیوەی تەبینێك بۆ گۆشەیەك لەوە تەوزیعێك لەمە پەیدا بکات استناد بە مە مناسبە.

لەم حەدیسە ریوایەت دەکات کە پێغەمبەری خودا علیه الصلاة والسلام فەرمووی :

(من حلف بغير الله فقد كفر او اشرك)

هەر کەس بە غەیری خودا سوێند بخوا، دووریوایەتە راویەکە کەوتۆتە (شَك) لێیان یان فەرموی (فقد كفر) یان فەرموی (فقد اشرك) ئەوا کافر بووە یان مشرك بووە یان یەکێکن، چونکە مشرکێك بۆی روونکرابێتەوە ئیتر دوای شرکەکەی هاوبەشە لەگەڵ کوفر ئەگەر وازی نەهێنا.

ئەمە مەوزوعێکە بەحس کراوە سوێند خواردن بە غەیری خودا کە چون لەبەر ئەمەیە تۆزێك( تعزیمی) تیایە، هەمیشە لە ناو( علماء) مەوردی باس بووە، بۆ نمونە (ابن مسعود) رەزای خودای لێ بێت یەکێکە لە سابقین دەڵێت: (ئەگەر من بە درۆ بڵێم بەخوا پێم ئاسانترە پێم خۆشترە بە راستی بڵێم بە پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام یا بەسەری فلان یان فلان).چونکە بە درۆ بڵێم بە خودا تووشی گوناحێك بووم، بەڵکو ئەگەر بە راستی بلێم بە پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام یان بەسەری فلان یان ئەوا تووشی نەوعێك لە شرك بوومە وە گوناحەکانی تر لە خواری شرکن، لەبەر ئەوە ئینسان دەبێ هەرگیز بە غەیری خودا سوێند نەخوات، بەلام بەعزە شتێك هەن بە شێوەی( تعضیم) ناڵێن تەنیا زمان لێی راهاتوە، وەك بە گیانم یان بە گیانی باوکم، بەلام بۆمانش نەڵێن باشە مەکروهن.

بۆ نمونە لە عەرەبی دەلێ ( لعمري) یا (لعمرك)

بەلام ئەوەی بە شێوەی بە گەورە زانین سوێندی پێ بخوات، ئەوا حەرامە نابێ بیکەی.

هەر لەم زەمینەدا حەدیسێك (امام بخاري رحمە اللە) لە کتێبەکەی (معتبر) ترین کتێبە لە کتوبی حەدیس ریوایەت دەکات کە پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام فەرمویەتی:

(من حلف باللاّة والعزى فليقل لا اله الا الله )

صەحابە جار جار لەبەر عادەتی پێشوویان بیدایەت لە دەمیان دەردەچوو دەیان گوت (والعزی) فەرموی: هەر کەسێك لە دەمی دەرچوو دوای تەجدیدی مسوڵمانیەتەکەی بکاتەوە، تەجدیدی تەوحیدەکەی بکاتەوە بڵێت: لا الە الا اللە چونکە ئەم سوێند خواردنە لەزمەی لێدەدات وە بۆ ئەمەی تۆڵەی بکاتەوە بڵێت: لااله الا الله.

(لە مەوردی خوێندنەوەی هەر شتێك لەسەر كەسێك وەختێك تووشی شتێك دەبێت دەچنە لای هەندێ كەس).

بۆ نمونە / بەنێك دێنن چەند دانە گرێ یەكی لێدەدەن لە هەر گرێ یەكدا شتێك دەخوێنێت بەوەی ئیتر نەخۆشەكە چاك دەبێت وە هەروەها لە دەورەی جاهیلی دەچوونە لای بەعزە مەشایخێك شتێكیان دەخوێندەوە بەسەر بەن و شتدا گرێیان دەدا بۆیان وەختێك موسڵمانەكاتن لە دوایدا كە مەسائیلیان بە وردی بۆ رۆشن كرایەوە لە قورئاندا لەم زەمینەدا سوئالیان بۆ دروست بو، پرسیان لە پێغەمبەری خودا علیه الصلاة والسلام كرد ئایا لەمانە دروستە ئێمە ئەنجامی بدەین یان نا؟ لە عەرەبی پێی دەگوترێ (رقیه) شتێك ئینسان بیخوێنێ بەسەر كەسێك بۆ ئەوەی خۆشبێتەوە و چاكبێتەوە، فەرموی: بیانهێنن بیخوێنن بزانم چۆنە (اعرضو عليَّ رقاكم لا بأس بالرُقى مالم تكن شركا ) صحيح مسلم لە كتێبی ژمارە دوولە كتابی حەدیس.

كە (حوص بن مالك) دەڵێ ئێمە لە جاهلیەتدا ئەم كارانەمان دەكرد وتومان بە پێغەمبەری خودا علیه الصلاة والسلام ئەی چۆنە فەرموی بیانهێنن بزانین چۆنە هەر كامیان شرك نەبوو قەیناكا.

یانی بیدیبا شتێك لە غەیری خودای تێدایە اعتماد دەكەنە سەر ئەوە كە خۆشیان پێ ببەخشێ و ناخۆشیان لەسەر لابات نەهی لێ دەكرد، وەختێك لە غەیری ئەوە بوایە، وەك داوا لە خوا بكات خودایە شفای پێدە، ئا لەمانە بۆمان ایجازە دەدا.

(یەكێكی تر لەو كارانەی كە زۆر تووشی دەبن مسوڵمانان حسێب گرتنەوەیە كابرایەك كتێبێك دێنێ كە ناوی دوانزە دانە ئەستێرەی تێدایە بە حساب بەیان دەكات ئەم گوزەشتە چی بەسەر هاتووە یان لە ئایندە چی بەسەر دێ ).

که حەدیسێك ابو داود بە سندی صحیح ریوایەتی کردووە ئەویش یەکێکە لە (علماء)ی گەورەی حەدیس.

(من اقتبس شعبة من النجوم فقد اقتبس شعبة من السحر).

هەر کەس یەك رشتە لە حسێب گرتنەوە لەسەر ئەساسی ناوی ئەستێرەکان وەری بگرێ قەبولّی بکات ئەمە لقێك لە شرکی وەرگرتووە

جا لەولاوەش لە مەوردی شرك امام بخاری رەحمەتی خودای لێ بێت ریوایەت دەکات کە دجالەی کوڕی عەبدە یەکێکە لە مسولّمانان دەلێت: عمر رەزای خودای لێ بێت نامەی بۆ نوسیم لە دەورەی خەلافەتی (اقتل کل ساحر وساحرة) هەرچی پیاوی ساحر و ژنی ساحرە بیانکوژە، ئنجا دیارە کوشتن هەروا بۆ شتێکی سوك و ئاسان ناوترێ.

بۆمان لەوانەیە خودای گەورە دەفەرموێت: دروستە کەسێك بکوژرێ یا بە قصاص یان فەساد لە زەوی بکات و بلاّوی بکاتەوە، کە ئەم سحرە (فساد في الارض)ە کەخەلیفە عمر رەزای خودای لێ بێت بینا لەسەر ئەمە دەستور دەدا کە هەرچی ساحر بوو بیکوژن، جا ئەو مسولّمانانە دەلّێن: ئێمەش دوای ئەوە سێ دانە ژنی ساحرمان دەس کەوت کوشتنمان.

دەی وەختێك ساحر ئەمە حالّیەتی حسێب گرتنەوەش لە سیحر دیارە مەنزلّەتی چۆنە وە ئەوەی دەچێتە لای ئەویش دیارە مەنزلّەتی چۆن دەبێت.

هەروا لە زەمینەی سحر، حسێب گرتنەوە بەشێکە لە سیحر، امام احمد وابن حبان رەحمەتی خودایان لێ بێت ریوایەت دەکەن کە پێغەمبەری خودا علیه الصلاة والسلام فەرمویەتی: (ثلاثة لا یدخلون الجنة مدمن الخمر و مصدّق بالسحر وقاطع رحم).

سێ گروپ هەن کە ناچنە بەهەشت ئەوانەی شەراب خۆرن بە بەردەوام تۆبە ناکەن وە ئەوانەی سحر بە راست دەزانن وە ئەوانەی هاتوچۆی خزم و کەس و کار ناکەن.

هەروەها امام مسلم رەحمەتی خودای لێ بێت ریوایەت دەکات پێغەمبەری خودا علیه الصلاة والسلام فەرموویەتی :

(من اتی عرّافا فسأله عن شئ فصدقه لم تقبل له صلاة اربعين يوما)

عراف : لەگەڵ کاهین نزیکن لە یەك، بە کەسێك دەڵێن ئدعا دەکات کە من شت دەزانم، بۆ نمونە لە ئایندەی ئێوەش دەزانم، ئاوات لێ دێت ئاوا مەکە،

کاهینیش ماناکەی نزیکی ئەمە، کەسانێك ئاوا قسە دەکەن لە مەسائیلە غەیبیەکان ئەوانەی کە دەڵێن ئێمە دەزانین لە ئایندەتان، جا دەفەرموێت: هەر کەسێك بچێتە لای عراف ێك شتێکی لێ بپرسێ دوایی باوەڕی پێ بکات چل رۆژ نوێژی لێ قبوڵ ناکرێت.

ئەگەر ئینسان کەمێك بیر بکاتەوە لەم حەدیسە دەزانێ ئەم مەسەلە چەند گەورەیە نوێژ کردن، خودای گەورە لە قورئاندا بەیانی کردووە کە نوێژ سەرچاوەی چاکەیە کە خراپە دادەماڵێ وەك لە ئاخری سورەتی هود دەفەرموێت :

﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ ۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾.

لە دوو سەری رۆژەوە بەیانی و عەسر چەند وەختێك لە شەو نوێژ بکە چونکە کارە چاکەکان خراپەکان لا دەبەن، نوێژیش سەری کارە چاکەکانە بۆیە خراپە لا دەبات.

دەی گوناحی چوونە لای (عراف) و باوەڕ پێکردنی پێی گوناحی ئەوەندە گەورەیە کە خودای گەورە گوێی بۆ ناگرێ چل رۆژ، چونکە توشی ئەوە بووە باوەڕ

به کەسێك دەکات کە دەڵێت غەیب دەزانم وە وتوومانە غەیب غەیری خودای گەورە کەس نایزانێ.

بەڵام دوای ئەم چل ڕۆژە ئەو کەسە تۆبەیەکی تەواو بکات لەم کارەی کە کردویەتی بەڵکە بچێ یەکسەر نوێژ بکات، ئەم نوێژانە نوێژێك نین لەسەر ئەساسی عەقیدەیەکی پاك و گونجاو دامەزرابێت، لەولاشەوە نوێژەکەی بە حسابی خۆی بۆ خودا دەکات.

ئەم حەدیسە ئاوا دەگەیەنێ ئەگەر تا چل ڕۆژ نوێژ دەکات نوێژەکە قبول ناکرێت، چونکە لەم زەمینە غەڵەتە ئەم نوێژەی کردووە، بەڵام بۆچی دوای چل ڕۆژ لێی قبول دەکرێ لە حاڵێکدا تۆبەش باس نەکراوە لەبەر ئەوە کەباسی ئەوە دەکات دەڵێت چل ڕۆژ نوێژی قەبول نابێ یانی تاوانێکی گەورەی کردووە دەبێ تۆبە بکات، ئنجا دوای ئەم چل ڕۆژە نوێژی لێ وەردەگیرێ.

بەڵکو کەسێك بەر لەو چل ڕۆژە بەهۆش خۆی هاتەوە تەوبەیەکی تەواوی کرد دیارە تۆبەش دەرگای کراوەیە خوداش قەبوڵی دەکات.

جا ئەوەی لە جێ یەك شتێکی گشتی بەیان دەکرێ مەقسود ئەوە نیە حەسر بکرێت، یانی ئەوەی ئەگەر شتێك بوو غەیری نوێژ پێش ئەو چل ڕۆژە توبە بکات ئەوە باشە ئەگەر نا گوناحەکە ئەوەندە گەورەیە کاتا تۆبە دەکات نوێژی چل ڕۆژی لێ قبول ناکرێت.

ئینجا لە دوای ئەوە عەقیدەی ڕاست بکاتەوە وە نوێژەکان لەسەر عەقیدەی تەواو دروست دەبێ.

(وە بەعزە شتێکی تر هەن بە شوم دەزانن، بو نمونە: دەنگی بەعزە پەلەوەرێك وە چاوپێکەوتنی بەعزە گیانلەبەرێك لە کاتی سەفەردا، هەتا لە ژمارە بەعزە

ژمارەیەك بە شوم دەزانن وە پژمە دەڵێن ئیتر سەبری هێنا لە کارەکە دەست هەڵدەگرن).

لەم زەمینەش حەدیسێك هەیە بە سەنەدێکی باش لە بەزار ریوایەت کراوە پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام فەرموویەتی :

( لیس منا من تطیّر او تطیر له او تکهّن او تکهِّنَ له او سحراو سحر لهُ )

لە ئێمە نیە کەسێك شتێك بە شووم بزانێت، لەبەر ئەوەی ئینسانی مسوڵمان عەقیدەی ئەوەندە بەهێزە کە تەنها خودا بەوە دەزانێ کە خۆشی دەبەخشێ و ناخۆشی لادەبا وە بۆ ئەوەش ئەسبابی معەیەنی داناوە پژمین سەبەبی لادانی زەرەر نیە لە قانونی خودا، شتێکە وەهمی خەڵك دروستی دەکات، جا کە وەهمیش ئاوا بوو وە ئەوەی خەڵکی تریش بۆی دەکەن فەرقی نیە، بڵێ ئەو کارە مەکە لەبەر ئەوە وە هەروەها کەسێك کاهینێك خەبەرێکی بۆ دەدا بۆ حاڵەتی لە گوزەشتە یان لە ئایندە و لەوەی کە لەناو دەروونیا یا کەسێك ئەم کارە دەکات یانی ئەم دووانە، یانی خۆی کاهین بێ ئەم کارە بکات یان کەسێك ئەم کارەی بۆ بکرێت وە هەروەها کەسێك سحری بۆ بکرێت وە کەسێك سیحری بۆ بکات و قبوڵی بکات.

(لە حەدیسێك بوخاری و مسلم ریوایەتیان کردووە) دەفەرموێت لە زەمینەی نەهی کردن لە زەمینەی افراط لە تەعزیمی پیاوچاکاندا فەرمویەتی:

(لا تطروني کما اترط النصاری عیسی ابن مریم انما انا عبد فقول عبدالله ورسوله)

ئەوەندە بە مندامەڵمەدەن ئەوەندە تەعریفم مەکەن لە سنور دەرم کەن وەك چۆن (نصارا) بە عیسای کوڕی مریمیان کرد من عەبدێکم بەندەیەکم بڵێن عبدالله ورسوله.

جا بۆ پێغەمبەری خودا علیە الصلاة والسلام دروست نەبێ غەیری بەیانی عەبدایەت و رسالەت، ئیتر وای لەوەی بۆ کەسانێکی تر رەنگە پیاو چاکیشی نەبن ئەم کارە بکەن.

بە داخەوە لەم زەمینەیە ئەمری پێغەمبەری خودا علیە الصلاە والسلام پشت گوێ خراوە لە قەدیم و لەتازەدا لە وەسفی زۆر شت وتراوە دروست ئەوەیە کە نەهی لێ کردووە هەر ئەوەش وا خۆی لێی دەترسا.

هەتا لە مەنزڵەتی پێغەمبەر علیە الصلاە والسلام زیاتر بەرزکردنەوە ابو داود بە سەنەدێکی باش حەدیسێك ریوایەت دەکات کە یەکێك لە مسوڵمانان بەناوی عبدالله دەڵێ :

(انطلقت في وفد بني عامر الى رسول الله صلى الله عليه وسلم )

لەگەڵ گەورەکانی تایفەی بنی عامر چووم بۆ لای پێغەمبەری خودا علیە الصلاە والسلام

فقولنا انت سيدنا گوتمان تۆ سەیدو گەورەی ئێمەی. قال السيد هو الله تبارك وتعالى

فەرمووی سەروەر و سەید (الله) یە نەمن رەدی کردەوە ئەم وتەیە.

(نسائي) بە سەنەدی باش لەم زەمینەیە حەدیسێك ریوایەت دەکات :

کە (انس ابن مالك ) رەزای خودای لێ بێت دەڵێت: کۆمەڵێك هاتن بۆ لای پێغەمبەری خودا علیە الصلاە والسلام ووتیان:

(یا رسول الله یا خيرنا وابن خيرنا سيدنا وابن سيدنا )

ئەی پێغەمبەری خودا ئەی باشترینی ئێمە کوڕی باشترینی ئێمە ئەی سەروەری ئێمە کوڕی سەروەری ئێمە،

فەرمووی: (یا ایها الناس قولوا بقولکم ولا یتهوینکم الشیطان انا محمد عبدالله ورسوله ما احب ان ترفعونی فوق منزلتی التی انزلنی الله عز وجل )

فەرمووی قسەیەکی شایستە بکەن ئەمە چی یە دەیڵێن شەیتان نەتان کێشێ بۆ لای خۆی من موحەمەدم بەندە و رەسولی خودا من پێم ناخۆشە لە مەنزلەتێك خودا بۆی داناوم بم بەن و بەرزم کەنەوە مەنزڵەتی من عبودیەت و رسالەتە سیدنا وخیرنا بۆمان چی یە بۆمن بەکاری دەبەن.

وە لەم زەمینەدا (اشتباه) تا ئەو حەددە گەییوە کە دەخاڵەت کراوە لەگۆشەیەك لە مەسائیلی عیبادەتی کە حەق نیە بە هیچ جۆرە دەخاڵەتێکی تیا بکرێت، سەڵەواتێك کە پێغەمبەر علیه الصلا والسلام خۆی سیغەکەی داناوە کە دەبی بە پێی ئەوە سەڵاوات بدرێت هەڵساون زیادەی تیادا کراوە کە حەدیسی ترمان هەیە بۆ ئەمە دەفەرموێت:

(کل ما لیس علیه امرنا فهو رد)

(من احدث في امرنا هذا ما لیس منه فهو رد)

هەرچیەك فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێ بە پێی فەرمانی ئێمە نەبێ مەردودە یانی ئەگەر چی بە قسدی عبادەتی خودا بێت بەسەری دادەترێتەوە.

هەڵساون بە خلاف سیغەیەك کە خۆی داینەوە لە سەڵاواتدانەوە بە خلاف ئەم قاعیدەیەی کە داینەوەو تەنها ئەم حەدیسەش نیە تەواوی قورئان ئەمە بەیان دەکات دەبێ شوێن ئەو شتانە بکەویت کە پێغەمبەر علیه الصلاه والسلام داینەوە بە بێ زیادە.

لە سیغەی سەڵاوات وشەی (سید)یان زیاد کردووە ئاخر صحابە لە پیغەمبەریان علیه الصلاه والسلام پرسی خودا فەرمویەتی: (صلوا علیه) چلۆن سەڵاواتت لەسەر لێ بدەین.

فەرموی ئاوا بڵێن ( اللهم صلی علی محمد وعلی ال محمد کما صلیت علی ال ابراهیم وبارك علی محمد و علی ال محمد کما بارکت علی ال ابراهیم في العالمین انك حمد مجید ) ئەمە روایەتێکە بەعزە ریوایەتی تر هەن بەئەمە گۆڕاوە (علی ابراهیم وعلی ال ابراهیم )

وە هەروەها ریوایەتی تریش هەن (ازواجه وذریاته) زیاد کراوە بە (ال) ەکە کە ئەوانە بەشیوەی تایبەت ناویان براوە لە جملەی (ال) کە لە هیچ کام لەم ریوایەتانە وشەی (سید) نیە.

دەی هاتوون لێرە وشەی (سەید) یان بەکار بردووە کە ئەمە یەك زیاد کردنی شتێکە لە بەرنامەی عبادەتی کە پێغەمبەر علیه الصلاه والسلام داینـاوە کە ئەمە وەرناگیرێ پێی دادەدرێتەوە.

دوو لە وەختی خطاب کردن لەگەڵ خودا دا ئەسڵەن بێ ئەدەبانەیە پێغەمبەری خودا علیه الصلاه والسلام بە سەید ناو ببا.

سێ لێرەدا خەریکی داوای رەحمەتی بۆ دەکەی (صلِّ علیه) یانی رەحمەتی پێ بکە یانی ئەو شتانەی کە ئەکرێ پێی بدرێت پێی بدە، دەی نیازمەندی ئەوە دەگەیەنێ بە بارەگای خودا دەی چۆن تۆ بە سەید ناوی دەبەی.

(لە مەوردی بەگەورە دانانی قەبری پێغەمبەران علیهم الصلاه والسلام وە کردنیان بە جێی نوێژ بۆ مبارەکی):

امام مسلم حەدیسێك ریوایەت دەکات پیغەمبەر علیه الصلاه والسام مدەتێك بەر لەوەی وەفات بکات فەرموی

(الا ان من کان قبلکم کانو یتخذون قبور انبیائهم مساجد الا فلا تتخذ القبور مساجد فإني انهاکم عن ذلك )

ئەها ئەوانەی وا بەر لە ئێوە بوون ئەهاتن قەبری پێغەمبەرەکانیان علیهم السلام دەکرد بە جێی نوێژیان بۆ بەرەکەت دەچوون لەوێ نوێژیان دەکرد کە نوێژەکەیان باشتر قبوڵ بێ، هۆشتان بێ قەبرەکان نەکەن بە جێی نوێژ ئەوە من نەهیتان لێ دەکەم.

وە هەروەها دایکمان عائیشە و ابن عباس رەزای خودایان لێ بێت دەڵێن کە:

لما نزل برسول الله طفیف یقرح خمیسة له علی وجهه فاذا تم کشفها قال وهو کذلك: ( لعنة الله علی الیهود والنصاری اتخذوا قبور انبیائهم مساجد) یحذر ما صنع متفق علیه.

وەختێك پێغەمبەری خودا علیه الصلاه والسلام کەوتە حاڵەتی مەرگ لەو وەختە پارچەیەك پەرۆك لەلایدا بوو هەروا بەین بەین دەیدا بەسەر دەم و چاویدا لە دوای بەینێك لەسەر دەم و چاوی لایدەداو دەیفەرموو نەعلەتی خودا لە یەهود و نەصارا چونکە قەبرەکانی پێغومبەرەکانیان علیهم السلام کردە جێی نوێژ دەترسا لەوەی لەوە و پێش کراوە دووبارە ئەنجام بدرێتەوە دەربارە بە قەبری ئەویش.

یانی ئەگەر کەسێك بچێتە سەر قەبری ئنسانێکی صالح یان ئەو بە صاڵحی بزانێ بچێت وا بزانێ نوێژەکەی لەوێ باشتر قبوڵ دەبێ، ئەوە دەکەوێتە بەر نەعلەتی پێغەمبەر علیه الصلاه والسلام.

ئەگەر کەسێك نەزانێ ئەمە قەبرە رێبوار بێ کێشە نیە. بەڵام ئەگەر زانی بە هیچ جۆرێك نابێ نوێژی تێدا بکات.

هەتا بە بەشیوەی (مطلق) نەهی کراوە لە وەی کەروو لە هەر قەبرێك ئنسان نوێژ بکات.

لە حەدیسێکی تر امام مسلم ریوایەت دەکات.

(ولا تجلسوا علی القبور ولا تصلوا الیها).

دانەنیشن بەسەر قەبران جا دانیشتن بە هەر شێوەیەك چ بە شێوەی اسراحەت چ اهانەت چ بە شێوەی ئەوەی کە بەرەکەتە وە نە رووبە قەبران نوێژ بکەن.

هەتا بۆ ئەوەی تەواو بە هانە بەدەست خەڵکەوە نەدرێت ئاوا کە امام مسلم رەحمەتی خودای لێ بێت ریوایەت دەکات جابر رەزای خودای لێ بێت کە یەکێکە لە صەحابە دەڵێت:

(نهى رسول الله عن تجصيص القبر وان يقعد عليه وان يبنى عليه بناء).

پێغەمبەری خودا نەهی لەوە کردووە کە قەبر گەچکاری بکرێت، فەقەت دەبێ خۆڵو بەردو شت بێ تا وەختێك ئەم ئێسکانە نەمان بوون بە خۆڵ یەکێکی تر بنێژرێت لەوێ وە نەهی کردووە بینا بەسەریان دروست بکرێت تەنیا بەو خۆڵەی کە بەرز دەکرێتەوە و ئەو کێلەی بۆ دادەنرێ تەنیا بۆ ئەوەی بزانرێ ئەمە قەبرە.

جا ئەمە هیچ ناگەیەنێ ئەگەر پاش ماوەیەك زانرا ئەو ئێسك و پروسکە نەماون یەکێکی تر بنێژرێ لەو قەبرە.

مخالفی ئەوە نیە خودا دەفەرموێت ئێمە لە قیامەتدا فوو دەکەین بە شەیپوور (بوق) گشتی لە قەبرەکان هەڵدەستنەوە، چونکە لە وەختێکدا شەیپوری یەکەم لێدەدرێت ئەم عالەمە گشتی تێك دەچێ ئاسمان و زەوی گشتی تێك دەچێ وە قەبر و هەرچی شتە ئەروخێنێ بەیەکدا.

ئەمجارە لە وەختێك ك شەیپوری دووەم لێدەدرێت ئەوە زەویەکی تر دروست کراوە لەوێدا بە شێوەیەك کە خودا خۆی دەزانێ لاشە دروست کراوەتەوە چونکە ئەمە شتێکە علما رێیان داوە وەختێك قەبر لاشەی تێدا نەما دروستە لاشەی تری تیادا بنێژرێ.

ئایا ئەم حوکمە (تعميم) دەدرێت بۆ تەواوی (افراد) کەسەکان بۆ نمونە: بۆ پێغەمبەری خودا عليه الصلاة والسلام؟

تەنها یەك شت هەیە (استثناء) دەكات ئەویش مسولمانان نسبەت بەوەی ئەدەب و ئحترامیان بۆ پێغەمبەریان علیه الصلاة والسلام كە قەبری ئەوان دەستی لێ نەدرێت بە شەرتێك هیچ جۆرە زیادەیەكی بۆ نەكرێ.

دەی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام هیچ كات ئیشارەی نەكرد كە قەبری ئیسماعیل علیه السلام لە كوێ یە خۆ هەر لە مەكەدا بووە لە دەور و بەری كەعبە، بەلام ئەوخوا خوای بووە كەس پێی نەزانێ گوم بن لەبەر چاوی خەلك كە نەیان كەن بە (معبد) جا لەبەر ئەمە كۆشش بكرێ كە قەبر دیار نەبێ لەبەر ئەم حالەتانە كە نە وەك خەلك بچن بیانكەن بە پەرستگا، بەلام قەبری پێغەمبەر علیه الصلاه والسلام و صحابە ئەمە ئیتر لەبەر ئحترام و رێز جێی قسە نیە.

قەبری پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام بیدایەت لە حوجرەی دایكە عائیشەدا بوو، یانی سەقف و بیناو بۆمان بوو( قبلا) دروست كرابوو پیش ناشتنی وە زیاتر بۆ ئەوە لەوێ نێژراوە بۆ ئەوەی لە دەستی خەلكی دووربێ نەچن بۆ پاڕانەوە بیكەن بە شوێنی شرك.

دەسەلاتداران هەمیشە كاریان كردووە دوو جێگە زۆر برازێننەوە بەرچاوی بكەن كە بۆ خۆیان قازانجی هەیە، یەكێك قەبری رابەرانی مسولمانان یەكێك مساجد زۆر بۆمانیان (مجلل) كردووە چونكە دلی ئینسان متعلقە بەم جێگەیەوە لە شوێنەواری ئەم رازاندنەوەی ئەم جێگایانە ئیتر( اعتزاز) ناكەن بەسەر و دام و دەزگا.

لە حەدیسێك امام مسلم رەحمەتی خودای لێ بێت ریوایەت دەكات لە علی رەزای خودای لێ بێت دەلێت: پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام دەستوری پێدام هەر قەبرێك بەرز بێت لەگەل زەویدا رێكی بكەم،

(ان النبي بعثه امره ان لا يدع قبرا مشرفا الا سواه)

یەكێك لە (انحرافات)ی عقیدە شایەع بووە لە ناو مسولْمانان ئەمەیە بەعزە شتێك كە علاقەوپەیوەندیان بە پیاو چاكان بێ بە مبارەكی دەزانن‌و چاوەروانیان هەیە ببێ بە واستە بۆ پیدانی خۆشی‌و لادانی ناخۆشی .

لەم نمونە / لە زەمانی پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام شتێك روویدا، ئەیگێرنەوە حەدیسەكە ترمزی ریوایەتی دەكات بەیانی دەرەجەی حەدیسەكە كە بە صحیح دادەنێ دەلێت: قال: ابو واقدی لیسی ( خرجنا مع رسول الله الی حنین ونحن بالكفر وللمشركین سدرة یعكفون عندها)

دەلێت: لەگەلْ پێغەمبەری خودا علیە الصلاة والسلام بەرێ كەوتین بەرەو حنین گروپێك چووین تازە مسولْمان بووبووین هێشتا عەقیدەمان بە تەواوی نەچەسپا بوو لەناو دلْمان لەوێ مشركەكان درەختێكیان بوو درەختی (سدر) ئەچوون بە پیرۆزیان دەزانی بە بەرەكەت و ئیتر ئەوەندە مەشهور ببو پێیان دەووت (ذات الانواط) ئێمەش بەلای درەختێكی تر تێپەرین وتمان بە پێغەمبەری خودا علیە الصلاة والسلام (ذات الانواط) یێكیش بۆ ئێمە دابنێ.

پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام فەرمووی : (الله اكبر) ئەم رەوشتتانە دەبێ دووبارە ببنەوە قەسەم بە خودا ئەو قسەی بنی ئیسرائیل كردیان ئێوەش كردتان، بەنی ئیسرائیل دوای ئەوەی موسا ئەو هەموو شتەی بۆ كردن

پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام زۆر تورە بوو گووتی :

(الله اكبر إنَّهُ السنن والذي نفس بیده قلتم كما قالت بنواسرائیل لموسی اجعل لنا الها كما لهم الهة قال انكم قوم تجهلون لتركبن سنن من كان قبلكم).

فەرمووی: الله اكبر بۆمان بەعزە رەوشتێكن دووبارە دەبنەوە لە ناو میللەتەكاندا قەسەم بەو كەسەی گیانی منی بە دەستە هەر ئەو قسەی بنی ئیسرائیل لەگەلْ موسا كردیان لەگەلْ مندا كردتان وەختێك لە دەستی فیرعەون

نەجاتیان بوو بەلای قەومێك دا رۆیشتن مشرك بوون كە فەریادرەسیان هەب و ئەوانیش داوایان كرد لە موسا علیە السلام لە دوای ئەم گشتە زەحمەتە كە لەگەڵیان كێشا بووی و هەوڵی دابوو كە دەروونیان پاك بكاتەوە ئەمەی غەیری خودا بە (آلهە) فەرمانڕەوا و فەریادرەسی خۆیان نەزانن داوایان لێ كرد وەك چۆن ئەو قەومە ئالهەتیان هەیە بۆ ئێمەش چەند ئالیهەتێك دا بنێ بیانكەین بە وەسیلە بە واسیتە لە بەینی خودا وە جوابی موسی (انكم قوم تجهلون) ئێوە گروپێكی نەزانن ئنسانێك خودا بۆ ئەوەی دروستكردووە كە راستەوخۆ داوا لە خودا بكات بێ هیچ كەسێكی تر لە بەینیا، ئەوجا فەرمووی: ئەو رەوشت و كارانەی مللەتانی بەر لە ئێوە بوویانە ئەوەتە ئێوە وەكو ئەوان دەكەن.

ئاوا جوابی دانەوە لە بەرامبەر ئەم پێشنیارەی كە ئەوان ووتیان هەتا لێرە ئەو جملەی لەقورئاندا دەربارەی قەومی موسی علیە السلام دەگێڕێتەوە ئەو بەبیر هێنانەوەیە (اجعل لنا الها كما لهم الهة) تا داوا كردنی قەراردانی درەختێك داوا كردنی قەراردانی ئیلاهێكە فەریادرەسێكە ئەكرێ بە شەریكی خودا لە نەتیجە داواكردنی شركێكە كە پێغەمبەران علیهم السلام بۆ مبارەزە و محارەبە لەگەڵ ئەمە نێردراون.

(هەروا لە زەمینەی (احتیاط) بەستنی هەرچی مەنفەزێك کە شرك لێیەوە دەردەچێ بۆ ئینسان).

لە بەعزێك لە حەدیس نەوعێك ئحتیات بەیان کراوە هەتا لە قسە کردن لە هێنانی ئەلفازێکدا بە دەم، کە لازمە ئینسانی مسوڵمان دیقەت لەمانە بکات کە قسەیەك کەمترین ئیشارەتی تێدا بێت بە شرك ئەگەرچی لە لایەکی زۆر زەعیفیشەوە بێت ئەو قسەیە ئنسان دوور بێ لێی.

بۆ نمونە / لە حەدیسێك کە (ابو داود) بە سەنەدێکی صحیح ریوایەت دەکات :

(لاتقولوا ماشاء الله وما شاء فلآن ولكن قولوا ماشاء الله ثم شاء فلآن )

مەڵێن ئەگەر خودا و فلآن کەس بیانەوێ بەڵکو بڵێن ئەگەر خودا بیەوێ ئینجا فلآن بیەوێ جیایان کەنەوە لەیەك.

بۆ نمونە / بڵێ لە سایەی خودا و وە بە وەسیلەی فلآنە کەس ئەمە بۆ ئەوەی ئەم کەسە چاکەیەکی هەبووە بۆ ئەوەی سوپاسی بکات بەم جۆرە.

بۆ نمونە / پیاوێك دەکەوێتە ناو چاڵێکەوە یەکێك دێ دەری دێنێ دەبێ بڵێ بە سایەی خودا وە بە وەسیلەی فلآن رزگارم بوو، بۆ ئەوەی ئنسانی مسوڵمان کەمترین قسەیەك لە شرك لەدەمی دەرنەچێ.

نابێ بڵێ لەبەر خوداو فلآن نەبووایە دەمردم.

(لەناونانی ئینسان ئاوا ناوێك بنێن)

بۆ نمونە:

لە حەدیسێکی صحیح دا پێغەمبەری خودا علیه الصلاه والسلام دەفەرموێت :

(ان اخنع اسم عند الله رجل تسمی ملك الاملاك لا مالك الا الله )

زەلیل ترین ناو ئەوەیە یەکێك ناوی خۆی بنێ (ملك الاملاك) یان شاهینشا.

سوفیانی ابن عوینە یەکێکە لە سەلەفی صالح ڕەحمەتی خودای لێ بێت دەڵێت:
وەك شاهین شا لەلای عەجەمان هەر ئەو مەعنای ملك الاملاك دەدات.

چونکە ئەم ناوە ئەسڵەکەی ئەوەیە کە فەرمانی یا دەسەڵاتی بەسەر کۆمەڵێکی دیاری کراودا هەیە، بەڵام شاهین شاه کە ئەسڵەکەی شاهەن شاهە.

پێغەمبەر علیه الصلاه والسلام ئەمەی بە زەلیلترین و پەستترین ناو ناوە.

هەتا ئەگەر ملك بگوترێ بە کەسێك وەك لە سورەی بقرە بنی اسرائیل داوا دەکەن لە یەکێك لە پێغەمبەران علیهم السلام ك (اجعل لنا ملکا)مەلیکێکمان بۆ بێنە بۆ ئەوەی شەڕ بکەین، بەڵام ئەم مەلیکە فەرماندەی لەشکرە نەك مالك.

ملك : مصدری (ملك) بە مانای فەرمانڕەوایی دەسەڵات بەسەر شتدا بەڵام شاه لەقەبێکە کە مەعنای لوغەوی ئا بەم شیوە نیە، لەقەبێکە بۆ فەرمانرەوایانی ئێران هەروا قەیسەر بۆ ڕۆم، خاقان بۆ هی چین غەیری ئەوانە.

(ملك) دروستە بۆ فەرماندەی شتێك بەکار بهێنرێ، بەڵکون ملك الملوك ئدعایەك زۆر بەرزی تێدایە کە تەواوی فەرمانڕەوایانی تر وان لە ژێر دەستی ئەودا.

هەروا بە دەرەجە هەر ناوێك تۆزێك لەو ملك الملوك تێدا بێت بەو مقدارە بەستی دەبێت.

جا بە ئەندازەی نزیك بوونی لە ملك الملوك بەست بوونی دەبێ.

(هەروەها لە زەمینەی ئەوەی ئینسانی مسوڵمان تووشی کەمترین شرك نەبێ حەدیسێکی صحیح هەیە پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام دەفەرموێت):

قال الله تعالی:(یؤذیني ابن ادم یسب الدهر وأنا الدهر اقلب اللیل والنهار).

دەفەرموێت: خودا فەرموویەتی: بەنی ئادەم ئەزیەتی من دەدا جوێن بە ڕۆژگار دەدا (زمان) لە حاڵێکدا ئەو بە کاری ڕۆژگاری دەزانێ کە ڕۆژگار ئەمەی بەسەر هێناوە ئەوە منم ئەمەم بەسەر هێناوە، منم کە شەو و ڕۆژ دێنم، بەس جوێن دان

به رۆژگار(اعتراف) بەوەی داوە کە غەیری خودا خۆشی و ناخۆشی دەبەخشێ دەی ئەمە نەوعێك لە شرکە: دەفەرموێت: ئنسان بەم شێوە ئەزیەتی من دەدا.

وەك رۆژگار لەناو عەرەبان باو بووە وشەی( دهر)

ئەبێ تەواوی ئالو گۆڕەکان بە هی خودا بزانرێ لە دوای ئەمەی ئەم کارە روو دەدا، لەبەر ئەوەی خودا (حکیم) بە مانای ئەوەی هەر کارێك دەیکا جێ بەجێ دەیکا، جا ئنسانی مسولمان دەبێ رازی بێ بەمە  کە ئەم کارە بەجێ یە ئەگەرچی ئەو نەزانێ.

تێبینی :

ئنسانێك خەریکی لابردنی ئەم جۆرە شتانەی دا، دەبێ بزانێ بە عینوانی دین بۆمانیان پێ ووتراوە، بۆیە دەبێ وەك مسولمانێك مامەڵە لەگەڵیان بکرێت کە لە زەمینەیەك لەزەمینەکاتن سەری لێ شێواوە، جا دەبێ دڵسۆزانە حاڵی بکرێت بە حیکمەتو بەشێوەیەکی جوان بۆی رۆشن بکرێتەوە کە ئەمە لادانی عەقیدەیە بە ئارام لەسەر خۆ وای لێ بکرێت وازی لێ بهێنێت.

نەك وا قسە بکەی کە ئەمە بە قەستی تووشی ئەم شرکە بووە وە لە نەتیجە هەڵس و کەوتێکی نا سازگاری لە گەڵ بکەی.

رێگەی راست ئەوەیە لەسەرخۆ ئارام بە دەلیلی موحکەم ئەم شتانە رۆشن بکرێنەوە لە دوای زەمینە سازییەکی زۆر. ئەوکەسەی هەڵەکەی بۆ راست دەکاتەوە پێش هەموو شتێك ناصح بوو بێ ئەمین بووبێ، پێغەمبەران علیهم السلام ئەیانگوت بە خەڵکەکەی خۆیان (انی لکم ناصح امین) من بۆ ئێوە دلسۆزانە دڵسۆز و ئەمین و ئەمانت دارم تەنها هەدەفم ئەوەیە لە کار ئێوە بگەیەنم بە خۆشبەختی و رێگەی خۆشبەختیتان نیشان بدەم  وە هیچ جۆرە قەسدی خیانەتێك زەربەدانێك بە ئێوەم نیە وەختێك ئەوەیان دەگوت ئەوان هەرگیز جوابیان نەداوەتەوە  ناصح نین غەش

له کارتان هەیە ئەمین نین خەریکی خیانەت کردنن ئێوە. ئەمەیان پێشتر جێ بەجێ کردبوو لەناو خەڵك کە ناصح و ئەمینن لەبەر ئەوەی ئەوان نەیان دەتوانی رەددی ئەم قسەیان بدەنەوە، ئەمە هەنگاوی یەکەمە کە ئینسان دەی هەوێ بانگەوازێك بکات بۆ رێی خودا، جا لەبەر ئەوەی یەکەم دەست پێ دەکات لە مەسائیلی عەقیدەوە ئەویش بێ ئەوەی کەمترین حاڵەتی ئەوەی سوك تەماشا کردنی بەرامبەر و(استهزاء)پێ کردنێ بەڵکو بەو پەڕی دڵسۆزی بە علم بە تەبینی کتاب و سوننەت باوەری بۆ دروست بکات کە ئەم جۆرە شتە لادانە لە دین.

وە هەروەها ئەگەر لەگەڵ خەڵکی بێ عیلم و نەزان نەگەیشتە ئەوەی قانعیان بکات دەبێ عوزریان بۆ بێنێتەوە، چونکە ئینسانی وا هەیە ٧٠-٨٠ ساڵ ئەمەی بە گوێ دراوە کە دینە وە ئێستا کە لە کەسێك وەك ئێمە قبوڵ نەکاتت (مەعزور) عوزردار دەبێت، چونکە ئەمە لەناکاوە بۆ چەند ساڵێك پێیان نەووتووە و شتی وای نەبیستوە.

وە هەروەها بۆ کەسانێك لە (علماء) نەگەیشتبنە دەرەجەی ئەوەی فەهم لەم جۆرە شتانە بە تەواوی بکەن ئەوانیش دەبێ لەگەڵیان زۆر نەرم و لەسەر خۆ بن.

بەڵام کەسانێك کە تێدەگەن کە ئنسان لە دوای ئەوەی مەراحلی دەعوەت بە حکمە و مەوعیەزەی حەسەنەی پێ دەکات بۆی رۆشن دەبێتەوە فەقەت عینادە وە خۆشیان دەزانن کە حەقە.

ئەکرێ لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانە لە قورئاندا بەیانکراوە بە شێوەی توند بەرەنگاریان ببیەوە.

هەڵبەتە ئەم بابەتە ئەوە ناگەیەنێ کە دین ئەوەندە دەکرێ پۆشیدە بن لەگەڵ مسوڵمانان نە تەنها عوامی مسوڵمانان بەڵکە (علماء )یان لەم زەمینە بکەونە اشتباه و شوبهەوە. بۆ ئەوەی بزانین دین تەواو وا رۆشنە ئەو قورئانەی وا

شەش هەزارو شەشسەد و شەست و شەش ئایەتە بکەینە ١٣ قسم یەك بەش لە زەمینەی احکام وایە بەیانی ئەوەی کە چی حەرامە چی واجبە چی سنەتە چی مەکروهە چی مبالەغەیە تەعبیری تر بەیانی نزاعی سیاسی اخلاق و اجتماعی و اقتصادی و  شعائری عیبادەتی.

بەقیەی ئەم قورئانە بە ئیستسنایی( قصص)ێك کە عیبارەتە لە گوزەشتەی داعیان بۆ تەوحید و بەرخودیان لەگەڵ مشرکاندا کە بەڵامیش پەیوەندی هەیە بە عەقیدەوە وە هەروەها باقیە گشتی پەیوەستە بە بەیانی عەقیدە.

بەجۆرێك هیچ مەسەلەیەك لە مەسائیلی ئەساسی یەوە بە ئێمە بەوە بێ بەیانێك سەد لە سەد نەهێڵراوەتەوە کە هیچ عوزرێك بۆ هیچ کەسێك هەبێت.

چونکە ئەم قورئانە نورە تەنها نور تاریکیەکان رووناك دەکاتەوە وە تەنها نور پێویستی بە روناك کردنەوە نیە، دەی ئەگەر یەکێ تاریکیەکی تووش بێ تەنها دەبێ ئەم قورئانە روناکی بکاتەوە وە تەنها ئەم قورئانەیە پێویستی بە رووناکی تر نیە.

لە سورەتی  قمر خودای کەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾.

سوێند دەخوا کە ئێمە قورئانمان وا سادەو ئاسان کردوە هەر کەسێك بیبیستێ ئیتر بیر بکاتەوە حەیاتێك کە قورئان بەیانی دەکات دەی کەس هەیە بیری ئەوەی کردبێتەوە. یانی ئەو قورئانە شتێك بەیان دەکات ریشەیان لە فترەتی ئنساندا هەیە فەقەت پێویستی بە تەکانێك هەیە. چونکە بیر کردنەوە ئەوەیە شتێك پێشتر بیزانی دوایی لەبیر چوون بیری لێ بکاتەوە.

دوو جۆرە تێگەیشتن هەیە

١) زهن: وشك تێ دەگات. ٢) قلب: بە فکر کردنەوە و لێکۆلینەوە.

بۆ نمونە: دائرەیەك هەیە لەم شارە کەسێك هیچ کارێکی بەم دائیرەیە نیە، بەڵام دەزانێ ئەمە وجودی هەیە، بەڵام یەکێکی تر بەرێوەبەری ئەم دائیرەیە ئەمە لە بن و بناوانی دەزانێ تا وای لێ دێ زۆر پەیوەست دەبێ لە دڵی گیر دەکات کە ئەمە مەسڵەحەت و خۆشی بەم شوێنەوە پەیوەندە لەبەر ئەوەی علمی تەواوی نیە تێ ناگات. (دوو جۆ تێکەیشتن هەیە لە قورئان)

١-تێگەیشتن لە راستی یەکانی دین ئاوا بە ئنسانێك زمانی عەرەبی باش دەزانێت قورئان ئەخوێنێتەوە هەر ئەو ئایەتانەی نورن، بۆ نمونە: لە زەمینەی تەوحیدا ئەو ئایاتانە بەسەری دەروا یانی ئەچێ بە گوێی تێیان دەگات، بەڵام فەقەت تێی دەگات یانی لەو زهنە سارد و سرەی جێگەیەك داگیر دەکات بە ناوی زاتێك ئیتر هیچ کاردانەوەیەکی نابێ.

٢-بەڵام فەهمێکی تر بۆ قورئان هەیە کە ئینسان لەبەر ئەوەی (استعدادی) پێشەکی هەیە (استعداد بالفعل) لەبەر ئەوە وەختێك ئایەتێك لە قورئاندا دەخوێنێتەوە وەك لە زەمینەی تەوحیددا، تەماشا دەکات ئەم قورئانە لە تەرەف خودا ئاخر عنوانێکی گەورەی تێدایە کە تۆ نابێ بچوکترین فەرمان لە غەیری خودا قبوڵ بکەی ئەگەر قبوڵی بکەی تووشی شرك بووی وەهە تاکاتێك لە دەروونی دەدا ئەم ئینسانە تەواو دەچێتە ناو قەلبیەوە.

تەعبیرێك کە (سید قطب) رحمە الله زۆر بە کاری دەبا لە (في ضلال) (لمسی) دەکات ئەدا لە دڵی تەنها ئەوەندە بزانێ لەگەڵ دەروونی تێکەڵ دەبێ ئیتر گشتی لەمەولا بەو رێیە دەروا.

وە زۆرێك لەوانە سەرو کاریان لەگەڵ قورئاندا بووە هەیە بەناوی کەسی عالم ئەوانەی مقدارێك عەرەبیان زانیوە وە توانیان متالەعەی قورئان بکەن بە شێوەی

یەکەم لە قورئان گەیشتوون، هەتا ئەگەر داوایەکەیان دەرك کردووە دەرکەکە نەچۆتە ناو قەلبەوە کە دوایی ئیتر تەواوی جولانەوەیان لەم رووەوە پەیوەست بێت، بەشێکی مەحدود بون هەمیشە نەك هەر نیسبەت بە قورئان نسبەت بە تەواوی کتابی ئاسمانی بەشێکی مەحدود بون کە ئەو راستیە چۆتە ناو دەروونیان گرێ داون بە تەعبیری قورئان وشەی (قلب – فؤاد) بەکار دەبا.

قلب : عبارەتە لەو قوەی رۆحی ئینسان دەرکی دەکات، ئیتر دەگۆڕێ پەیوەستی دەبێ پێی (منقلب) دەبێ

فؤاد : ئەوەیە وەختێك حەقائقێك دەرك دەکات لە دلی ئینسان دەدا دەسووتێنێ بە علاقە بەو راستی یەوە.

بەشێکی کەم بوون لە درێژایی تاریخ کە گرێیان گرتبوو منقلب بون بەم حەقیقەتە.

کەوابوو ئەوە کە بەشێکی زۆر لەگەڵ قورئاندا سەرو کاریان بووە، بەلام ئاوها مەسائیلێك مەتەرەح ناکەن ئەمە (حجە)ت نیە بۆ ئەمەی کە ئەم مەتالبە وا مەترەح نەکرێت لە تەرەف کەسانێکی کەمەوە ناحەق دەلیلی ناحەق بوونی نیە.

نا ئەمە مەسئەلە ئەوەیە ئەو زۆرینەیە فەقەت بە زهن ئەمەیان دەرك کردووە.

وە چونکە حازر نین بە نیسبەت ئەو (حقائق)ە (انقلاب)ی دەروونی پەیا بکەن هەوڵدەدەن ئەو حقائقە مقدارێك بە جۆرێکی تر تێی بگەن، قەید و قیودێکی بۆ پەیدا بکەن، لەبەر ئەوە لەبەر رەخنە نەجاتیان ببێ هەوڵ دەدا بۆ ئەمە تەئویلێك تەقیدێك شك بکات لەم زەمینەدا، ئیتر خۆی رزگار بکات لەدەست ئەمە.

زۆری ئەو کەسانەی ئەم داوایە دەرناخەن دەلیلی راست بوونی ئەوەی کە لەلای ئەوان نیە (ئەمە بۆ یەکێکە علمی نەبێ کاتێك یەکێك شتێکی بۆ باس دەکات لە دین).

ئەو کەسەی شتێکی بۆ مەترەح دەکرێ پێی بڵێ تۆ حازری ئا ئەم مەتڵەبە کە بۆ من مەترەح دەکەی بچی لە جەمعی عولەما لەوێ مەترەحی بکەی؟ ئەگەر ئەو کەسە حازر بوونی خۆی نیشاندا مانای ئەوە اطمأناني هەیە لە رووی ئاگاییەوە ئەمە مەترەح دەکات وە ئەگەر نا گەرەکیە ئەو ئینسانە بخەڵەتێنێ.

بۆ بەشی تەقوا تەماشا بکە ئەم کەسەی ئەم شتە مەترەح دەکات بزانین حازرە سەر وماڵی دابنێ لەو رێگەی ئەوەی مەترەحی دەکات. ئەگەر حازر بوو دیارە ئەم ئنسانە بۆ ئەوە دەچێ( اعتماد)ی لەسەر بکرێت لە رووی دینی.

ئەمە گەیشتینە ئاخر شت لە زەمینەی شرك لە (فەریادرەسی ) یا (امری تسخیری ).

جا (مشرکین) فەریادرەسیان غەیری خودا بووە بەندەکانی خوداو بتەکانی بەندەکانی خودایان کردووە بە فەریادرەسی خۆیان، بێشکیش لە ئەفرادی بەشەریان کردووە بە (مغنن) قانونگوزار بۆ خۆیان.

شرك لە زەمینەی( قانون گوزاری) فەرمانڕەوا:

هەروەك لەوەو پێش باسمان کرد ئەم عالەمە مەخلوقی خودایە، دەی هەروا مەخلوقی خودایە دەبێ (مأمور) ئەویش بێ خۆی ئیرادەی بکات.

وەك کاروباری بەشەر نیە بۆ نمونە / ئۆتۆمبێلێك لە کارخانەکەیدا دروست دەکرێ دواتر ئەو دەیدا بە یەکێکی تر واتا لە دەست کێ بێ ئەو کاری پێ دەکات بە گوێرەی ویستی خۆی(*).

---

(*) لێرانا من ئەم چەن رستەیەت پێ دەڵێم بۆ ئەوەی لە تەواوی دەسەڵاتو یاسای خودا بە سەر دروست کراوەکانی بگەی: ئاگاداربە هەمو دروستکارێك دروست کراوێکی هەیە وە هەمو دروست کراوێکیش نوسراوێکی هەیە وە هەمو نوسراوێکیش بارستیو بەیانی دروست کراوەکەی تێدایە، جا هەر کەس لەو نوسراوە لابدات چ بەلای راستدا بێ چ بەلای چە ئەوا زەرەر مەندو رەنجە رۆ دەبێت.

بەڵام بەرنامەی خودا تەنها خودا ئیرادە بە دروستکراوانی دەکات (امری نسخیری)یان یانی سوننەت و قانونو جەبریان بۆ دابنێ وە (امری اختیاری)یان بۆ دیار دەکات. ئایا ئیمکان هەیە غەیری خودا کەسێك بتوانێت حوکمێك لە جوزئی ترین ژیانی بەشەریەت بکات و دەرکی بکات یا لە رێگەی ترەوە بزانێ کە ئەبێ لە زەمینەیەك چی بگرێ وە چی نەکرێ.

مەوجوداتی ئەم عالەمە غەیری خودا بە تەقسیم دەبن بە دوو بەشەوە حەوادس و مەوجودات دەبن بە دوو بەش: ١) عالم الغیب ٢) عالم الشهادة، کە لە پێشدا تەوزیح درا.

عالم الشهادە : ئەو مەوجودات و روداوانەی لە زەمانی ئێستادا هەن وە یان لە گوزەشتە وابوون، بەڵکو پەیوەندیان بە زەمانی ئێستاوە نەپچراوە، یانی ئنسان بە شێوەی دروست بە مانەی بۆ گواستراوە بە شێوەیەکی وا کە وەك خۆی دیبێتی وە ئەو روداو و مەوجوداتەی لەوانەن ئنسان دەتوانێ بە چاو سەیریان بکات رەنگ و جۆریان ببینێ بەم رێگەیە بتوانین لە زەمینەی بۆمان تەجروبە بکات ئەوەی کە مەربوتە بە تەجروبەوە نسبەت بەوانەوە ئەنجامی بدات.

٢-عالم الغیب: عبارەتە لە مەوجودات و روداوانەی کە لە پشت ئەم عالەمی شەهادەوە هەن یان لە گوزەشتە یا لە ئاینده گوزەشتەیەك کە پچراوە وە

---

کەوایە بزانە الله دروستکارو بەدی هێنەرە وە ئێمە دروستکراوین وە قورئانیش نوسراوە وە راستو رەوایی ژیانی ئێمە لە قورئاندایە جا هەر کەسێك لەو قورئانەلادات چ بەلای راستدا چ بەلای چەپدا بێشك رەنجە رۆو ماڵکاول دەبێت.

ئەمە بۆ ئەوەی ئەو کەسەی لەو کارخانە کا سەیارەکەی لێ دروستکراوە سەیارەکەی وەردەگرێ، دەبێ رەچاوی ئامۆژگاری و رینمونیەکانی کارخانەکەوەرگرێو لێی لانەدات، وەك کێشو رۆنو بەنزینو ئاوو سورعەتی، گەرنا خۆشیو ماڵەکەش رو لە فەتانو تیا چونن.

ئایندەش  یا لە زەمانی ئێستادا هەن، بەڵکو لەوانە نین بتوانی بە وەسیلەی چاو لـە گەیانددا (ارتباط) بەرقەرار بکات،

لە نەتیجە لەوانە نین لە ژێر تەجروبە قـەرار بـدات ،یـانی دەرکێـك ئـنسان (عـالم الشهادة) وە پەیدای دەکات لە رێگەی چاوەوە  دەبێت ببینیێ، وە دەرکێـك ئـنسان لە (عالم الغیب) پەیای دەکات لە رێگەی (قلب) ەوە دەیگریێ.

بـەڵکو تـەواوی ئـەم مەعلوماتـەی ئنـسان لـەم دوو عالەمـە وە دەرکـی دەکـات مەعلوماتێکن کە هەروا ر ۆشن لە شتی دەرەوە پەیدا دەکات پێیـان دەڵـێن راسـتی (حقیقی) شتێکن کە ئەسڵەکەیان لە دەرەوە دێت.

بـەڵام بەشـێکی تـر لـە مـەعلومات وەك مـەعلوماتی (سمـع )ی یـانی ئەوانـەی رەبتیان بە (عالم الشهادە) و (عـالم الغیـب) ەوە نیـە رووداو نـین لـە (حقـائق)  نـین بەڵکە عبارەتن لە شت وەرگرتنێك کە ئـەکریێ بکرێـت بەرامبـەر رووداو و راسـتی لـە ئـەحکام  بـە شـێوەی بڕیـاردان دادەمـەزرێن، ئـەم مەفهومانـە پێیـان دەوتـریێ (اعتباری).

یانی شتێك لە دەرەوە نیە کە ئەو مەفهومەی لێگیرا بێت، ئەم رسم و عەکسەی لێوەرگیرا بیێ بە ملاحەزەی حەقائقی (عالم الغیب) و (عالم الشهادة) ئێمە خۆمان لـە زەمینەیەکدا بڕیارێك ئەدەین ئەبیێ فلان شت بکرێت ئەبیێ فـلان شـت نـەکرێت، ئـەم مەفهوماتانە (اعتبار) تین یانی پەیوەندیان بە اعتبار و قەراردانی ئێمە هەیە.

بۆ نمونە / علم پەیا دەکەین بەمە کە ئەمە ئاوە ئەمجارە دەبیێ بخۆین لێـی یـان دەبیێ بیڕێژین یان دەبیێ خۆمـانی پـیێ بشۆین یـان دەبـیێ گـەرمی بکـەین ئـەمجۆرە مەوزوعانـە هـیچ کامیـان لـە دەرەوە نیـە، ئێمـەین بڕیـار دەدەیـن لـە مـەفاهم ومەعلومات، پێیان دەگوتریێ (إعتبار)ی.

لەلایەکی ترەوە ئێمە دوای ئەوەی مەعلوماتێك لە عالەمی شەهادە وە مەعلوماتێك لە عالەمی غەیب دەرك دەکەین، بە پێی ئەو دەرکە مەوزوع گیری بکەین چونکە هەر مەوجودێك بە کەمیەتێك معەیەنو بە کەیفیەتێك تایبەت وە بە استعدادی تایبەت لە جولانەوە دایە وە تەواوی مەوجودات هەماهەنگ جولانەوە دەکەن کە لە پێشدا باسمان کرد، ئێستا ئەم ئینسانە یەکێکە لەم حقائقە بە کەمیە بۆ کەیفیەتی تایبەتەوە بە استعداد وتوانایەك دەروونی تایبەتەوە وە ئەمیش دەبێ سەرەنجامێکی هەبێ.

دەی ئەم بەشی دووەمیانی بابەت گیری بکات بجولێت چۆن بڕوات چۆن نەڕوات، ئەمەیان پەیوەستە بەو مەفاهمەوە کە گوتمان (اعتبار) یانی شتێك دێتە پێش تۆ جا بکەی یان نەکەی لە بەرامبەری هەر راستی یەك دەبێ بابەت گیری بکەی چی بکات یا چی نەکاتت.

ئەم مەوزوع گیری یە بە یەکێك لەم دوو ڕێگەیە دەکرێ :

١-کەسێك عیلمی ببێ بەسەر تەواوی جهانی هەستیدا (کمیە – کیفیە – استعداد) گشت مەوجودات بزانێ وە بینا لەسەر ئەوە جولانەوەی هەر مەوجودێك و روی هەر مەوجودێك لە مەوجودات پێ بزانێ تا بزانێ کە ئینسان لە کوێیەوە جولانەوە بکات کام روو بگرێت / حەرەکەتی لەگەڵ باقیا سازگار نەبێت و هەماهەنگ لەگەڵیانا بجولێت. دەی ئەم (عیلمی محیتە) بەدیهیە بۆ ئنسان نیە، یانی لەم ڕێگەیەوە ئنسان ناگا بەوەی کە چی بکات یان چی نەکاتت.

٢-استدلال: ئەمەیە کە هەندێك شتی بۆ دیارە بە ملاحەزەی ئەوانە وە بە کردنی بۆمان بە دەلیل و نیشانە بکات بە هەندێ شت کە بۆی دیار نیە.

لە مەفاهیمی حەقیقی ناتوانێ شتێك بکات بە دەلیل بۆ مەفاهیمی (اعتباری).

یانی بلێ فلان شت ئاوایە لە (عالمی غیب) یا لە (عالمی شهادة) .

ئا ئەم استدلالە هەڵەیە، بۆ نمونە: ئەمە ئاوە دەبێ ئەو ئاوە بخۆی.

ئا ئەم نەتیجەیە لەو پێشەکیە وەرناگیرێ بۆچون نەتیجە لە پێشەکیەك وەردەگیرێ راستیەکە لە پێشەکیەکە هەیە، بەڵام لێرە لە پێشەکیەکە ئەبێ مان نیە ووتومانە ئەمە ئاوە نیازمان بە ئاو هەیە دەتوانین ئاو بخۆین دەبێمان نیە.

دەی احکام (ببایە-نەبوایە)لە قەراردارییەکانن لە (اعتبار)یاتن کە ببای و نەبایەییك لە گەڵیاندا هەیە، ئەم احکامە لە ئەو پێشەکیانەی وا لە عالمی غیب یا لە عالمی شهادەن لەمانە ببایە نەبوایە نیە کەوابوو (اعتبار) یانە کە ببوایە نەبوایەیان هەیە لەو مەعلوماتە کە راستین عالەمی غیبی یا لە عالمی شهادە لەوانە وەرناگیرێت، چونکە ئەوان ببوایە و نەبوایەیان لەگەڵدا نیە.

ئنسان ناتوانێ لە رێگەی (استمباط)ەوە جوزئی ترین (حکم) لە مەعلوماتێك کەکەسپی کردووە لەم دوو عالەمە استباط بکاتو بەدەستی بێنێ.

وە لەسەر ئەمە هیچ رێگەیەك نەبووە بۆ بەشەر لە درێژایی تاریخدا بۆ ئەمەی کە رشتی زیندەگی بۆ خۆی دا بنێ غەیری ئەوەی کە یا بە مەیل کار بکات بڵێ مەیلمە ئاوا دەکەم یا مەیلمە ئاوا ناکەم.

ئەگەرچی بشرازێتەوە بە فەلسەفە بە اصطلاح بە تەعبیراتی جۆر جۆر خەڵکی پێ بخەڵەتێنێتو وا پیشان بدا کە (استدلال)ە ئەگەرچی رازاندبێتیانەوە وایان نیشاندابێ کە ئەم (احکام)ە وا دادەنێن لە رووی عیلمیەوە بە استدلالەوەیە چی یە و چی یە ئەوەش کە دەڵێن ئەخلاقی عیلمی یە لەم جۆرە قسە پووچانە راستی ئەوەیە مەیلمان هەیە ئەمە رێگەیەك بوو بۆ ئەوەی ئینسان ئەحکامی دەست کەوێ بە تەعبیری قورئان (هدی) ئەوەی پێم خۆشە یان پێم ناخۆشە.

رێکەی تریش ئەوە بوو کە ئنسان گوێ راگرێ بۆ خاوەنی عالەمی هەستی کە علمی (محیط)ی تەواوی هەیە، ئەوە بە (استدلال) (احکام) دانانی علمی (محیطی)

تەواوی هەیە، کە هەر شتێك چ جۆرە بابەت گیریەك بۆی مناسبە ئەو (احکام)ی بۆ دابنێ.

بینا لەسەر ئەمە کە دانانی حوکمێك لە( احکام) پێویستی بە علمی (محیط)ی تەواو هەیە وە علمی (محیط)یش تەنیا هی خودایە، لەنەتیجە (صادر) دەرکردنی ئەنجام دانی حوکمێك کە تایبەت هی خودایە قبوڵ کردنی حکمێك لە جوزئی ترین جوزئیاتی مەسائلی زیندەگی لە غەیری خودا، شەریك قەراردانی ئەو کەسەیە بۆ خودا، کردنی ئەو کەسەیە بە شەریکی خودا، چون شتێکە (خاص) تایبەت هی خودایە لە یەکەمەوە.

هەروەها کەسێك بلێ زاتێك هەیە وەك خودا، ئەمە بۆ نمونە: کە کەس وای نەگوتووە.

ئەگەر تەنها یەك دانە حوکم لە غەیری خودا وەربگرێ بەناونیشانی قانون پەیڕەوی لێ بکات ئەوە تووشی شرك بووە، چونکە شتێکی گرتووە لە غەیری خودا.

وە موبارەزە و موجاهەدەی پێغەمبەران علیهم السلام لە درێژایی مێژوو ئەگەر قەرار بێ بەشی بکەین دەبێتە ئەم بەشانە:

١- کەس (مؤثر) نیە غەیری خودا.

٢- کەس غەیری خودا فەریادرەس نیە.

٣- کەس غەیری خودا فەرمانڕەوا نیە.

لە بەرامبەریشەوە پێداگری (مشرکین) لە درێژایی مێژوو هەر ئەمە بووە کە دەیانگوت ئاخر چی یە ئێمە خۆمان بەرنامەیەك بۆ خۆمان دابنێین، ئێمە نوێژ دەکەین رۆژو دەگرین حەج دەکەین فلان دەکەین، بەلام خودا کاری بە سیاسەتەوە چی یە ئێمە بۆ خۆمان بەرنامە دادەنێین.

بـۆ نمونـه / (مـشركین)ی عـەرەب پێغەمبـەری خـودا علیـه الـصلاه والـسلام لەگەڵیان ئەو گشتە زەحمەتەی كێشا خودایـان قبـوڵ بـوو بـە مانـای زات و خـالق، بەڵكو لە بەشی فەریاد رەس غـەیری ئـەویان بـە واسـتە بـۆ قـەرار دەدا، لـە بەشـی فەرمانڕەواش دەیانگوت ئێمە خۆمان بەرنامە دادەنێین، كێشە سـەرەكیمان لەمانـە بوو، هەروەها خودی وشەی تەوحید (لااله‌الاالله) نازڵ بەم مەسائیلەیە، یانی غـەیری خودا كەس ناتوانێ قانون دابنێ.

ئدعای فەرمانڕەوایی (الوهیه) شرك له الهویەت.

چەند دانە ئایات لە قورئان بەیان دەكەین فـەرمانڕەوایی لـە بـچوكترین گۆشـەی ژیاندا (الوهیه) ئدعای (الوهیه) وە قبوڵ كردنی شركە.

خودای گەورە لە سورەتی یوسف لە ئایـەتی ٣٩-٤٠ دا لـە باسـی گفـت و گـۆی یوسف لەگـەڵ دوو گەنجـە زیندانیەكـە كـە خـەوەكانیان دیبـو گێڕایانـەوە، ئـەویش فرسەتی دیت بانگیان بكات بەرەو تەوحید ئاوا دەفەرموێت :

﴿يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ﴾.

ئەی دوو یاری زیندان هێشتا یاری ئەو نین لەبەر ئـەوە دەڵێـت: ئـەی دوو یـاری زیندان چونكە هێـشتا شایـستەی ئـەوە نـین بـبن بـە یـاری، چـونكە وان لـە شـركدا شایستەی ئەوەیان نیە بفەرموێ (یا صاحبی) ئەی یارەكانم.

هەرواش لە دوای دوو ئایەی تر جارێكی تـر هـەر بـە (صـاحبی الـسجن) بانگیـان دەكات كە دەیگەیەنێت دەعوەتەكەی قبوڵ نەبووە قبوڵیان نەكردووە، یاری زیندان ماونەتەوە.

دەفەرموێت: ئەی دوو یاری زیندان ئایا خاوەنانی جۆر جۆر باشترن یا (الله) كـە تەنهایە و دەسەڵاتدارە بەسەر هـەموو شـتێكدا، جـارێ وشـەی (اربـاب) لێـرە بـەكار

دەبا کە کۆی (رب) ە بە مەعنای خاوەن، خاوەن چەند مصداقی هەیە، مەعناکەی کە تەفصیل دەدرێت دەکرێ بە (٥) مەعناوە، یەکێك لە مەعناکەی فەرمانڕەوایە، لێرە یوسف علیه السلام تەوجیهی ئەم دووانە دەکات کە فەرمانڕەوایانی بەشەریان کردووە بە شەریکی خودا لە فەرمانڕەوایی، هەروا کە بەعزێك لە مەخلوقاتیان کردووە بە شەریکی خودا لە فەریاد رەسی.

دەفەرموێت: ئەو خاوەنانە هەر یەکەو لە لایەکن هەریەکە بە هەوەسی خۆی فەرمان دەردەکات ئایا بۆمان باشترن کە ئینسان سەری لێ دەشێوێ لە ناویان هەر کامیان شتێکی پێ بڵێ بە خلاف ئەوی تر یان (الله) باشترە کە تەنهایە وە (قهار) یشە تەنهایە کە سەرچاوەی فەرمان و دەستورە، ئنسان ژیانی خۆی دەزانێت و سەری لێ ناشێوێ لە چەند ڕێوە فەرمانی بۆ نایە لەیەك لاوە بۆی دێ وە (قهار) ە وەختێ ئنسان خۆی تەسلیمی ئەم خاوەنە کرد ئەو خاوەنەی لە هەرچی شتێ خلافی مەشیئەتو ئیرادەی خۆیە دەیپارێزێو نایەلێت کە کەسێکی تر دەسەڵاتی بگرێ بەسەریدا، بە خلافی ئەم فەرانڕەوایانە وەختێ ئنسان خۆی تەسلیمی یەکێکیان دەکات ترسی ئەوەی هەیە ئەوی تریان غەلەبە بکات بەسەریا و دیفاع کردنی بۆ نەمێنێ.

هەڵبەتە یەك دو جارێکیش یوسف علیه السلام وشەی (رب) بەکار دەبا بۆ ئەو فەرمانڕەوایە ئەو مەلیکەی کە خەوەکەی دیت، یەکێك لە گەنجەکان لە زیندان دەردەچێ دەڵێ (اذكرني عند ربك).

لە دوای ئەوەش خودا دەفەرموێت: ﴿فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيْطَٰنُ ذِكْرَ رَبِّهِۦ﴾ جارێکی تریش وەختێك مژدە دەرێك دێت بۆ زیندان مژدەی ئازادی بە یوسف علیە

السلام دەدا دەفەرموێت: (ارجع الى ربك) لەم چەند ئایەتە وشەی (رب) بە مفرد بەکار براوە بۆ فەرمانڕەوا کە.

وەختێك لە قورئان نەفی (رب) دەکرێ بۆ غەیری خودا (ربوبية)

دەستور دەدرێت بە ئنسان لە غەیری خودا هیچ کەسێك بە (رب) نەناسێ مەعنای ئەوەیە لە جملەی ئەو شتانەی نەفی دەکرێ لە غەیری خودا دەبێ فەرمانڕەواش نەفی بکرێت وە غەیری خودا فەرمان لە هیچ کەس قبوڵ نەکاتت.

دوای ئەو ئایەتە دەفەرموێت :

﴿مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسْمَآءً سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ﴾.

ئێوە غەیری خودا بێجگە لە بەعزە ناوێك کە راستیان نیە، بێجگە لە ناوێك ژیان بۆ هیچ کەسێکی تر ناکەن.

یانی ئەو فەرمانڕەوایانەی فەرمانداریيان دەکەن وە ئەو فەریادرەسانەی هاواریان بۆ دەکەن لە غەیری خودا راستیەکیان نیەو پووچن لەم دوو مانایەو هیچ دەسەڵاتێکیان نیە، لە نەتیجە ئێوە عبادەتی ناوێك دەکەن، ناوێك کە خۆتان ناوتان ناوە فەریادرەس ئەویش فەرمانڕەوا بەبێ ئەوەی کە لە تەرەف خوداوە سوڵتانێك یان دەلیل و بورهانێك دەسەڵاتدار بە جۆرێك کە ئنسانە نەتوانێ لە ژێری دەرچێ ئاوا دەلیلێك لە تەرەف خوداوە نەهاتووە !.

وشەی (سلطان) لە زۆر جێگە لە قورئاندا بەکار دەبرێ بۆ دەلیل کە ئەسڵی وشەی (سلطان) (مصدر)ەرە بە مەعنای دەسەڵاتگرتن بەسەر شتدا.

یانی عقیدە دەبێ لەسەر مەعنای سلطان بێت، یانی دەلیلێك ئەوەندە( قوی ) بەهێز بێت ئنسان نەتوانێ لە ژێری دەرچێ.

لێرەوە لە چەندەها جێگەی تر سەرزەنشتی ئەوانە دەكات شرك بۆ خودا قەرار دەدەن، دەفەرموێت: عەقیدەتان لە دەلیلێكی بەهێز سەرچاوە ناگرێ، بەڵكو لە هەوەسە لە ئەوهامێكە.

﴿مَا تَعۡبُدُونَ﴾ لە وشەی عبودیەت و عبادەت بەكار براوە بۆ فەرمان جێ بەجێ كردنی فەرمانڕەوایان وە هاوار كردنە فەریادرەسان.

وەختێك ئنسان لە قورئان دەستوری پێ دەدرێت كە غەیری خودا عبادەتی كەس نەكاتت، یانی فەرمان بەرداری لە غەیری خودا نەكاتت وە هاوار لە غەیری خودا نەكات كە فەرمان بەرداری لە غەیری خودا ئعترافە بەوەی كەسێك غەیری خودا دەسەڵاتی هەیە بەسەر شتێك لە شتەكان، واتە: مەوجودێك دەتوانێ بیبا بەرەو سەرەنجام لە حاڵێكدا هیچ مەوجودێك لە ژێر چنگی هیچ شتێك غەیری خودا دا نیە.

هەروەها خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾.

حكم : لە مصدری (حَكَمَ) بە مەعنای گێردانی شت كۆنترۆڵ كردنی شتێ كە لە چوار چێوەی چاكە بمێنێتەوە بەرەو فەساد نەچێ.

بۆ نمونە / وشەی (حكمە) دروست كراوە.

حكمە: بۆ لغاو دەكرێتە دەمی ئەسپ ئیتر كۆنترۆلی دەكات نایەڵێ ئەم لا و ئەولا بكات كە خۆی یان سوارەكەی تووشی فساد بێ.

ئەمجارە فەرمانێك كە لە لای خوداوە دەردەچێ بۆ ئەوە ئینسان گیر بداو بۆ رێگەی تر نەچێ هەر ئەو رێگە چاكەی ئنسانە وەلادان لەم رێگە فەسادی ئنسانە.

جا دەفەرموێت: حکم فەرمانڕەوایەك کە ئنسان لەسەر ڕێگەی چاك بهێڵێتەوە نیە بۆ غەیری خودا،

بە نەفیەکی قاطع ﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾.

ئەگەرچی جوزئی ترین فەرمان بێ نابێ بۆ غەیری خودا.

دوایی ﴿أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ﴾.

فەرمانی دا خودا کە غەیری ئەو فەرمابەرداری لە کەس مەکەن هاوار لە کەس مەکەن.

﴿ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ﴾.

ئا ئەوەیە ڕەوشتی ڕێك و پاك، ڕەوشتێك کە سەرپەرشتی ئنسان دەکات بۆ خۆشبەختی و چاکە.

قیم : ئەو دینە کۆنترۆڵی ئنسانە، نازڵە بەسەر ئنسان نایەڵێ بەرەو ئەوەی وا ناشایستە بجولێ بۆی.

﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾.

بەڵام زۆرتری خەڵك نازانن تەنها ڕێگەیەك کە ئەبێ ئینسان خۆی تەسلیم بکات تەوحیدی ڕێگای خودایە. وە هیچ جۆرە فەرمانێك لە ژیان نیە غەیری خودا.

ئەو خودایەی خەلقی کردووە کە (امری تسخیری) بە دەست ئەوە وە حەقی ئەویشەکە امری ابتلائی و اختیاری ئنسانی بە دەست بێ.

یانی بە عبارەتێك سادە دەعوەت لە لای پێغەمبەرانەوە علیهم السلام ئاوا دەبێت کە خەڵکینە مەگەر ئعتراف ناکەن کە خودا خالقتانە، دەی دەبێ هەر ئەویش ئامر بێت.

وه کەسێك کە علمی تەواوی ببێت ئەوە دەزانێت چۆن فەرمانڕەوایی بکات و لە هەر زەمینەیەکدا چۆن فەرمان بکات.

هەر لە م زەمینەدا خودای گەورە لە سورەتی شوری لە ئایەتی ٢١ بەیان دەکات کە فەرمان و دەستورێك لە غەیری خودا وە ئەو کەسەی فەرمانێك ئەدا رەوشتێك دادەنیَ لە غەیری خودا هەر ئا ئەو کارە ئدعای حەق (ربوبیە) وە قبولَ کردنی شەریك قەرار دانە بۆ خودا.

﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ وَلَوْلَا كَلِمَةُ ٱلْفَصْلِ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾.

ئەریَ ئەوە ئەوان بەعزێك شەریکیان بۆ خودا قەرار داوە چیان بۆ کردوون بە گومانی زۆرێك بۆمان یا رازق یا چین کە خودا ناویان دەنیَ شرك ئەو کەسانە وا لە دینو لە نیزام و بەرنامەی ژیان شتێکیان بۆ داناون رێیەکیان بۆ داناون غەیری ئەوەی کە خودا ئیزنی پیَ داون.

یانی ئەگەر لەبەرنامەی ژیانی خەڵکدا کەسێك رەوشتێك عەرز بکات غەیری ئەوە کە خودا ئیزنی داوە ئەو کەسە شەریعەتێکی داناوە دینێکی داناوە وە بەو عەمەلە بووە بە شەریکی خودا.

لە دوایی دەفەرموێت: ئەم کارە زۆر گرنگە گوناحێکی زۆر گەورەیە ئەمە ئەگەر لە بڕیارێك نەبوایە کە زووتر داومانە بڕیارێك کە یەکسەرە ئنسان هەلاك ناکەین لە بەین نا بەین، ئەگەر لەبەر ئەو بڕیارە نەبوایە کە ئەوە کاریان تەواو دەکرا کۆتایی پیَ دەهات، چونکە توشی کارێك بوون کە جەزای زۆر زۆر سەنگینە، بەلاَم لەگەلَ ئەوەشدا کە مۆڵەتیان ئەدرێتیَ لەسەر ئەساسی ئەو بڕیارە ئیهمال ناکرێت وێل ناکرێت.

بەراستی ستەمکاران ئەوانەی رەوشت و فەرمان لە غەیری خودا قبول دەکەن، غەیری خودا قانون گوزار بێ ئەوا ئەشکەنجەی دەردەداریان هەیە لە دواییدا.

ئەوە ئەم ئایەتەش بەیان دەکات قبول کردنی فەرمان ئەگەر چی جوزئی ترین بێت چونکە هیچی دیاری نەکردووە ( مالم یأذن به الله) گشتیە (مطلق) بەبێ ئیزنی خودا شەریك قەراردانی ئەو شەخصەیە بۆ خودا.

بەمەو بە زۆرێك لە ئایات کە شرکی (مشرکین) ی زەمانی پێغەمبەر علیه الصلاه والسلام وە لە دەورانە گوزەشتەکانیش ئا ئەوە نەبوو کە زۆرێك گومانی دەکەن.

بۆ نمونە / وایان زانی بێ لە دەوری فیرعەون کە فیرعەون خالقە یان ئەو ئیدعای خالقیەتی کردبێ یا لە دەورەی نەمرود کە ئەو خالقە و ئیدعای خالقیەتی کردبێ یان ئەو بتانەی سەربەخۆن لە خۆشی پێدان و ناخۆشی لابردن؟ نا.

شرك لایەکی ئەوەبووە کە غەیری خودایان کردووە بە واستە لە بەینی خوداو ئەوان.

لایەکی دی ئەوە بووە کە قانون و بەرنامەی ژیانیان لە غەیری خودا وەرگرتووە.

خودا ناوی ئەو (مقنن ) ئەو قانون گوزارانە بە طاغوت و (رب –الە) غەیری ئەمە وە ناویان بە شەریك دادەنێ.

لە سورەتی انعام لە ئایەتی ١٢١ وە ئا ئەم مەسئەلەیە بەیان کراوەو رۆشن کراوەتەوە کە جێگەی هیچ جۆرە تەئویلێك نیە وە رێگەی دەرچوون لە دەست ئەم راستیە بە تەواوی باس کراوە، هیچ بەهانەیەك نەماوە بۆ هیچ کەس لە بەرنامەی ژیان بتوانێ کەمترین فەرمان لە غەیری خودا وەربگرێ کە مەسئەلەیەکی جوزئی بەیان کراوە کە لەو مەسئەلەیە ئەگەر بێت و غەیری خودا فەرمانبەرداری بکرێت ئەوە شرك روی داوە وە دەفەرموێت: ئەگەر ئێوە ئاوا بکەن ئیتر ئێوە لە

مشركینن، مەسئەلە نەخواردنە لە گۆشتی ئەو ئاژەڵانەی بە ناوی غەیری ناوی خوداوە سەر دەبڕدرێن یان لەسەر (نصب) سەردەبڕدرێن (نصب) یانی ئەو نیشانانەی دەچەقێنرێن بۆ کەسانێك خەڵك باوەڕیان هەیە کە ئەهلی بەرەکەتن یانی لە تەرەف ئەوانەوە بەرەکەتێك دێت دەبن بە وەسیلەی خۆشی پێدان و ناخۆشی لابردن.

دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ﴾.

ئەوانەی وا بۆ غەیری خودا سەردەبڕدرێن لەوانە مەخۆن وە بەراستی ئەگەر ئەو کارە بکەن ئەوە دەرچوونە لە بەندایەتی خودا.

فسق : یانی دەرچوون لە بەندایەتی خودا، بۆ ئەوە بەکار دێ کە تووشی گوناحی گەورە بووە ئنسان لە دین دەردەکات.

فسق و فاسق لە قورئاندا غەیری ئەو مانایە کە لەناو خەڵکی هەیە، ئەسڵی وشەکە عیبارەتە لەوەی کە خورما پێ دەگات.

فاسق : لە ناو خەڵکی بە مسوڵمانێك دەڵێن بێ بەند و بار بێ، بەڵکو لە قورئاندا (فاسق – کافر) هەر یەکێکن.

بنی ئیسرائیل ئەمەیان قبوڵ بوو کە ئەمە کتێبی خودایە، بەڵکو حوکمیان پێ نەدەکرد ئەویش لەبەر چی یە.

١–لەوە دەترسان ئەوانەی کە لێیان داوا دەکرا کە حوکم بە (ما انزل الله) بکەن احبار و رهبان دەسەڵاتدارەکانیان ئەترسان لەمەی کە حوکمی (ما انزل الله) گرفتارییان بۆ دروست دەکات لەلای خەڵکەوە.

٢–لەمەش کە (متاع) خۆشی دونیایان هەڵبژاردبو.

لەبەر ئەم دووشتە تەركى حوكم بە (ما انزل الله) يان دەكرد هـەر لەبـەر ئـەوەى تەركى حوكم بە ( ما انزل الله) يان دەكرد خودا دەفەرموێت: كافرن.

ئايـەتى دواى ئـەوەش چـەند دەسـتورێك لـە تـەورات بـەيان دەكـات كـە دەستوراتێكن بەنسبەتى كۆمەڵەى دين زۆر جورئين هەنديكيان، بەڵكو لـە دواى بەيانى ئەم دەستورانە باس هەن دووبارە دەكاتەوە.

دەفـــــــەرموێت :﴿ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ ۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ ﴾.

لە ئەوان بۆمان نوسيبوون لەسەريان فەرزمان كردبوو كە هەر گيانێك گيانێك لـە بەرامبەريەوەيـە يـانى ئەگـەر كەسـێك كەسـێكى كوشـت ئـەو كەسـە دەكوژرێتـەوە چاوێك لە بەين برا چاوێك لەبەين دەبرێتەوە گوێيەك لە بـەين بـرا گوێيـەك لـە بـەين دەبرێتەوە ددانێك لە بەين برا ددانێك لە بەين دەبرێتەوە بە شێوەى قصاص.

وە لە دواى ئەمـەى ئـەم قانونـە دادەمـەزرێنێت كـە هـەر كەسـێك گـەرەكى بـوو حەقى خۆى بسەنێتەوە جا هەر كەسێك بەراستى بە كەيفى خۆى لە بەرامبەر خۆش بوو ئەوە دەبێت بە كەفارە بۆى بۆ گوناحەكانى.

جا لـە شـوێن ئەمـە دەفـەرموێت: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴾.

وە هەر كەسێك بە (ما انزل الله) ئەوەى خوا ناردوێتى حوكم نەكات هەر ئەوانەن زاڵمن.

جا دەتەوێ بزانى زاڵم كێيە ئەوەيە كە حوكم بە (ما انـزل الله) نـەكات يـانى مـا انزل الله دەبەن لە جێ يەكى تر دايدەنێن كە شتێك لە غەيرى جێى خۆى دابنرێ.

جا وشەی زالّم لە نەزەری خەڵك لەوانەیە بچوك بێت، بەلاّم ئەگەر ملاحەزەی بكەی لە قورئاندا مصدری زالّم و موشتەقاتی زوڵم لە چ جێگەیەك بەكار براوە چ سزایەك چاوەروانیانە، بۆی رۆشن دەبێتەوە زالّم دورە لە رەحمەتی خودا.

بۆ نمونە / وەختێك تەقسیمی خەڵك دەكات بۆ بەهەشت و دۆزەخ لە جێیەك دەفەرموێت: سێ بەشن

١- سابقە بالخیرات ٢-مقتصد ٣-ظالم

وە زالّمەكان لە دوای چەند ئایەت بەیانی دەكات لە دۆزەخن.

لە نەتیجە ظالمون و كافرون لە مەئالدا دەبن بە یەك .

لە زەمینەی نصاری عبارەتەكی دی نزیك لەمە دەفەرموێت:

لە پێشدا دەفەرموێت (ولیحكم اهل الانجیل بما انزل الله فیه )

با ئەهلی انجیلیش بەوەی كە خودا لە انجیل ناردوویەتی یە خوارەوە حوكم بكەن وە هەركەس بە ما انزل الله حوكم نەكات.﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾. هەر ئا ئەوانەن فاسق.

لە دوای ئەوەی حەقی بۆ رۆشن دەبێتەوە لە قورئان وە لە بەندایەتی خودا وە لە فەرمانی خودا ئەمجارە لێی دەردەچێ.

بۆ نمونە / (سجدە) وەختێك بەیانی سەرەنجامی خەڵك دەكات عبارەتەكەی ئاوا دەكات، بەڵكو ئەوانەی وا ئیمانیان هەیە ئەوە سەرەنجامیان بەهەشتە وە ( واما الذین فسقوا في النار).

وە ئەوانەی لە بەندایەتی دەرچوون ئەوانە جێگەیان دۆزەخە.

هەروەها پێشتر وتمان فاسق لە قورئاندا لەگەڵ كافر لە غەیری تەعبیری مەفهومی لوغەوی فەرقێكی وایان نیە.

رونكردنەوەيەك لە هەر سێ وشەی (كافر– ظالم – فاسق).

وە لە نەتیجە ئەم چەند ئایەتە رۆشن دەكەنەوە كە لە دوای ئەمە بۆ كەسانێك رۆشن بۆوە كە فەرمانی خودا لە زەمینەیەكدا چییە ئەگەر خستیانە پشت گوێ بە هەر بەهانەیەك بێ حوكمیان پێ نەكرد ئەوە كافرو ظالم و فاسقن )

كەمێك زیاتر تەوزیح لە مەوردی ئەم سێ عیبارەتە :

(كافر ظالم فاسق)

– كافر : كفر بە مەعنای داپۆشین : وەختێك یەكێك شتێك دەشارێتەوە لە مەعنەوی وەختێك بە كەسێك دەوترێ كافر كاتێك مەتڵەبێك بە دەلیل و بورهان سابت بكرێت بە جۆرێك لەلای قەلبیان رۆشن و حازر بێ لەبەر چاو حزوری ببێ ئەم مەتڵەبە ئەمجارە لە نەزەر خستنی ئەم مەتڵەبە تەوەجوه نەكردن بەومەتڵەبە، تەسلیم نەبوون بەوە و بەخلاف ئەو مەتڵەبە بكات، دەبێتە كافر.

لە نەتیجە كافر كەسێكە حەقی بۆ رۆشن بۆتەوە، بەڵام پشت تێ دەكات.

– ظالم : زاڵم : دانانی شتێكە لە غەیری ئەو جێگەیەی خۆی، لە غەیری چوار چێوەی بەندایەتی دابنێ، بەرنامەی خودا كە دەبێ بۆ حوكم پێ كردن و فەرمانرەوایی بێت لە غەیری ئەمە دایبنێ.

دەی تەماشا دەكەین نزیكی یەكن ئەم دوانە یانی ئەو كەسەی حەقی بۆ رۆشن بۆتەوە ئەیشارێتەوە پێی دەوترێ كافر هەر ئەو كەسە حەقەكەی لە جگە جێی خۆی داناوە كە زاڵمە.

یانی بە تەعبیرەكەی تر پێی دەوترێ شاردوێتیەوە وە بەو تەعبیرە پێی دەوترێ لە غەیری جێگەی خۆی دایناوە.

کافر و ظالم مصداقەکەیان یەك کەسە، فەقەت لە شوێنی جیاواز ئەم دوو دانە عبارەتە بەکار براوە بۆ ئەم کەسە کە کارێکی کردووە نسبەت بە حەقێك لە حەقەکان کە بۆی رۆشن بۆتەوە.

- فاسق " کە لە چوارچێوەی بەندایەتی کە بۆی دامەزراوە دەرچێ (تجاوز) بکات وەختێك حەقی بۆ رۆشن دەبێتەوە و چوارچێوەیەکی بۆ مەترەح دەبێ نسبەت بەم حەقە ئەگەر هەوڵیدا لەوە دەرچو وشەی فاسق بۆی بەکاردەهێنرێ لە حاڵێکدا هەر ئەو کارە عەینی زوڵمەکەیە وە عەینی کوفرەکەیە.

بەس ئەم سێ وشەیە لە مەئال و لە سەرەنجامدا یەك شتن‌و مصداقیەکەیان یەك باسە، ئەمە بە عبارەتی جۆراو جۆر بۆمان بەکار دەهێندرێت.

هەروا کە زۆرێك شت هەن لە زەمینەکانی تر لە نەزەر بە حالاتی جۆراو جۆر کەلیماتی جۆراوجۆر بەکار دەبرێ، بەڵکو لە مصداق هەر یەکن.

بۆ نمونە / وشەی (زەکات) بەوە دەووترێ یەکێ پارەی هەبێ کاتی زەکاتی هات لێی دەردەهێنێ‌و ئەیدا بە خەڵك، بەم ئعتبارە کە لەو ماڵە دەردەچێ دەبێتە سەبەبی (تزکی) ئنسانەکە.

وشەی (انفاق ) یش هەر بۆ ئەو عەمەلە بەکار دەبردرێت بەو (اعتبار) ە کە ئەو عەمەلە وەك ئەوەیە کە تونێلێك لە عەمباری ماڵەکەی دەکات بۆ خێر.

وشەی (صدقە) هەر بۆ ئەوە بەکار دەبردریت بەم (اعتبار)ە کە بەخشینی ئەم ماڵە (تصدیقی ) ئیدعای دەکات کە پێشتر بوێتی کە وتویە ئیماندارم.

دەی ئەم ئایاتی سورەی مائدە بە هانەیەك ناهێلێت بە دەست کەسەوە وە تەئویلاتێکیش کە کۆمەڵێك دەیکەن کە حوکم کردن بە غەیری ما انزل الله کوفر نیە بە (اعتقاد)ی کوفرە تەئویلاتێکە هەر دەردی خۆیان دەخوا وە هیچ جۆرە مستەمسەکێکیان لە قورئاندا وە لە شێوەی عەرەبی بەیانی عەرەبی نیە وە ئەگەر

قەرار بێ هەر کەس ئیجازەی بێ زابتە، ئاوا تـەئویلێك بکـات قورئـان هیـچی لەسـەر حاڵی خۆی نامێنێتەوە، هەر کەس مەیلی بوو هەرچیەکی بە مـەیلی خـۆی تـەئویل بکات، دەی کا کە ئەوەش دروست نیە.

بـەبیر هێنانەوەیـەك کەسـانێك وا حـەقیان بـۆ ڕۆشـن نەبۆتـەوە بەگـشتی یـا لـە زەمینەیەکدا حوکمی ما انزل الله پێ یـان نەگەیـشتوە یـان گەیـشتووە پێیـان بـەڵام (اقامە حجة) نەکراون بەراستی بۆیان ڕۆشن نەبۆتەوە حوکم نـەکردنی ئـەوان بـە مـا انزل الله جاهیلیەتە تووشی شرك بوون، بەڵکو پێیان ناڵێن کافر وە جەزایەك کـە بـۆ کافر هەیە لە ئاخرەتدا بۆ ئەوان نیە.

لــە هــەر تــەکلیفێك (وسـع) مەترەحــە هــەر کەسـێك بـە ئەنـدازەی توانـای و ئیمکانیاتی تەکلیفی لێ دەکرێ لە کۆمەڵەی حوکم بە ما انزل الله ئەمە مەترەحە.

چون حوکمی خودا هەم بۆ دامەزراندنی پەیوەندی خەڵك لەگەڵ خودایە وە هـەم پەیوەندی لەگەڵ خۆیدا وە هەم لەگەڵ بەندەکانی خـودا و نعمـەتانێك کـە خـودا لـە (اختیار) ی ئینسان قەراری داوە بۆ هەموو بۆمان دەبێ.

بە شێوەیەکی تر حوکمی خودا هەم نیزامی شـەعائری یـان بـە تـەعبیری خـەڵك عبادەتی لێـوە (نشأة) گرتـووە، هـەم نیزامـی ئـەخلاقی کـە پەیوەسـتە بـە خـودی ئنسانەوە (تزکیە)، هەم نیزامی اقتصادی وە هەم نیزامی اجتماعی وە هـەم نیزامـی سیاسی.

دەی ئاوا تەماشا دەکەین ئنسانێك خۆی بە تـەنها ئیمکـانی نیـە کـە بتـوانێ مـا انزل الله لە تەواوی ئەوزەمینانە حوکمی پێ بکات.

دەی ئەو وەختە ئەوەحوکم بە ما انزل الله ی ناسیوە، دەی چارەی چۆنە ؟

که ما انزل الله ی ناسیوه ئەمە کاری پێ ناکات، بۆ نمونە / لە زەمینە ( اقتصادی – سیاسی – اجتماعی ) چونکە تەنهایە ئەم ناکرێت ئەو جۆرە حوکمە گشتیان دەبێ کۆمەڵێك خەڵك بەیەکەوە ئەنجامی بدەن.

ئەمە بینا لەسەر قاعدەی (وسع) هەر ئنسانێك ما انزل الله دەناسێ چەندێك تواناو ئیمکانی هەیە، جارێ خۆی تەنیا ئەنجامی بدا کامە موکەلەفە لەوانە دەست پێ بکات و ئەنجامی بدا لە بەشی شعائر و بەشی ئەخلاق وە لە زەمینەی (اقتصاد و سیاسەت و اجتماعی ) ئەوەی وا دەکرێ ئەو کەسە ئەنجامی بدا.

بەڵام ئەوانەی وا خۆی تەنها ناتوانێ ئەنجامی بدات، ئەبێ کۆمەڵێك بە یەکەوە بن لێرە شتێك مەترەحە.

کۆمەڵێك هەن کە ئەمە دەبێ ما انزل الله حوکمی پێ بکرێت وە(اقامە حجە)شیان بەسەر دا کراوە، کۆمەڵێکیش هەن لەم رووەوە بێ خەبەرن ئەگەرچی مسوڵمانیشن.

ئەوانەی وا ئا ئەو شتە دەزانن (مکلف) ن هەر لەو لەحزەوە کە دەیزانن دەست پێ بکەن پێشەکی بۆ دارێژن خۆیان ئامادەبکەن و کە حوکم بە ما انزل الله لە تەواوی زەمینەکاندا بکرێت.

ئەوانەی وا نازانن دیارە کەتا وەختێك دەزانن تەکلیفێکیان بۆ مەترەح نیە لەم زەمینە چونکە وەختێك ئنسان (مکلف) دەبێ شتێك بزانێت، جا ئەوانەی دەزانن (مکلف) ن ئەوانە ئاگادار بکەن کە حوکم بە ما انزل الله ئاوایە وە ئینسان (مکلف) ە حوکمی پێ بکات.

ئەمجارە ئەگەر گشتی بە یەکەوە جوڵاوە بە حاکم و مەحکومەوە بۆ ئەوە کە حوکم بە ما انزل الله بکرێت دیارە کە زۆری پێ ناچێ مەسئەلە حەل دەبێ.

بەڵام تەماشا دەکەین واقع وا نیە، بەڵکە بە عەکسەوە زۆرینـە هەمیشە کۆسـپن لە ڕێگەی حوکمی ما انزل الله.

کۆمـەڵێکیان لـە رووی جـەهل و عنـاد و کـوفرەوە، کۆمـەڵێکیش کـە تێناگـەن، ئەویش دەبێ تێبگەیەنرێن کە ما انزل الله لە تەواوی ژیانی ئنسان دایە تـەنیا نوێـژ و رۆژو مسوڵمان نیە.

لێرە ئەو کەسانەی وا هەست بـە مەسـئولیەت دەکـەن (مکلـف)ن دیقـەت بکـەن بزانن پێشەکی چی بۆ ئەو کارە چۆنە و لە کوێوە دەست پێ بکـات شـروعی بکـەن، بەڵام (مکلف) بە دەرەنجام نین.

یانی دەعوەت دەست پێ دەکەن بە چاکردنی خۆیان و خانەوادەیان و کۆمەڵ و ئەو وەختە چاکسازییە کە لە راست کردنی بینش و عەقیدە.

پێشەکی بۆ دادەنێن بۆئەم کارە وە بە تەواوی توانایانەوە دەست پـێ دەکـەن، جا ئیتر تا هەر کوێ چوون خودا هەر ئەوەندەیان لێ داوا دەکات یانی تا هـەر کـوێ توانایان هەیە.

بەس ئاوای لێدێت

١-کەسانێك وا بێ خەبەرن.

٢-کەسانێك وا بە خەبەرن، بەڵکو هیچ ناکەن یانی اقامە حجە کراوە بەسەریان، بەڵام کاری پێ ناکەن.

٣-کەسانێك وا بە خەبەرن خەریکن کار دەکەن .

ئەوانەی وا دەی زانن اقامە حجە کراون کاری پێ ناکـەن هـەر ئێـستا کـافرن کـە حوکم بە ما انزل الله ناکەن.

ئەوانەی وا بێ خەبەرن (مکلف) نین تا وەختێك خەبەر دار دەکرێن.

ئەوانەی وا ئیماندارن بۆیان رۆشن بۆتـەوە بـە تـەواوی ئیمکانـەوە خـەریکن کـار دەکەن ئەگەرچی ئێستا لـە بـێ ئیمکانـات کارەکـە سـنوردارە ئەوانـە تـەکلیف لـە کۆڵیان کەوتووە یانی وەزیفەی خۆیان ئەنجام داوە، ئیتر (معذب) نابن.

لە دوایی بۆچی حوکم بە ما انزل الله تان نەکرد، چونکە خودا دەزانـێ حـوکم بـە ما انزل الله شتێك نیە یەکسەر بکرێت و ئەنجامی، دەی ئەبێ پێشەکی بۆ دارێژی.

وە ئەوانە هەر وەك ئەوەیە ئێستا حوکم بە ما انزل الله بکەن.

بە مانایەکی تر لێرە تەسلیم و نیەتە ئەوانەی کە بە نیەت خـەریکن حـوکم بـە ما انزل الله دەکەن گەرچی لە واقیع رەنگە سەدەیەکی تریش ئیمکانی نەبێ، ئەوانـە حوکمیان بە ما انزل الله کردووە، کافر و ظالم و فاسق نین.

وە ئەوانەی ئاگادارن وە بە نیەتیش حوکم بە ما انـزل الله ناکـەن ئەوانـە کـافر و زالم وفاسقن.

لەبەر ئەوە وەختێك داوا دەکرێـت لـە ئینـسانێك کـە( تعهد)ی بێـت نـسبەت بـە عەمەلێك لە رێگەیەك تا پێیەوە بجوڵێ کە لەپێشدا بینشێکی دروسـتی نـسبەت بـەم عالەمەو خالقی عالەمی ئنسان و پەیوەندی هەر کام لەمانە بە ئەوی ترەوە لـە دڵـی ئەو ئنسانە جێگیر بێت.

بینش راست بکرێت لەم زەمینەیە کە پەیوەندی خودا لەگەڵ مەخلوقدا عبارەتە لە پەیوەندی خەلق و ئەمر کە لەمەو پێش تەوزیح دراوە، پەیوەندی ئنسان لەگـەڵ خالق و وە ئـەم عالەمـە لەگـەڵ خـالق وە ئـیتر مەعلومـە کـە پەیوەنـدی مـەخلوق و مەئمورە لەگەڵ خلق و ئامر دا وە پەیوەندی ئنسان لەگەڵ ئـەم کەونـە عبارەتـە لـە یـەك: ئەمـەی کەئنـسان مەعبودێکـە دارای هێـزی بیـنین و ئـەم عالەمـە ئایـاتن وە تەنزیماتێك لە بەینی بەشەکانی ئەم عالەمـە هەیـە بـە نـاوی سوننەت کەئنسان بـە بینینی ئەم ئایەتانە دەگاتە دەرکی ئەوان.

دوو: بە ناونیشانی ئەمەی کە ئینسان هەم دارای (اراد)ەیە دەتوانێت (تسلت) بکات بەسەر ئەم نیعمەتانە کە خودا پێی داوە، ئەم عالەمە (مسخر)ە بۆ ئنسان بەئیزنی خودا وە لە تەواوی نعمەتەکان کە خودا دایناوە ئیسفادەی لێ بکات.

دەی دەبێ لە پێشدا ئەم بینشە لە دڵی ئنسان جێگیر ببێ و رۆشن ببێتەوە.

مەودای ئەوە ئنسان ئەم بینشو عەقیدەیەی لە دڵدا جێگیر بوو (متعهد)ە بۆ هەر کارێکی خێر و چاکە و عەمەلی صالح.

ئەمە بەر لەوەی ئینسان بۆی رۆشن نەبێتەوە وە کاری ئەو چی یە ئەم کەونە وە پەیوەندی لەگەڵ خودا وە پەیوەندی لەگەڵ ئەم کەونە وە لەگەڵ ئنسان بە گشتی  چۆنە هێشتا بۆمان وجوزئیاتی بۆمانی بۆ رۆشن نەبێتەوە داوا کردنی ئیلتزام و(تعهد) لە زەمینەی( اعمال) یەکێ  لە دوو نەتیجەی هەیە.

١- یا ئەوەی کە ئەم ئنسانە بێ ئەوەی بزانێ چی ئەکات دەست ئەکات بە ئەنجامی کردەوەیەك چون تاریکە نازانێ بۆ ئەم کارە دەکات!؟

٢- یان چونکە نازانێت نایکا ملتزم نابێت

بە شێوەی دووەم دیارە هەوڵدان کە بێ ئەنجام دەبێ هەوڵدەدرێت بۆ ئەوەی ئەو کارێك بکات، بەڵام نایکات،

بە شێوەی یەکەمیش کە کوێرانە دەیکات، ئەمە شتێك نیە کە خودا گەرەکی بێ لە بەرنامەی خودا ئەمە رۆشن کراوەتەوە کە وەختێك شتێك لە ئنسانێك داوا دەکرێ ئەنجامی بدات دەبێ بە (بصیرە)بە بەرچاو رۆشنی ئەنجامی بدات.

وە یەکێك لەو زەمینانەی کە قورئان زۆر سەرزەنشتی( مشرکین )دەکات ئەوەیە کە لە کار و کردەوەیان تاریکن بێ ئەوەی بزانن چی دەکەن، فەقەت لەبەر ئەوە دەوترێ لە باب و ئەژدادیان پێیان گەیشتوە ملتەزمی بونە وە ئەگەرنا نازانن حەقە

یان باتڵە خێرە یا شەڕ. کەوا بوو بێ ئەوەی ڕۆشن بکرێتەوە داوای لێ بکرێت ملتەزم بێت بێ ئەرزشە.

ئا لەبەر ئەوە دەعوەتی پێغەمبەران علیهم السلام هەمیشە لەوە دەستی پێ کردووە کە بینشو عەقیدە وە مەسائلی سەرەکی عەقیدە بەر لە جوزئیات بۆیان ڕۆشن بکرێتەوە، دوای ئەمە کە ئنسانێك مەسائیلی سەرەکی عەقیدەی بۆ ڕۆشن کرایەوە بینشێکی دروستی بۆ پەیدا بوو، ئەمجارە داوای لێدەکرێ کە لە زەمینەی ئەو عەمەلی چاکە وا بە تەنها خۆی پێی دەکرێ ئەنجامی بدات بە ئەخلاقی چاك.

وەختێك کە کەسانێکی جۆراو جۆر پەیا بوون کە بینشیان ڕاست کرابوو وە لە زەمینەی ئەخلاقی تاکی دا هەر کام بۆ خۆی ئلتزامی دەرکەوتبوو، ئەمجارە تەکالیفی کۆمەڵە پەیا دەبێ کە ئەمجارە لێیان داوا دەکرێت کە کارێکی وا بە کۆمەڵ ئەنجامی بدەن.

مەراحل بە جوانی ڕۆشنکراوەتەوە کە لە سورەتی عصر خودای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَٱلۡعَصۡرِ ١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ٣﴾.

لە پێشدا سوێند دەخوا بە زەمانە کەکەسێك لەم زەمانەدا بکۆڵێتەوە نیشانیدەدا کێ زیان دارە کێ زیاندار نیە.

هەرچی ئنسانە وان لە زیان بێجگە لەگروپێك کە چوار سیفەتیان هەیە.

١- ئەوەیە ئیمانیان بێت.

امنە : (افعال) ریشەکەی (امن) بە مەعنای تەماس ترس کەوتنە ئارامی.

امنە: یانی دارای ئارامی لە دوای ئەوە لەحاڵەتی نائارامی ئەم حاڵەتە تازەیەی بۆ پەیا بوو کە لە ئەمن و ئارامیدا بێت.

ئەمـەش دۆخێـك دەبێـت كەئنـسان دوای لـە نـاو تـاریكی جاهیلیـەت وەك ئـەو كەسەی لە شەوی تاریكدا هەنگاو ئەنێ نازانێ بـەرەو كوێ دەڕوا ئایـا پێشی چـاڵە یان چیە.

دوای ژیان لە ناو ئەو تاریكیە وەختێك نوری هیدایەتی پـێ دەگـات بـۆی رۆشـن دەبێتەوەو دێتە ناو ئـەو مەیدانـە رۆشـنەوە بـە تـەواوی وجودیـەوە لـە دەروونـەوە تەسلیم دەبێ.

كە ئا لەم شێوەی (امن) ی بۆ پەیدا دەبێ ئەمە تەسلیمی دەروونە (ئیمان).

دوای ئەمە كە ئەم تەسلیمە دەروونیەی بۆ پەیدا بـوو، جـا هـەر لـە تـەرەفی ئـەو كەسـەوە كـە ئـەم نـورەی پێـدراوە تـەواوی لایەنگیریـە دەرەكیـەكان ئەكرێنـە دوو بەشـەوە (١) صـالحات (٢) سـیئات كـە ئـەو ئنـسانە بـە (اقتـزا)ی ئـەو شـوناس و تەسلیمە دەروونیە مولتەزم دەبێت بـە ئـەنجامی كـار و كـردەوی چـاك (صـالحات)، دوور كەوتنەوە لە (سیئات)، ئەمە هەنگاوی دووەمە ئەوانەی وا خۆی تەنها دەتوانێ ئەنجامیان بدا لە پێشەكی كاردا هـەن ئەوانـە یەكـەم جـارن كارێك وا پێویـستی بـە كەسـی تـر نیـە لـە دوایـی راسـتكردنەوەی بنیـشو پـەیابوونی تەسـلیمی دەروونـی، دەست دەكات بە ئەنجامدانی ئەوانە.

وەختێك چەند كەسێك ئاوا دوو سێ بوون ئەمجارە نۆبـەی ئەوەیـە هـەر كامیـان ببێتـە (چـاودێر) ی ئـەوانو بـە دلـسۆزی چـاو دێـری ئـەوانی تـر بكـات بـە شـێوەی هاوبەش.

یانی ئەوەی خودا پێـی داوە بـە حـەق بـە ئـەوەی تـری رابگەیـەنێ وە ئەوانـەی لەگەڵ یەكن پشتی یەك بگرن بۆ ئەوەی بوێرانە ئەم كارە بكەن، وەك لەم حەدیـسە دەفەرموێت :

(المؤمن للمؤمن كالبنیان یشد بعضه بعضا).

باوەڕدار بۆ باوەڕدار کۆمەڵەکەیان وەك بینایەك وایە کە چۆن خشتەکان یان بەردەکانی ئەم بینایە پاڵ ئەدەن بە یەکەوە یەکتر ڕاگیر دەکەن و پشتگیری ئەوانە بۆ یەکتر بنایەکی دروست دەبێ.

کۆمەڵەی ئیمانداران ئاوانە دەبێ پشتگیری یەکتر بکەن.

دەی لەبەر ئەوە لازمە وەسیەتی حەق بۆ یەکتر بکەن لەسەر ئەوەی ئەو حەقەی کەوتونەتە سەری بمێنێتەوە و پایەداریان بێ.

﴿وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ﴾.

ئەمجارە جولانەوە لەڕێی حەقە، هەروا کە لە زۆرێك لە ئایاتی قورئاندا بەیانکراوە لە (قصص المرسلین) وە لە غەیری ئەودا ملتەزمی خۆڕاگری مشکلات و زەختی زۆر حەتمەن ئینسانێك حەقی قبوڵ کرد بە مقداری ئلتزام بەو حەقە بەو مقدارە دەردەسەر و ئەزیەت و ئازاری بۆ فەراهەم دەبێ.

بۆ نمونە / لەیەکەمەکانی سورەتی ابراهیم دەفەرموێت:

هەرچی پێغەمبەر بووبێ علیهم السلام قەومەکانیان وتویانە پێیان یان لەو ولاتە دەربەدەرتان دەکەین یان ئەبێ بێنە سەر ڕەوشت و بەرنامەی خۆمان.

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا﴾.

ئیمکان نیە ئینسان حەق قبوڵ بکات تووشی دەردی سەر نەبێ. جا دەردی سەرو ئەزیەت و بەڵاو ناخۆشی لەو وەختە بەعزە ئینسانێك ئیحتمالی هەیە شکست بخوا و بچێتە دواوە، لەبەر ئەوە لازمە لەسەر هەر کەسێك لەو کۆمەڵە هۆشی بە ئەوانی تر ەوە بێت. وە سەبر بگرێ لەگەڵ ئەوانی تر دا یانی هەر کامیان بەرپرسی ئەوەیە کە چاوی لەوانی ترەوە بێت.

وەختێك تووشی گرفتارێك دەبن ئامۆژگاریان بكات بۆ ئەمە كە لەسەر ئەو دەردی سەری و موشكلاتە بمێننەوەو خۆ راگرن، سەرەنجامی خۆ گرتن لەسەر ئەمە چۆنە لەم جۆرانەكە دڵگەرم و خۆراگر بێت.

ئا ئەمە تەنها رێگەیە كە ئنسان لە (خسران) رزگاری دەبیٚ وە لە نەتیجە خۆشی چاوەڕوانێتی.

وە بینا لەسەر ئەم قاعدە نا دروستە ئنسان وەختێك (مواجه) دەبێت لەگەڵ كۆمەڵێك یان لەگەڵ كەسێك كە بنشیان زۆر تێكچوە لادانی عەقیدەییان تێدا هەیە یان لە زەمینەیٚ (التزام وتعهدات) لەكردەوە دا جۆرێكیان ئەسڵەن هەر نایناسن لێی تیٚ ناگەن، خەریك بێت شتێك لە جوزئیات بۆیان چاك بكات.

بۆ نمونە / كەسێك لە بینشو عەقیدە زۆر زۆر دوورە لە ئنسانی مسوڵمان ئەو بێت خەریك بێت لەگەڵی كە غەیبەت كردنی پیٚ تەرك بكات یا نەزەر نەكردن وە غەیری ئەمە.

ئەمجۆرە شتانە ئەگەر مۆفەق بوون قبوڵ كرا كە غەیبەت نەكاتو نەزەر بە نامەحرەم نەكات بە عنوانی بەعزە شتێكی بیٚ ئەساس و بیٚ پایە بۆمانی قبوڵ كردووە نازانیٚ بۆچی تا وەختێك كە بینشو عەقیدەی رۆشن نەكرێتەوە وە مەسائلی ئەساسی بە تەدریج مەترەح نەكریٚ بۆی ( تعهد)یان نەبیٚ خەریك بوون بە مەسائلی جوزئیەوە هەروەك ئەوەیە كە لە كوردی دەڵیٚ( گاڕان بە گردەوە رۆییشتووە پیرێژن لە گۆڵكە سۆرە دەپێچێتەوە).

بە ناونیشانی سەنەدێك زۆر بەهێز لەم روەوە ملاحەزە كردنی نازڵ بوونی (احكام) لە تەرەف خواوە لە قورئاندا بۆ مسوڵمانان.

بۆ نمونە / مەسەلەیەكی ئەساسی وەك (ربا) كە پشتی ئنسان دەشكێنیٚ وە هەتا لە سورەتی بقرە وەختێك كە تەبینی دەكات بۆ مسوڵمانان وە بەیانی دەكات

که ریبا خۆر له دنیا و له قیامەتدا تیا چۆنه ئەفـەرموێ: ئەگـەر کەسێك هـاتوو لـه دوای ئەمه که حەقی لەم زەمینه دا بۆ رۆشن بۆتەوه هەر دەستی نەکێشاوه ئـەوه ئـیتر هەمیـشه وا لـه دۆزەخ وه ئـەوه (کفـار اثـم)ه نافـەرموێ (کـافر) دەفـەرموێت (کفار) زۆر زۆر کافره (أثم) نافەرموێ (آثم) زۆر زۆر گوناح کار وه تـەنها گوناحێکـه که خودا دەفەرموێت: دەستی لێ ناکێشن دەبێ بزانن، که خوداو پێغەمبـەری خـودا علیـه الـصلاة والـسلام لەگـەڵتان جـەنگ دەکـەن، دەی ئـا ئـەم مەسـەله ئەساسـیه تەماشا دەکەین له سورەتی بقره له ئـاخری نـازڵ دەبێـت، کـه تـاریخی نزولـی بـەو جۆرەی که لەو کتێبەی پەیوەستن بـەم مەسـائیلەوه بـەیانی دەکـات نزیکـی سـاڵی هەشت و نۆی هجریه یانی ١٢ ساڵی مەکەو دەوری حـەوت هەشـت سـاڵی مەدینـەش هیچ لەو ئاخرەی دەورانی رسالەت نازڵ دەبێ بۆ ئەمه مەگەر شـتێکه کـه خـودا زۆر گرنگی پێنەداوه یان لەبەر ئەمه بووه که پێویستی هەیـه بەوەنـده پێـشەکی چـنین ئــەبێ لــه پێــشدا ئــەم ئنــسانه رۆشــن بنــەوه و دەرونیــان تەسـلیمی ئـا ئــەو بینشەی(عقیده) پێیان دەدرێت ببێت و فێربن به ئلتزام و (تعهد) له هەر زەمینەیەك کەپێیان ئەدرێت تا دوایی ئا لەم زەمینەش حوکمیان بۆ نازڵ دەبێ.

له مەسەلەی تەحریمی شەراب تەماشا دەکەین (حەد الاقـل) لـه سـاڵی سێیەمی هجری که ١٦ ساڵ له دوای دەست پێکردنی بونی قورئان نازڵ دەبێ.

وه هەروەها زۆرێکی تر له مەسائیلی ئەساسی بۆمان گشتی بەیانی دەکات، کـه پێش لەوەی له هەر زەمینەیەك ئنسان چاوەروانی بێت خەڵك مولتەزم بن به کارێـك له چاکه یان مونکەرێك تەرك بکـەن ئـەبێ لـه زەمینـەی راسـت کردنـەوەی بیـنش و عەقیده سەرەتا کار بکات، دوای ئـەوه لـەوه تـەئمینی پـەیابوو ئـەمجاره مەسـائلی فەردی ئەخلاقی ئەوجاره که کۆمەڵێك پەیابوون لەناو ئەوانه به ئەنـدازەی پێویـست

چەندێك لە ئەحكامی بۆ ئەكرێت ئـەو كۆمەڵـە مولتـەزمی بـن ئەوانـەیان بـۆ مـەترەح دەكرێ.

شرك لە فەرمانرەوایی و قانونگوزاری ئایەی ٣١.لە سورەی‌توبە خـودای گـەورە دەفەرموێ:

لە جوابی شەریك بۆ خودا قەرار دان لە قانون گوزاری رۆشـن كراوەتـەوە وە زۆر ئایەتێك لەم زەمینە قابلی تەوجیهە كە چوار دانە لە مستەلەحاتی گرنگ لەو ئایەتـە شەرح كراون بۆ ئەوە دەشێت ئنسان هەمیشە ئەم ئایەتەی لەبیر بێ تا ئەوانـەی لـە رووی عینادەوە لەم زەمینەدا دەست دەكەن بە نارەوا وتـن جێـی قسەیان نـەمێنێ ئەفەرموێ:

لە زەمینەی باس لە حالی اهلی كتاب و انحرافاتیان لە دوای ٢٨ ئایەت كە كـار لەگـەڵ (مـشركین) دەبرێتـەوە، مـەوزوعی مـسوڵمانان نـسبەت بـە(مـشركین) بـەیان دەكات لە ئایەتی ٢٩ دێتە سەر بەیانی بابەتگیری مسوڵمانان لەگـەڵ ئـەهلی كتـاب، جا بۆ ئەوەی هیچ جۆرە ئشكالێك بۆ مسوڵمانان نەبێت، لەمەكـە خـودا دەسـتوریان پێدەدا كە (مقاتلە) بكەن، لەگەڵ ئەهلی كتـاب مـسوڵمانان نـەڵێن جـا چـۆن بـچینە جەنگی بەڵامن قتالیان لەگەڵ بكەین لە حاڵێكدا علمایـان هەیـە اهلـی كتـابن و نوێـژ دەكەن و انحرافاتیان بـەیان دەكـات چ (عـەوامیان چ خاصـیان علمـا احبـاو رهبـان) نیان كە ئیتر مسوڵمانان بەهانە یەكیان نەبێ یەكێك لە انحرافاتەكـەیان ئەمەیـە كـە ئەفەرموێ:

﴿ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَـٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓا۟ إِلَـٰهًا وَٰحِدًا ۖ لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾.

جارێکیان وشەیەکی تێدایە مەعنای لوغەویەکەیان تەوزیع بدەین:

اتخذ : یان لە وشەی (تخذ) یان (اخذ) ەوەیە ریشەی ئەسڵیەکەی لە مەعنای (مقرر) کردنی شتێك بە شێوەی بەرنامە بۆ قەرار دان بریاردان لەسەر شتێك کە ئاوا بێت لێرەو لا.

(احبار) : کۆی (حِبر) ریشەکەی (حِبر) بە مەعناس مەرەکەب جا مەرەکەب ئەوەتا شوێنەواری بەسەر کاغەزەوە جێ دەمێنێ لە دوای ئەوە لەم وشە وشەی (حُبر) یان دروست کردووە بۆ عالم کە شوێنەواری جێ دەمێنێ لە ناو خەڵکدا هەڵبەتە بەعزە کەسێك بە (اشتباه) وا دەزانن وشەی (حبر) فەقەت بۆ علمای یەهود بەکار دەبرێ، هەروا کە وەختێك لە ئایەتێك لە ئایاتی قورئان دەلیلیان بۆ دەهێنرێتەوە دەڵێن: جا ئەمە پەیوەستە بە( مشرکین) یا بە (نصاری )غەیری بۆمان بۆ ئەوەی هیچ قسەیەکیان نەمێنێت ئیشارە دەکەین :

کە بە ابن عباس رەزای خودای لێ بێت دەوترێ (حُبر الاُمة) کە ئەو (مفسر)ی قورئان بوو لەناو صەحابە تا ئەم لەقەبەی پێ درا ئەوە ئیتر بزانن (حُبر) بۆ عالمی مسوڵمانانیش بەکار دەبرێ.

رهبان : کۆی (راهب) لە مەصدەری (رَهَبَ) بە مەعنای ترسان و لەرزش لە مقابلی شتێك بە جۆرێك ئینسان حەزەر بکات و بگەرێتەوە لە ترسی ئەم شتە بە ئەو کەسانە لە (نصاری) لە مەسیحیەکان ئەچوون گۆشەگیریان دەکرد وبۆ خۆیان رەوشتێکی خاصیان بوو بۆ عبادەت ئەوترێت (رهبان) بە شێوەی کۆ و هەر کەسێکیان (راهب) کە لە ئەوەڵەوە لەبەر ترسی خودا وە لەحەزەرێك لە تەقواوە بوو کە ئەم کارەیان کردووە بەڵام لە دوایی ئیتر ئەمە بووە لەقەب بێ ئەوەی ئەو کەسە ترسی تیا بێ یا نەی بێ.

که راستی ئەمە لە ئەم میللەتەی ئاخر ئەوان وا گۆشەگیری دەکەن ریازەت دەکەن بە عنوانی لەخوا ترس و تەقوا وەلی لە ناو خەڵکدا مەشهورن تەبەقەی مەشایخ.

وشەی (یعبد) کە لە عبادەت تەوزیح دراوە.

إلە: فەرمانڕەوایان و فەریادرەسان.

ئەفەرموێ ( ئەهلی کتاب عالمەکانو راهبەکانی خۆیانیان بە عنوانی (ارباب)

ارباب : کۆی (رب) ە کە ئەویش چەن دانە مەعنای هەن دویان فەرمانڕەوا و فەریادرەس هەروەك وشەی اله.

ارباب و فەرمانڕەوا و فەریادرەسی خۆیان لە خواری خوداوە قەراریاندا کردنیان بە فەرمانڕەوای خۆیان، بەمە کە قانون و بەرنامەیان لێوەردەگرن وە کردنیان بە فەریادرەس خۆیان، لەمە کە هاواریان لێ ئەکەن و ئەیانکەن بە وەسیلەبۆ لای خودا.

جا یەکەم مناسەبە لەگەڵ (احبار) دوەم لەگەڵ (رهبان) وە هەروەها مەسیحی کوڕی مریەم ئەوان کردیان بە (رب) ی خۆیان ناویان نا کوڕی خوا کردیان بە (الە) فەریادرەسی خۆیان، لە حاڵێکدا دەستوریان پێ نەدرا لە کتێبەکانیان بێجگە ئەوەی کە بەندایەتی و عبادەت بۆ (الە) بکەن کە غەیری خودا ئەو (الە) ەکی تر نییە، دوورە و پاکە بۆ ئەو شرکەی ئەوان تووشی دەبن.

ئەمە لەم ئایەتە رۆشن کراوەتەوە کە قبوڵ کردنی فەرمانێك لە غەیری خودا دروست قەراردانی ئەو شەخصەیە (رب) بە (الە) بە (معبود) بە شەریکی خودا وە یا هاوار کردن لە کەسێك غەیری خودا هەر بەو شێوەیەیە.

خۆ ئەوان (احبار و رهبان) یان بە ناونیشانی خالق و رازق محی وممیت ئەوانە نەزانیوە بە عنوانی زانایەك شەیخێك و راهبێك بۆمانیان ناسیوە، تەنها مەوزوعێك

که بویانه له بەرامبەری (احبار) و (رهبان) ەوەئەمە بوە کە نسبەت بە (احبار) ئەو عالمانە فتوایان بۆ داون فتوای بێ (استناد) بێ ئەوە لەسەر کتێبی خودا بێ بە هەوەس و ئارەزووی خۆیان بەلآمنیش لەوانیان قبولّ کردووە.

وە لە (رهبان) یش ئینتزاریان کردووە کە واستەیان بۆ بکات لەلای خودا و جلبی نفع و دەفعی زەرەرێك بەو رێگەیە بکرێت، حەتا حەدیسێك لەم زەمینەیە دا هەیە لە مەوردی تەوزیحی ئەم عدی کوڕی حاتمی تائی لە ئەم ئاخرەی دەورانی مەدینەوە مسولّمان بوو وەختێك مسولّمان بوو چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەر علیە الصلاە والسلام سەلیبێك لە ملی دابوو، هەر کە دیاری دا لە دوورەوە پێغەمبەر علیە الصلاە والسلام ئەم ئایەتەی خوێندەوە، ئەویش عەجیبی کرد چونکە لە ناو (نصاری) بوو تەواو لێی تێك چوو بوو هەتا وەك سائری عەرەبەکان نەبوو چونکە ئەوان دەیانزانی (رب)و ( الە) غەیری بۆمان بە جوانی چۆنە ئەو بینشەکەی تێکچووبوو، وتی: جا خۆ (احبار و رهبان) یان نە بە (رب) و نە بە (الە) نە بە شەریکی خودا قەراردداوە کەی ئاوا بووە.

پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام فەرمووی : (احبار و رهبان) حەلآلّیان بۆ حەرام دەکردن و حەرامیان بۆ حەلآلّ دەکردن وە بەلآمنیش لێیان قبولّ دەکردن ئا ئەوە بوو بە مانای (الە) (رب) شەریك دانان بۆ خودا.

ئەوە لەم ئایەتەشدا وەك ئایەتەکانی پێشوو کەمترین فەرمانێك قبولّ بکرێت بەبێ ئیزنی خودا شەریك دانانی ئەو کەسەیە وا فەرمانەکەی لێ قبولّ دەکرێ کردنیەتی بە (الە) و (رب) و (معبود).

جا لەو ئایەتە چوار دانە (مسطلح) رۆشن کراوەتەوە شایەنی تێرامانن:

١-(رب) بە شێوەی کۆ هاتووە (ارباب) لێرەدا (رب) بە مەعنای کەسێك وا قانونێك دابنێ بۆ خەلّك فەرمانێك دەربکات بۆ خەلّك یان کەسێك ببێتە واستە بۆ

ئەوان بچنەلای‌و داوای لێ بکەن کە ببێتە وەسیلەیان لای خودا بۆ جەلبی نەفع و دەفعی زەرەر بۆ بۆمان بەکار براوە، ئەمە دەبن بە دوو دانە لە ماناکانی (رب) لە دوایی زیاتر روون دەکرێتەوە کە (٥) مانای هەیە دویان فەرمانڕەواو فەریادڕەس.

٢-اله : کە لێرە بە شێوەی رەخنە دەفەرموێت ئێمە تەنها وتبومان یەك (الە) عبادەت بکەن ئێستا بۆمانیان کردووە بە (الە) ی خۆیان، یانی ئەگەر کەسێك فەرمانێك دەربکات تا بە ئارەزوو هەوەسی خۆی بە بێ استناد لەسەر بەرنامەی خودا، ئەوە بوە بە (آلە) ئیددعای (الوهیە) تی کردووە وە خەڵکیش لێی قبوڵ بکەن قەبوڵیان کردووە کە (آلە) بێت.

وە هەروەها کەسێك بکەن بە واسیتە و وەسیلە مادەم قبوڵیان کردووە وشەی (آلە) ی بۆ بەکار دەهێندرێت.

وشەی سێیەم بە شێوەی فعل هاتووە لێرە (لیعبد) عیبادەتی یەك (آلە) بکەن.

یانی قبوڵ کردنی فەرمان لە غەیری خودا وە قەراردانی کەسێك بە شێوەی واسیتە بۆ لای خودا ئەوە دەبێتە عیبادەت.

وە لە ئاخیرەوە دەفەرموێت: کەسێك ئاوها قبوڵ بکرێت کە فەرمانێك دەربکات وە کەسێك بکرێت بە واسیتە لە بەینی ئینسان و خودا ئەوە کراوە بە شەریکی خودا.

بۆمان چوار دانە وشەی زۆر گرنگن ئەگەر رۆشن بن بۆ ئینسان هیچ جۆرە (ابهام) ئیشکالێکی لەو جۆرە زەمینە سەرەکیە بۆ نامێنێتەوە.

دەی تا ئێستا باسی ئەوە کرا کە ئنسان هەروا کە دەبێ غەیری خودا خالقێك وە یا ئامرێك بە (امر تسخیری) قبوڵ نەکات وە ئامریش بە (امرابتلائی) یانی فەرمانڕەوایەتیشی قبوڵ نەکات.

ئێستا یەك مەسەلە مەترەح دەبێ ئەویش ئەوەیە کە لە قورئاندا تەواوی (احکام) بۆ تەواوی( زەمان و مەکان) کاتو شوێن و شەرعیەتەکان نازڵ نەبووە وە سونەتیش کە تەبینی قورئانی کردووە تەواوی (احکامی) جوزئی تیا نیە، فەقەت ئەوەی تێدایە کە لەو زەمانە پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام رێی پێ کەوتوون و تەبینی کردووە بەجیاکەرەوەی هەندێك کە هیچ وەختێك ناگۆرێ. دەی لەبەر ئەوە چارە نیە ئنسان دەبێ لە غەیری خودا فەرمان قبوڵ بکات.

لە مەسائلی جوزئیاتەوە تەنیا ژیانی پێناکرێت وە ئا هەر ئەمە بووە بە سەبەبی ئەوەی کە (إجتهاد) پەیا بێت لە دوای ئەمە کە شورا نەماوە مەزهەبی جۆراو جۆر هاتونە ئێستا چارەی بۆمان چۆنە قبوڵ کردنی حوکمێك لە (مجتهد) هەر حوکمی ئەوەی هەیە دانانی (ارباب) یا (معبود).

لە سورەتی نساء لە ئایەتی ٥٩ سێ سەرچاوە( مصدر) دادەمەزرێن بۆ ئەوەی کە مسوڵمانان روی تێبکەن‌و دەستور و فەرمانی لێ وەرگرن.

لە زەمینەی نیعمەتە مادیەکاندا لە پەیوەندی لەگەڵ ئیستفادەی ئنسان، ئەو نیعمەتانە خودا کردوونی بە دوو بەشەوە، بەشێك لەم نیعمەتانە ئەوانەن کەهەر ئەو جۆرە وا خەلق کراون قابلی ئیستفادەن بۆ ئنسان وە پێویستی بە هیچ جۆرە تایبەتمەندیەك(تخصیص) نیە هەر کەس بە پێی نیازی خۆی دەتوانێ ئیستفادەیان لێ بکات وە بۆ نمونە هەوا – گەرما – رۆشنایی – ئاو.... ئەم بەشە لە نعمەتە ماددیەکان ئیحتیاجی بە (اهلی تخصص) نیە گشتی وەك یەك ئیستفادەیان لێ دەکەن.

بەڵکو بەشێکی تر لە نیعمەتە مادییەکان هەن کە ئەگەر بە شێوەی جوزئی لە ئیختیاری ئنساندا قەرار بدرایە هەروا زایە دەبوون و بە فیڕۆ دەچوون‌و ئنسان

نەیدەتوانی ئیستفادەیان لێ بکات وە نەدەمانەوە بۆ زەمانێکی دی کە ئنسانی ئەو زەمانە ئیستفادەیان لێ بکات.

بۆ نمونە / ئەگەر بهاتایە خودا لە جیات ئەوە مەعدەنی ئاسنی خەلق بکات تەواوی ئەم صناعەتە لە ئاسن دروست دەکرێت خەلقی بکردایە ئیستفادەی چی دەبوو ئنسانی چەند قەرن لەمەوبەر نە ئیستفادەی لەم شتانە دەکرد وە نەنیازی بوو، دەی نەتیجە دەبوو بەوەی بەڵامن هەروا بمانایەوە و ژەنگ بیگرتبان وەبە عزێکیان لەناو چووبان بۆ ئەوانەی دوایی کە دەتوانن ئیستفادە لەم شتانە بکەن نە بەڵامن پەکیان دەکەوت.

بۆ نمونە / ئەگەر تەلەفزیۆن پێشتر هەبوایە ئیستفادەی چیبو،خۆ کارەبا نەبوو، خەڵك بۆچی بەکاری دەهێنا.

جا ئاسن پێشتر و ئێستاش بە شێوەی( کلی)گشتی دەردەهێنرێت ئنجا بە شێوەی جوزئی شتەکانی لێ دروست دەکرێت.

سەیارەو سیلاح و شتی تر.

لەبەر ئەوە ئەم دەستە لەنعمەتەکانی ماددە، گشتیەکەی دروست کردووە وەك (معدنی ئاسن) (نفط)،ئیستفادە لەمانە پەیوەستی کردووە بە نیازی ئینسانەوە کە لەهەر زەمان و مەکانێکدا بە پێی پێویستی خۆیان بڕی خۆیان لەم مادە جزئیات دروست بکەن.

یانی لێرەدا مەسئەلەی (اجتهاد) و (اختصاص) مەترەح دەبێت، بەشێك لە ئنسان کە ئیستعدادیان زیاترە دەبن بە (مجتهد) وە (إخراجی) (جُزئیات) لەم (کُلیات)ە دەکەن.

هەرواش لە زەمینەی نعمەتە مەعنەویەکاندا خودا کردوونی بە دوو بەشەوە:

١-بەشی بینشو عەقیدە ئەوە بەتەواوی بە گەورە و بچوکیەوە خودا خۆی تەبینی کردووە مەسائیلێك وا ئێمە موکەلەفین بە ئیمان هێنان بەو مەسائیلە، ئەوانەی کە فەقەت وەزیفەی ئنسانن ئەوانە بە تەواوی رۆشن کراونەتەوە کە زۆرینەی قورئان خەریکی ئەوانەیە وەك تەوحید و ئاخرەت و جزئیاتی بۆمان.

٢-(احکام واعمال : ئەوانەی وا شەرائتی زەمان و مەکان دەخالەتی تیایاندا نیە تا ئنسان لەم کورەی زەویە هەیە ئنسان بەسەریەوە دەژی ئەو (احکام)ە متەناسبن نەگۆرِن لەگەڵیان، ئەوانیش هەروا بە شێوەی جوزئی بەیانکراون، وەك لە قورئاندا کەیفیەتی دەست نوێژ - رۆژو - حج وە شتەکانی تر وە یا بەعزێکی دیکە لە قورئاندا تەنزیم و تەرتیب نەدراون، وەك کەیفیەتی ئەدای نوێژ ئەمە لەسونەت بەیانکراوە ئەمە بەشێکیان بە پێی شەرائتی زەمان و مەکان ناگۆرِێن.

بەڵکو (احکام) زۆر تری ئەو لایەنگریە دەرەکیانەی وا بۆ ئنسان مەترەحە پەیوەندیان لەگەڵ شەرائتی زەمان و مەکان دا هەیە (کاتو شوێن).

بۆ نمونە / احکامی اقتصادی - احکامی سیاسی - احکامی اجتماعی.

بۆمان بە جیاکردنەوەی بەعزێك لە جزئیاتیان:

وەك بۆ نمونە / لەزەمینەی (اقتصاد) لەتیکە نانێك بەسەر نەکەوتنی کاتێ ئنسان بەلای دا دەروات.

بە بێجگە لەو جزئیاتە کەمەی کە ناگۆرِێن بەقیەی (احکامی جزئی) لەم زەمینانە بە پێی شەرائتی زەمان و مەکان دەگۆرِێ وە لەبەر ئەمە لە قورئاندا تەنها (کلیات) بەیان کراوە.

هەروەك چۆن (معادن) لە نعمەتەمادیەکاندا (کلیات) دروست کراوە.

وه بـۆ (اسـتخراج)ی دەرکردنـی ( احکـامی جزئـی) لـەم (کلیـات)ە بـەر لـە هەمووکەس هەر ئەوەی کە ئەم وەجبە بە سەری نازلْ بووە پێغەمبەری خـودا علیـە الصلاة والسلام موکەللەف کـراوە بـە دەسـتپێکردنی لـەم زەمینـە بـۆ تـەبینی ئـەم( احکامە کلی)ە.

هەڵبەتە دیـاری تـەبینی ئـەم احکامـە بـە تەناسبی شـەرائتی مکـانی و زەمانیـە (کاتو شوێن).

یانی ئەو جارێك نمونەیەکی دیـار کـردووە کـە چـۆن (استخراج) کردنـی قـانونی (جزئی) لە (کلی) وە چۆن تەتبیق کردنی قانونی خودا.

پێغەمبەر علیە الصلاة والـسلام جارێـك نیـشانی بەشـەریەتی داوە بـەخۆی و بـە شـاگردانی دەسـتپەروەردەی خۆیـەوە نمونـەی بۆیـان داوە کـە چـۆن لـەم قانونـە (کلی)ە (جزئیات) دەربهێنن پیادەی بکەن. جا ئیتر دوای ئەوە بە کتاب و سـوننەت کە نمونەیە بۆ بەشەر کە لە رووی ئەوەوە دووبارە ئەم قەوانین و گشتی کتابـە جـێ بەجێ بکات.

خودا لەم عالەمە خۆی بەسەرتە هەروا باسمان کردوە لەمەو پێش کە تەوحیـدی (افعال)ی غەیری خودا فاعل نیە.

بەڵکو لە غەیری شێوەی استسنائیدا کە مەشیئەتی تایبـەتی دەکەوێتـە کـار لـە زۆریێ لە شێوەکاندا (افعال)ی خودا لە رێگەی (اسـباب) هـۆ ئـەنجام دەدرێـت، ئـەو هۆیـەش بەشـێکی زۆریـان (جـبری و تـسخیری) بـن، بەشـێکی کـەمیان (اختیـاری و ابتلائی) بن.

یانی بە تەعبیرێکی تـر بەشـێکیان غـەیری ئـیرادەن وە بەشـێکیان بـە ئـیرادەی ئنسانەوەیە.

ئەمجارە قەرارە فەرمانێك غەیری خودا نەبێت نە لە زەمینەی (تسخیر)ی وە نە لەزەمینەی( اختیار)ی ابتلائیدا.

خۆ ئێستا لە (اختیار)دا لەولاشەوە ئێمە وتومانە ئێمە هەین و سوننەت کە تەبینی کتابە غەیری ئەوە ئیتر ئیستعدادات بە هیچ شتێکی ترەوە نیە.

ئێستا دەبێ چی بکەین لە لایەکەوە دەبێت غەیری خودا (امر)ێك نەبێت، لەلایەکی شەوە ئەم ئنسانە لە زەمینەی( احکامی جزئیدا) بێجگە لە کتاب و سوننەت کە زەوابتێکە هیچی تریان نیە.

چارە لەم زەمینە ئەوەیە کەوا وتمان ئەم ئنسانە و ئیستعداداتەکانی ئنسانیش وەك سائری موجودات (اسباب)ن بۆ (افعال)ی خودا.

ئەبێ بەم شێوە کە خودا خۆی (مقرر)ی کردووە ئەو ئیستعدادانەی ئنسان ببن بە مەزهەری ئەمرەکانی خودا.

لە هەر زەمانێك و لە هەر مەکانێکدا تەواوی ئیمانداران بە شێوەی شورایی لەم زەمینەدا( اقدام) بکەن یانی چۆن هەر ئیستعدادێك سەبەبێکە لە ئەسباب بۆ فعلی خودا ئەبێ هیچ ئیستعدادێکی (علمی) یان (إراد)ەیی نەخرێتە لاوە هەمووی لە پێش چاو بێت.

ئیستعدادێك زیاتر لەخۆی کاری لێ داوا نەکرێت وە واشی لێ نەکرێ کە کەمتر لە خۆی بکات.

تەواوی ئیستعداداتەکانی تەواوی کەسەکان لە (علم و ارادە) کۆ ببنەوە لە ئەو کلیاتەی قورئان.

ئەوەش تەنها شێوەیەکە خودا خۆی دایناوە بۆی، ئەمەیە لە هەر زەمانێك لە هەر مەکانێك دا تەواوی ئیمانداران بە شێوەی شورا لەم زەمینە کار بکەن.

یانی چۆن هەر ئیستعدادێك سەبەبێکە لە فعلی خودا ئەبێ هیچ ئیستعدادێکی (علمی یان إرادەی) نەخرێتە لاوە هەمووی لە پێش چاوەوە بێت.

ئیستعدادێك زیاتر لە خۆی کاری لێ داوا نەکرێ وە داواشی لێ نەکرێ کە کەمتر لەخۆی کار بکات.

تەواوی ئیستعداداتەکانی تەواوی کەسەکان لە زەمینەی (علم و إرادە و إقدام) کۆ ببنەوە لە ئەو (کلیات)ەی قورئان بە شێوەیەکی گونجاو زەوابتێك کە بە شێوە (مبین) هەیە جزئیات دەربهێنێ.

ئەگەر بەم شێوە بوو :

١- ئیستعدادەکان وەسیلەی خوا بوون بۆ( افعال)ی خوا لە قالبی بۆمان وە خودا کاری کردووە.

٢- خۆی لە کتێبەکەی بە رەسمی ئەوەی ناسیوە کە ئەگەر شورا بوو (واجب الاتباع)ە.

وەختێك ئیستعدادەکانی ئەم کۆمەڵە ئیماندارە کە بۆمان ئەسبابن بۆ (افعال)ی خودا بکەونە یەك بەو جۆرە کەخودا دەفەرموێت: بەشێوەی شورا وە بۆمان کۆتایین بەفەرمانێك لە زەمینەیەکدا وە( إتفاق) ببێ لەسەر ئەمرێك لە زەمینەیەکدا ئەو ئەمرە بە ئەمری خودا حسێب دەکرێ.

وە بەم شێوە هەروا کە لە زەمینەی (خلق)دا فەقەت خودا بووە وە لە زەمینەی ئەمری تەسخیری فەقەت خودا بووە لە زەمینەی ئەمری ابتلائی هەر ئەوە و کەسێك نەبووە بە شەریکی خودا.

چون چارەیەك غەیری ئەمە نیە، لەبەر ئەوە خودا ئەمەی بە رەسمی ناسیوە و بە ئەمری خۆی قبوڵی کردووە.

لەبەر ئەوە ئاوا دەبوو کە خودا بۆ هەر زەمانێک یان بۆ هەر مەکانێک پێغەمبەرێکی ناردبوایە.

کە ئەمە مانای ئەوە بوو بەشەر ئەوە نیە کە بەسەر پێی خۆی کەویٚ وە (إبتکا)ی لەسەر بکرێت بۆ ئەوەی بتوانیٚ وەزیفەیەك کە پێی سپێردراوە کاری پیٚ بکات. وە ئەمەش غەیری ئەوە کەخودا بۆ بەشەری دانا وە بەشەر ئیستعداداتێکی هەیە کە نەفی ئەمە دەکات.

شێوەیەکی تر ئەوە بوو کە لە کتێبە ئاسمانیەکەی خودا تەواوی (احکامی جزئی) وە تەواوی شەرائیتە جیاوازەکانی زەمان و مەکان بنێردرێتە خوارەوە، دەی ئەمە بۆ خودا سادەیە ئاسانە، بەڵکو بەشەری بێچارە ناتوانیٚ ئەمە وەربگریٚو تەحەمولی بکات.

چونکە رەنگە ملیۆنێك کتێب لازم بێت، حەتا وەخت هەیە ئەمڕۆ حوکمێك مناسبە بەیانی دەگۆڕێت، دەبیٚ ئەم گشت کتێبە ئنسانی بیٚ چارە چۆن تەحەمولی بکات وە چۆن تێیان بگات و حفزیان بکات وە لە دوا هەر کامێك لە وکتێبانە بۆ شەرائتی (خاص)ی خۆی جیا بکاتەوە لەو شەرائتە جیٚ بەجیٚ بکات.

وەختێك ئەمە بە نسبەتی ئینسان مەحاڵە ممکن نیە، تەنها ریٚ ئەمە بووە خودا (کلیات)ەکە لەو ئەحکامە بە پێی شەرائتی زەمان و مکان دەگۆڕیٚ دیاری بکاتو زەوابتێکیش دابمەزرێنیٚ بۆ( استخراج)ی (جزئیات) لەمانەو ئەمجارە بیداتە دەست خودی بەشەر.

جا ئیجازەی نەداوە هەر کەسێك بۆ خۆی دەست بکات بە (استخراج) چونکە ئنسان (اشتباه) دەکات غەڵەت دەکات. کە پێغەمبەری خودا علیە الصلاة والسلام باشترین ئنسانە لە قورئاندا بەیانکراوە کە چەند جار لە (اجتهاد)ی نەیپێکاوە خودا راستی کردۆتەوە.

بۆ نمونـه: لـه سـورەتی انفـال لـه زەمینـەی ئەسیرەکانی غـەزوەی بـەدر دا لـە سورەتی عَبَس لـە سـورەتی إسـراء لـەویٚ دەفـەرمویٚت: ئەگـەر راگرمـان نـەکردبای لەسەر ریٚ خەریك بوو ئەوەندەی نەمابوو کەبـەرەو لایـان کۆشـش پیٚیـان بکـەی وە غەیری بۆمان.

چونکە ئنسان جێی (اشتباه)وغەڵەتە خودا ئیجـازەی نـەداوە بـە کـەس دەست بـەکار بـن لـەم زەمینـەیـە چـونکە لـە کەسـەکان هەڵـە زۆر زۆر دەبـیٚ فەرمویـەتی: (جمعی) بیٚ تەواوی کەسەکان بەیەکەوە کۆ ببنەوە تا هەڵە ببێتە (حەدی اقل). ئەو کەمترینە یش (مغفورن لە) خودا لێیان خۆش دەبیٚ. بە ناونیشانی شـتێکی دروسـت لە ئنسانی قبولٚ دەکات.

تـەنها ڕێگەیـەك کـە عەمـەلی بێـت و (امکـان)ی بـیٚ بـۆ ئـنسان ئەمـە بـووە کـە (استنباطي) (جزئیات) لە (کلیات) کە لە شەرائتی جیاوازی زەمان و مەکان بسپێریٚ بەدەستی شورا.

شورا ئەگەرچـی عبارەتـە لـە( اولـو الامـر) یـانی ئەوانـەی کـە ئـەمر بـە دەسـتی ئەوانە، ئەوانەی کە حەقی (إستمبات و إستخراجیان) هەیە دەبیٚ:

١- تەسەلوتی بەسەر لوغەتی عەرەبدا ببێت.

٢- تەسەلوتی ئەسـرار و مەسـالحێك و قـانون گوزاریـەك کـە خـودا بـە رەسمـی ناسیوە ببێت.

٣- لە شەرائتی زەمان و مەکانی خۆیاندا ئاگادار بن .

ئەگەرچی بۆمانن کـە راسـتەوخۆ لەگـەڵ (اسـتنباط و اجتهـاد)ا رەبتیـان هەیـە، بەڵکو هەر لەو ئایەتە کە ئیشارە بەوە کراوە، دوایی ئەوەی بەڵامن ئیتفاقیان دەبـیٚ لەگەڵ شتێك هێشتا شێوەی قانونیەت پەیا ناکا (اعلان) بە گشتی ئیمانداران بکرێت واتا (اعلان) کرا هیچ کەس (اعتراز)ێکی نەبوو ئەو وەختە دەبیٚ بە قانون.

دەفەرموێت ﴿ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ ﴾ النساء: ٥٩.

ئیجازەی( تنازع) لە بەینی خەڵك و لە بەینی (اولو الامر) وە لەولا (مَرَد) حەکەمیش فەقەت خوداو رەسولە نەك (اولو الامر).

ئەمە مانای ئەوەیە وەختێك گەیشتن بە (اتفاق) و (اجماع) لەسەر شتێك (اعلانی) بە مسوڵمانان بکەن، وەختێك هیچ (اعتراز)ێك نەما ئەوە دەبێ بە قانون جا دەرچوون لەمە دەبێ بە دەرچوون لە فەرمانی خودا.

سورەتی شوری ئایەتی ٣٩ خودای گەورە دەفەرموێ:

﴿وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ﴾.

ئەمری ئیمانداران شورایە لە بەینی ئیمانداران نەك لە بەینی فەقەت (اولو الامر).

یانی تەواوی ئیمانداران حەقن لە هەر مەسئەلەیەك لە مەسائیلەکان.

جا لە (استخراج) ئەوانەی (اهلی تخصص)ن کاریانە ئەمجارە لە نەزەر کردن بەسەریان تەواوی ئیمانداران هەر کەسێ کە شارەزایی هەیە مەلاحەزات تەرح بکەن کە لەوانەیە ئەو مەلاحەزاتەی ئەوانە ببێ بە سەبەب بۆ گۆڕینی حوکمێك کەدەریان کردووە.

دەی وەختێك حوکمێك بەم شێوەیە دەرچوو خودا قبوڵی کردووە وە بە ئەمری خۆی ناساندووە.

وە بەم شێوەیە لەهەر زەمان و مەکانێکدا هەر حوکمێك مەوردی نزول بێ (استخراج) دەکرێ و بێ فەرمانی خودا نیە.

ئەمر هی خودایە هەر وەك خەلق هی خودایە.

بەڵام مەسەلەی پەیا بوونی (اجتهاد)ی فەردی پەیابوونی (ائمة)زانایان مەزهەبی جۆراوجۆر ئەمە حوکمی چۆنە.

{حوکمی مەزهەب لە ئیسلامدا}

لە دوای ئەمە کە خەلافەت و شورا نەما وە زانایانی مسوڵمان پەرت بوون چارەیەك نەبوو بۆ عولەما غەیری یەکێك لە دوو شت کە یەکێکیان توانی هەڵبژێرن.

(سکوت) بێدەنگ بن هیچ کەس لە هیچ زەمینەیەکدا حوکمێك (استنباط و استخراج) نەکات کە ئیتر ئەم ئوممەتە کەسێکی نەبێ بۆ ئەوەی شتێکی بۆ رۆشن بکاتەوە تەوزیعی بۆ بدا لە کتاب و سوننەت.

یا ناچار هەر کەس لەلایەکەوە لە شارێکدا لە وڵاتێکدا دەست بکات بە (استخراجی جزئی) لە( کلیات) ئەم شێوەیان هەڵبژارد، بەڵکو خۆیان هەرگیز ئاوا تەسەورێکیان نەبوو لە زەمینەیەکدا کە رۆژێك ئەو ئیستمباتانەی ئەوان دەبن بە مەزهەبێك هەتا وای لێدێ کە تەرجیعی ئەوان بەسەر کتاب و سونەت دەدەن.

وە لە هەر شێوەیەك ئەوە مەسەلەیەك بوو لە رووی ناچاری تووشی هاتن کە خودا لە حاڵەتی زەرورەتو ناچاری ئەمە لە مسوڵمانان قبوڵ دەکات، بۆ هەمیشە قبوڵی ناکات.

لە حاڵەتی زەرورەت قبوڵی دەکات یانی لە موددەتێکدا کە ئەم مسوڵمانانە هەوڵ بدەن بۆ پەیا کردنی مەراحلی دەعوەت و فەعالیەت کردن بۆ دووبارە بۆ سەر کار هێنانەوەی حکومەتی ئیسلامی.

لە ئا ئەم مەرحەلە تا وەختێك حکومەتی ئیسلامی دێتەوە سەر کار، چونکە هیچ رێگەیەکی تر نیە، ناچار ئیجازە دەدرێت کە خەڵکێك پەیرەوی لەم (استنباط و استخراجە) (جزئیاتەی) (أئمة) بکەن وە ئەگەر چی لە وەختێکدا کە شورا ببێت

بۆمان به شرك دادەنرێت، ئێستا ئا لەم شەرائته ناچار قبولّ دەكرێت، چونكه هیچ رێگەیەكی تر نیه، بۆ ئنسان له وەختی زەرورەتدا شتی ممنوع (مجاز) دەبیّ.

بەلاّم لەگەڵ ئەمەدا مسولّمانان دەبیّ بزانن كه هیچ لەحزەیەك (معاف) نین له فەعالیەت بۆ ئەوەی ئەم شەرائیته بگۆڕیّ بۆ ئەمەی كه حكومەت و خەلافەتی ئیسلامیو شورا بێتەوە سەركار وە ئەمجارە كتاب و سوننەت بێت و شورا بەكار بیّ و (احكام) لێرە دەرچیّ مسولّمانان لەسەر یەك بەرنامە بن و ئەمر فەقەت ئەمری خوا بیّ.

ئا ئەم شەرائیتەی ئێستا مسولّمانان تیایدا دەژین كه دوای استمباتاتی (أفراد) دەكەویّ ئەمه شەرائتێكه كه فەقەت لەبەر ناچاری له مسولّمان قبولّ دەكریّ وە زەرورەتێكه كه وەك قاعدەیەك هەیه له شەریعەتدا عولەما بەیانی دەكەن كه ئەو شتانەی وا لەبەر زەرورەت (مباح) دەكرێن و ئیجازە دەدرێن به (تناسب) لەگەڵ زەرورەتەكەدایه بۆ هەمیشه نیه.

بۆ نمونه / وەختێك شتێكی حەرام له خۆراك حەلاّڵ دەكریّ بۆ ئنسان تا وەقتێكه كه حەلاّلی دەست ناكەوێت، حەلاّلی دەست كەوت دەبیّ ئیتر دەست بكێشیّ له خواردنی حەرامەكە.

ئەمه یەك

دوو نابیّ هەروا دانیشیّ به دیار حەرامەكەوە بلّیّ خۆ تازە خۆ ئەمه هەیه با هەولّ نەدەم بۆ حەلاّلّەكه نا دەبیّ لەو كاتە كۆشش بكات بۆ ئەوەی حەلاّلّەكەی دەست كەویّ.

لێرەدا ئەم مسولّمانه ناچارە پەیڕەوی لەم (أحكام)انه بكات، بەلاّم له عەینی ئەوەدا ئەبیّ بزانیّ كه هەمیشه واجبه لەسەری كه هەولّبدا بۆ ئەمه كه شەرائیت بگۆڕیّ و شورا بێتەوە سەر كار.

جا ئەوەش کەسانێك هەن بە بەهانەیەك دەگەڕێن وەختێك ئەم جۆرە قسانە دەکرێ، کە ئەمە هیچ جۆرە ئیهانە بە (أئمة) نسبەت بە مەزاهبی تێدا نیە.

چونکە وتمان کە ئەوان ناچار بوون لە یەکێك لە دوو رێگە یەکیان هەڵبژێرن انشاء الله خودا جەزای خێریان بداتەوە چارەیەکیان غەیری ئەمە نەبووە.

بەڵکو تەماشا دەکەین خودی ئەوان لە عەینی حاڵەتدا خەریك بوون کە شەرائیت بگۆڕن.

- بۆ نمونە / بۆچی امام ابو حنیفە ئەوکاتە ئەزیەتی درا؟.

ئەیان وت ئەبێ ببێ بە قازی لە ئاخری (بنی أمیة) سەرەتای (بنی عباس)قەزاوەتی قبوڵ نەکرد لەو حکومەتە ئاوایان لێ کرد هەتا مەعلوم نیە چۆن مرد.

- امام مالك بۆ دەستگیریان کرد؟.

- امام احمد بۆ شەلاقیان لێدا؟.

- امام شافعی بۆ هەڵات لە دەستی هاروونە رشید؟.

- قوتابی امام شافعی بۆچی لە زیندان مرد و ئەشکەنجەیان دا؟.

- وابن تیمیە یان بۆ ئەشکەنجەدا؟.

- بەڵکو بەر لەوانە (سەعیدی کوڕی زبێر ) و( سعیدی کوڕی مسیب).

ئەو عالمە گەورە گەورانەی کە ئێستا خەڵك بەرنامەکەیان لە غەیری دەستنوێژ و نوێژێك بێ رۆح و رۆژویەك بێ (مفهوم) هیچێك نازانن، خۆیان لە عەینی ئەمە کەخەریکی (استنباط و اجتهاد) بوون خەریکی ئەوە بوون شەرائیتەکە بگۆڕن.

هەر ئەو (امام ابو حنیف)ە فتوای ئەدا بۆ ئەوەی (زید بن علی) (زین العابدین) کە خەریك بو ئەمەی (إنقلاب)ێك بێنێتە روو حکومەتێکی ئیسلامی بێ کار فتوای دەدا کە خەڵکی کۆمەك بکەن وە (متهم) بوو بە لایەنگرانی ئەو.

ئا ئەمە تەوزیحێك بۆ ئەمە كەوا نەزانن ئەم ئیمامانە خۆیان رازی بون بەو شەرائیتەی تێیدا بوون لەبەر ناچاری ئەم تەبینانە فەردیەیان ئەكرد، لە عەینی ئەوەش هەوڵیان دەدا بۆ ئەمە كە شرائیتەكە بگۆڕن.

وە مەسائیلێك( فرد)ین یانی پەیوەندیان بە یەك كەسەوە هەیە ئەوانە كەسێك كە بە پێی مەوازنێك وا لە دین دانراوە لەو زەمینەدا (اجتهاد و استنباط) بكات، هەر بە عنوانی فەرمانی خودا ئەوەی كە پێی دەگات قبولْ دەكرێ نابێتە شرك.

بۆنمونە / كەسێك لە بیابانێكدا لە جێیەكدا كە پێی ئاشنا نییە گیر دەكات نازانێ قبلە لە كوێیە لە وێدا دەبێ بە پێی ئاگایەك كە هەیەتی لە وەزعی جوگرافیای ئەو شوێنە هەولْبدا جهەتێك لە جهەتەكان بە عنوانی قیبلە قبولی بكات. ئەوا( اجتهاد)ە فەردیە لەوێدا لەبەر ئەمە كە چارەی تری نیە قبولْ دەكرێ.

هەروا وەختێكیش هەیە مەسائیلێك هەن (جمع)ین بەلْكو ئنسانێك خۆی تەنها لە جێگەیەك گیر دەكات كەسی تر لە گەلْی نییە وە ناچارە لەو زەمینەدا( استنباطێك) بكات ئیجتهادێك بكات لەوێش لەبەر زەرورەت لێی قبولْ دەكرێو ئەوەی كە ئیستمباتی دەكات لێی وەردەگیرێ بە عنوانی فەرمانی خودا، بە شەرتێك (إستمبات) و (اجتهاد)ەكە مراعاتی زابتەیە كە دانراوە بۆ (استنباط و اجتهاد) بكات.

بەلاّم غەیری ئەم شێوانە پەیرەوی كردن لە فەرمانێك غەیری بۆمانی كە بەیان كرا، خودا پەیرەوی بە تاغوت ناوی بردووە وە شركە و دەرچوونە لە رێگەی تەوحید.

له سورەتی نساء ئایەتی (٥٩-٩٠)

(بەیان دەکات مەصدەر و سەرچەشمەی ئەحکام فەقەت سیانن.

دووەم (بەیان دەکات کە لادان لەوسێ دانە سەرچەشمە پەیرەوی لە طاغوتە رووکردنە طاغوت و فەرمانبەرداری کردن لە طاغوتە )

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ﴾.

بانگ بە ئەوانەی کە بە شێوەی گشتی پێش لە دەرچونی ئا ئەم حوکمە تەفصیلیە ئیمانیان هێناوەبە هەرچیەك کە لەتەرەف خوداوە بێ ئێستا یاد ئاوەری ئەو ئیمانە گشتی یە ئەو وەعد وپەیمانە کەلە پێشدا لەگەڵ خودا کردوویانە ئەکرێتەوەو لێیان داوا دەکرێ کە ئەو ئیمانە و ئەو (عهد)ە کە ئێستا بۆیان مەترەح دەکرێ (مُحكم) بیگرن وە مولتەزم بن پێی کە چی یە ؟

١-لە مەسائیلی ژیاندا گوێ ڕایەڵی خودا بکەن.

اطیعوا : لە کلیمەی (طوع) بە مەعنای ئارام بوون.

ئیتاعە مەعنای ئەوەیە کە ئنسان خۆی رام و فەرمانبەرداری بێ چەن و چەرای کەسێك بکات.

ئەمەی لە یەکەمین ئایاتێك نازڵ بوو بۆ بەشەر، ئەمەبووە کە دەبێ بە فەرمانی خودا ئیتاعەت بکات، تەنها ئا ئەمەیان نیە خیتاب بە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ بۆ ئەمە مەترەح دەکرێ بەڵکە ئەمەو شتەکانی تریش کە لە دوای ئەمە هەن بەیەکەوە مەجموعەی بۆمانن کە لێرەدا مەوردی تێرامانن تا نەوترێ کە خوا اتیعوا الله لەمەوپێشیش هەر بووە چۆن وتت کە لە پێشدا ئیمانی (اجمالی) بووە لەم زەمینەدا ئێستا بەدرێژی مەترەح دەکرێ.

٢-اطيعوا الرسول : وه هەروەها فەرمانبەرداری لە رەسول بکەن لەو تەبینانە وا ئەیکات بۆ کتاب الله رام و فەرمانبەرداری بیٚ چەن و چەرای ئەویش بن.

٣-واولــو الامــر مــنکم : وه بەرپرســانی خۆتــان هــەروا ئیتاعــەت بکــەن فەرمانبەرداری لە ئەوانیش بکەن هەڵبەتە بە فەرقیٚکەوە ئیٚستا بەیانی دەکەین:

قاعدەیەك هەیە لە عەرەبی وە لە هەر زمانیٚکی تر کە وەختیٚـك لـە لـەفزیٚك بـە یەکیٚ لە حروف (عطف) یا بە تەعبیریٚکی تر بە حروف (رد) (عطفي) دەکریٚتەوە سەر لەفزیٚکی تر وە رەبت ئـەکریٚ پیٚـوە (احکام)یٚك بـۆ ئـەو لـەفز و لـە تـەرتیب جملـە بەندیە سابت بووە بۆ ئەویش سابت دەبیٚ.

یانی بۆ نمونە ئەگەر (عتف) لەفزیٚك لەسەر لەفزیٚکی تر کراوە کە ئەو فاعـل بـوو ئەویش دەبیٚ بە فاعل ئەو مفعول بوو ئەمیش دەبیٚ بە مفعول وە هەروەها.

بینا لەسەر ئەمە ئەگەر بیفەرموایە: ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ﴾.

(اطیــع) ی دووەم بــاس نــەکرا بــا هــەر ئــەوە فــەهم دەکــرا کــە اتاعــەت لــە پیٚغەمبەریش علیە الصلاە والسلام بکەن و لە اولو الامر یش بکەن.

بەڵام تەماشا دەکەین جاریٚکی تر (أَطِيعُواْ) زکر کراوە واتیعو الرسول ئەمە لەبـەر ئەوەیە کە (الرسول) بەبیٚ (أَطِيعُواْ) باس بکرایە تەنها مراد ئەوە دەبـوو تـەنها ئەمـە (امکـانی) بـوو فـەهم بکرایـە لـەم ئایەتـە کـە (رسـول) بـیٚ کـەم وزیـاد بـیٚ تـەبین فەرمانــەکانی خــودا عــەرزە دەکــات و ئیتاعــەت لــە ئــەو بــە عنــوانی رونکەرەوەیەکی(صرفە) و هیچ جۆرە تەفصیلاتیٚکی بە شیٚوەی تـەبین لـە تـەرەف خۆیەوە عەرزە نەدەکرد.

نمونەی ئەمە لە مەوردی (خُمسی غنیمە).

ئەفەرمویٚ ( لله وللرسول).

بەڵام لە مەوردی انفال ئەفەرموێ:

﴿قُلِ ٱلۡأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِۖ﴾.

نافەرموێ وللرسول.

ئەوەیان کە دەفەرموێت للرسول (ل) تکرار ئەکاتەوە ئەگەرچی بە بێ (ل) یش هەر ئەمە فەهم دەکرا کە (خمسی غنیمە) بۆ رەسولە، بەڵکو فەرقی بوونی لام و نەبوونی لام ئەوەیە کە وەختێك دەفەرموێت (لله وللرسول) (ل) تکرار دەبێتەوە ئەمە دەگەیەنرێ کە ئیستحقاقێك لە تەرەفی پێغەمبەر بۆ (فَیئ) و (خُمسی غنیمە) هەیە لەبەر ئەوەی (خمسی غنیم)ە و (فیئ) تەحویل دەدرێت کە ئیتر هیچ جۆرە حەقێکی پێوە نیە غەیری ئەمە، کە بە شێوەی هی خودا بیگەیەنێ بە مەسارفی خۆی، بەڵکە لەبەر ئەوەی کە لە غەنیمەتدا بەشێکی بووە چۆن بە فەرماندەی لەشکر بووە و وە (فیئ) نەقشی اساسی بووە کە بە سیاسەت وکارزانی خۆی وا لە خۆی کردووە بێ ئەمەی کە لەشکر بکەوێتە جەنگ ئەم (فیئ) ە بە دەست بهێنرێ.

وە لەولاوەشەوە (تحریمی صدقات) ی لێ دەکرێ خۆی و خزمانی نزیکی خۆی حەقیان نیە لە سەدەقات..

(دفعی تهمە) دەبێ بکاتو بەهانە نەدا بە دەستی خەڵکەوە کە بڵێن لە خەڵکی دەستێنێ ئەیبا بۆ خۆی و خزمانی، لەبەر بۆمان بۆ ئەوەی کە ئەو و خزمانی ئەو کە رێگەیکی تریان نیە فەقیرو مەساکینی خزمی ئەو بۆ مەعیشەت بەیانکراوە وە (استحقاق)ی یان هەیە لە (فَیئ) و (خُمسی غنیمە).

﴿لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِۖ﴾.بۆ خوداو بۆ رەسول.

بەڵکو (انفال) کە عبارەتە لە مەنافع و معادنی غەیر تەبیعی هەتا رسولیش تیا زەحمەتی نەکێشاوە هەموو کەس وەك یەك مساوین تیایدا ئەفەرموێ:

﴿لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾.

بۆ خودا و رەسولە نە بۆ خوداو بۆ رەسول.

یانی لێرە صرف هی خودایە دەبێ بیگەیەنێ بە شێوەیماڵێك كە حەقی گشتی پێوەیە ئەو جۆرە كە خودا رەوشتی بۆ دادەمەزرێنێ.

ئەمە وەختێك لەفزێك (عطف) ی دەكرێتەوە لەسەر لە فزێكی تر.

لێرەدا كە دەفەرموێت: ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾ ئەمە استقلالی رەسول ئـەمر و فـەرمان صـادر كـردن دەگەیـەنێ هەڵبەتـە لـەوە نـا كـە خـۆی اسـتقلالی بـێ لـە دەركردنی حوكمێك بەم مانایەیە كە احكامێك وا لـە قورئانـدا( إجمـالین) وە ئەگـەر ئەو تەبینی یان نەكات بەشەریەت رێیان پێ نابا دەركیان ناكات، وەختێـك كـە ئـەو تەبینیان ئەكا ئەوان (إبتكا) لە زەمینی خۆیان نەكەن (إبتكا) لەسـەر توانـای علمـی خۆیـان نەكـەن كـە بڵێن نـا ئەمـە لـەم قورئانـە وەرنـاگیرێ وە دەرنەتیجە شـوێنی نەكەون بڵێن ئێمە هەر لە خودا ئەمر وەردەگرین نا ئەم تەبینی ئەمە لـە دوای ئەمـە كەخودا بە عنـوانی مـبین قبـولی كـردووە( اقتـزای) ئـەوە دەكـات كـە ئەوكەسـانەی ئیمانیان هێناوە بە عنوانی رسول هەرچیەكیشی كـە ئـەو تـەبینی ئـەكات بۆیـان بـە عنوانی پەیامی خوا وەری بگرن وە ئیتاعەی لێبكەن بـەس چـون ئـەو لـە تەبینەكـە (احكام)ێك عـەرزە دەكـات كـە ئـەوان خۆیـان نەیانـدەتوانی لـە (كلیـات)ی قورئـان (استخراج) بكەن كەوابوو وەك ئەوەی ئەم فەرمانانە لە تەرەف خۆیەوە صادر دەبن هەرچەندە ئەو (مبین)ە لە تەرەف ئەوەوە صادر نابن، لەبەر ئـەوە ئیتاعـەت كـردن لە ئەو نەوعێك (استقلال) بەو ئەدات لە فرمان صادر كردن.

یانی وەك ئەمەی کە ئەو فەرمانانەی وا ئەو صادری دەکات غەیری ئەوەیە کە لە کتابدا هەیە هەر چەندە حەقیقەتەکە جزئیاتێك کە ئەو زانیویەتی لەم کتابە دەری هێناوەو بەیانی کردووە بۆمان.

بەڵکو لە دوای ئەوە دەفەرموێت: (واول الامر منکم )

ئێستا بۆچی لەمە نەیفەرموو (اطیعوا اولو الامر منکم) خۆ مادام (اطیعوا )ی تێدا تکرار کردەوە ئنسان چاوەڕێی ئەوە دەکات جارێکی تریش تکرار بێتەوە کە (اولو الامر)یش هەروا نەوعێك کە ئەکرێ ئەوانیش تەبیناتێك بکەن وا (سائری) (افراد)ی بەشەر مسوڵمانان زێیان لێی ناکەوێ وە دەرنەتیجە شوبهێك استقلال بۆ بەلامن وە ئیتاعەت لە بەلامن وەك ئەمە ئیتاعەتێك تایبەتە بە ئیزافەی ئیتاعە لە خودا و ئیتاعەت لە رەسول.

(اتیعوا) ی لێرە باس نەکرد تا ئەمە دەربکات وای لێ نەیەت کە خەڵکی (اولو الامر)یش بگەیننە مەنزڵەتی (رسول) نە وەختێك بە لابردنی (اطیعوا) (عتفی) ی اولو الامر دەکرێتەوە لەسەر رەسول بەیانی ئەوە ئەکات کە اولو الامر بە عنوانی صرف رسول کە مبینی کتابی خودایە فەرمان صادر دەکەن وە ئیتاعەت لەوان ئیتاعەتێکی خاص نیە، بەڵکە لە چوارچێوەی فەرمانبەرداری لە خوداو رسول ئیتاعەت لەوان دەکرێ.

وە ئەوەی لەپاش ئەمە دێت هەر لەم ئایەتە زیاتر ئەمە رۆشن دەکاتەوە وەختێك کە ئیجازەی تەنازع و کێشمە کێش لەگەڵ اولو الامر دەدات تەنها رێگەی گەڕانەوەی چارە بۆ ئەم (اختلافە) کتاب و رسول باس دەکرێت، مەعنای ئەوەیە کە ئەمرێك لەتەرەف اولول الامر صادر دەکرێت وەك ئەمرێك نیە کە لە تەرەف خودا یان لە تەرەف پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام صادر دەبێ.

اولول الامر:

وشەی (اولول) کۆیە بۆ وشەی زوو نەك جەمعی لەفزی لە مەعناوە کە زوو یانی.

امر : مصدر بە مانای فەرمان دانان.

اولول الامر : یانی ئەوانەی وا حەقی ئەوەیان هەیە تا فەرمان صادر بکەن کە لە ئایەتی ۳۸ ی شوری بە شێوەی عمومی بەیان دەکات کە ئیمانداران امرهم شوری بینهم.

یانی ئیرادەی ئموری کۆمەڵی ئیمانداران لەسەر ئەساسی کتاب و سوننەت دەبێ تەواوی ئیمانداران دەخاڵەت بکەن لە هەڵسوڕاندنی کارو باریاندا.

بەڵام ئەم دەخاڵەتە شێوەی جۆر بە جۆری هەیە، بەشێکی عبارەتە لە (استنباط)ی احکام لە کتابو سوننەت ئەمە (تخصصی) دەوێ وە هەموو کەسیش (متخصص) نیە لەبەر ئەمە هەندێك لە ناو مەجموعەی ئیمانداران جیا دەبنەوە بە عنوانی (مجتهدین) ئەوانەش کە حەقیان هەیە لە کتاب و سوننەت (امر استخراج) بکەن وە بمان گەیەنن لەبەر ئەوە لێرە دەفەرموێت: (اولول الامر منکم) یانی ئەوانە کە حەقی ئەوەیان هەیە کە ئەمر صادر بکەن، جا ئێوە کە دەبن بە کۆمەڵ ئەو ئەمرەی کە شورایە لە بەینتانا پێی هەڵدەستن وە وەزیفەی خۆتان هەر کام بە پێی توانایەك کە خودا پێی داون لە بەرامبەری ئەوە ئەنجامی بدەن.

یانی اولو الامر وەختێك فەرمانێك (صادر) دەردەکەن هەر یەکەم جار شێوەی قانونی پەیا ناکا لەبەر چەند شتێ.

ئەم ئەمرە ئەمری گشت ئیماندارانە وە لە سورەتی شوری فەرمویەتی: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ﴾ نەیفەرموە (امرهم شوری بین اول الامر منهم).

ئەمری ئیمانداران شورایە لە بەینی گشتی ئیماندار یانی تەواوی ئیمانداران حەقیان هەیە لەسەر هەر ئەمرێك لێرەدا لە رستەی دوای ئەمە فەرمویەتی: ﴿فَإِن

﴿تَنَـٰزَعۡتُمۡ﴾ ئەگەر كێشمە كێشمتان كەوتـە بـەین وە یەكـەم شـت كەفـەهم دەكـرێ لـە (تنازع) تنازع لە بەین (الذین امنوا و اولو الامر منهم) ە چونكە اولـو الامـر مەنزڵـەتی خوداو رەسوڵیان نیە لە فەرمان صادر كردن حەقی تنازعێ دراوە، نەتیجە لە گشت بۆمان ئەوە فەهم دەكرێ كە وەختێك اولـو الامـر (اجمـاع) دەكـەن لەسـەر ئـەمرێك ئـەبێ عـەرزەی بكـەن بـە (جـامع) گـشتی مـسوڵمانان بـە حـوكمی ئەمـە كـە ﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَـٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾ تەواوی تاكەكانی مسوڵمانان یەكە یەكە مەسئولی كۆمـەڵن وە ئـەبێ هـەر كام وەلی بێ بۆ سائری كەسەكانی كۆمەڵ یەعنی (امر بە معروف و نهی لە منكر) بۆ هەموو كەسەكانە بە حوكمی ئەمە (جامعە) حەق نەزەری بەسەر ئەم حوكمـە هەیـە كە اولو الامر (اجماع)یان لەسەر كردووە چونكە استمبات بەشێكی لەسەر ئەساسـی (تخصص) لـە مەسـائیلی رۆژو ئاگـادار لـە مەسـائلی رۆژ وە وەخـتی وا دەبێـت كـە كەسێك وا اولو الامر دانێن مەسائیلێك لە وەزعی رۆژ بزانن كـە ئەگـەر تـەبینی بكـەن بۆ اولو ألامر رەئیان بگۆرێ بینا لەسەر ئەمە وەختێ كە عـەرزە كـرا بـە (جامعـە)ی مسوڵمانان ئەگەر مەجموعـەی مـسوڵمانان یـا فـەردێك لـە مـسوڵمانان ئیعترازێكیـان هەبوو تەبینی دەكەن. بە دەلیلەوە ئەگـەر دەلیلیـان هـەبوو لەسـەری توانیـان اولـو الامریـان قـانع كـرد وە رۆشـن بـۆوە بـۆ اولـو الامـر كـە هەڵـەیان كـردووە لـە ئیجتهادەكەیاندا خۆ ئەبێ چاو پێداچوونەوە بكەن.

بەڵام ئەگەر كەس ئیعترازی نـەبوو وە ئەگـەریش ئیعترازێـك بـوو بـێ پایـە و بـێ ئەساس بوو هەستی ئارەزوو بوو لە دوای ئـەوە ئـەم فەرمانـەی اولـو الامـر حـوكمی قانون پەیا دەكات وەك حوكمی كتاب و سوننەتی لێ دێ.

جا ئەگەر( تنازع) پەیا بوو (فردە الی الله والرسول ) گەڕانەوە بۆ کتاب و سونەت.

بەڵام رەنگە کەسێك خیتابی (تنازعتم) تایبەت بکات بە (اولو الامر) ئەگەر ئێوە لە ناوخۆتاندا لە وەختی استنباط و اجتهاد اختلاف لە بەینتان پەیا بوو بیبەنەوە بۆ کتاب و سوننەت بەمانە عمل بکەن بۆ ئەوەی بگەن بە اجماع و (اتفاق).

بەڵام هەر ملاحەزەیەك سادەیی ئایەتەکە بەیاندەکات کە دووتەرەفی تنازع الذین امنوا واولو الامرمنهم نەك مەجموعەی اولو الامر بەیەکەوە بەڵێ ئەمەش لە دەرەجەی دووەم فەهم دەکرێ.

یانی بەم شێوەیە کە وەختێك حەلی تنازعی مسوڵمانان و اولو الامریان بە گەڕانەوە بۆ لای کتاب و سوننەت هەرواش حەلی تنازع لە بەینی تاکەکانی (اولو الامر) لە کاتی تەشاور و (استمباط واجتهاد) یاندا بەم شێوەیە دەبێ، بەڵکو ئەمە مەعنایەك بە دەرەجەی دووەم فەهم دەکرێ.

دوایی دەفەرموێت: ﴿إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ﴾.

ئەگەر ئێوە ئیمانتان هەیە بە خواو بە رۆژی ئاخرەت یانی ئیمان بە خواو بە رۆژی ئاخرەت ئەگەر واتان نەکرد دیارە ئێوە وانین.

﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾.

ئا ئەوە باشترە لە خلاف ئەوە لە لەحازی تەئویلەوەچاکترە.

تأويل : یانی هەر شتێك رەتی بکەیتەوە بۆ ئەسڵی خۆی ئەوەی کە ئەبێ منتەهی بێتەوە پێی بۆ لای ئەوە لە هەر شتێك ئەسڵەکەی هەیە کە سەرەنجامی ئەو دەبێ کۆتایی بەوە دەبێ.

ئا ئێستا ڕۆشن بۆوه كه (الله) ئەوامرێكی هەن كه له كتابی خۆیدا گەیاندوویەتی به بەشەر به واسیتەی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام ئەوان ئیتاعەت لێكردنیان بێ چون و چەرایه.

وه ئیتاعەت نەكردنیان كوفره و دەرچوونه له ئیسلام.

رەسول تەبینی (كلیات) لەم كتابه وارد بووه وه (جزئیات)یان به پێی شەرائیتی زەمان و مەكان ئەگۆڕێ كردوویەتی وه هەروەها تەبینی مەسائیلێكی كردووه كه هەرگیز ناگۆڕێ به پێی شەرائیتی زەمان و مەكان وه له مەوردی بەیانی كەیفیەتی نوێژ و تەرتیبی نوێژ و وه ئەو تەبینانەی ئەو نەیكردبایه مجتهدین ئێستاش ڕێیان پێ نەدەبرد وه رەنگه هەندێك تەئویلی ئێستاش نەزانن له چ ئایەتێكه ئەوا دیار دەكەوێ كه شێوەی نیمچه سەربەخۆیەكی پێدەدا هەرچەند ئێمه دەزانین ئەو خۆی فەرمان دەر ناكا تەنیا له كتابی خودا ی وەرگرتووه ئەوتەبینانەی ئەویش واجبه ئیتاعەتی.

دوای ئەوەش اولو الامر كه بەڵامن حوكمێك دەردەكەن به (اجماع) دوای ئەوەی عەرزەی جامیعەی دەكەن كه قبوڵ كرا ئیتاعه كردنی ئەوەش بێ چون و چەرا واجبه.

<u>تێبینی</u>:

ئەوەی اجتهاد دەكات دەبێت:

١- شارەزایی تەواوی له زمانی عەرەبی هەبێ.

٢- له مەصالح و فەلسەفەی تەشریع بەئاگابن.

٣- له مەسائیلی ڕۆژدا (تخصص)یان بێ.

ئەمه تەنها بۆ مەجلسی شورا دەبێت كه ئەوان حوكم (استنباط) دەكەن.

له شوێن ئه‌م ئایه‌ته ده‌فه‌رموێت :

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا﴾.

ئه‌وه نابینی ئه‌وانه‌ی وا گومانیان وایه خۆیـان بـه ده‌م ده‌ڵێن بـه‌ڵام بـه ناحـه‌ق ئیمانیان هێناوه به‌وه‌ی وا بۆ تۆ نێردراوه وه ئه‌وه‌یش که پێش له تۆ نێردراوه.

یـانی که‌سـانێك وا ئیـدده‌عای ئیمـان بـه قورئـان و بـه تـه‌ورات و انجیـل سـائری کتێبانی خودا ده‌که‌ن به‌ڵکو ئیدده‌عاکه‌یان درۆیه گه‌ره‌کیانه که پـه‌یڕه‌وی لـه تـاغوت بکه‌ن یانی بگه‌ڕێنـه‌وه بـۆ تـاغوت وه لـه ئـه‌و فـه‌رمان وه‌رگـرن لـه جیـایی خـودا و ره‌سول واولو الامر لێره له به‌رامبه‌ر ئه‌وه باسکراوه کـه غـه‌یری ئه‌وانـه‌ی لـه ئایـه‌ی پێشوو باس کراوه به ته‌فسیلاتێك له پێشدا باسمان کرد ده‌بیٚ به تاغوت.

تاغوت له وشه‌ی (طُغیان)ه به مانای له حه‌د ته‌جاوز کردن، هه‌ر شـتێك یـا هـه‌ر که‌سێك لـه حـه‌دی خـۆی کـه به‌ندایـه‌تی یـه تجـاوز بکـات یـان تجـاوزی پـیٚ بدرێت که‌سانی تر له حه‌دی خۆی تیٚ پـه‌ڕێنیٚ لـه جیـات ئـه‌وه کـه به‌نده‌یـه‌ك بیناسـیٚ بـه فه‌رمانڕه‌واو فه‌ریادره‌س قبوڵی بکه‌ن ئه‌وه پێی ده‌ووتریٚ تاغوت.

ده‌فـه‌رموێت: بۆمـانی کـه ئـه‌مریان پـیٚ کـراوه کـوفر بـه تـاغوت بکـه‌ن قبـوڵی نه‌که‌ن‌و فه‌رمانی بخه‌نه پشت گویٚ، ئه‌وه‌ی له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌دا ده‌چن بۆ لای تـاغوت کـه حوکمی لیٚ وه‌رده‌گرن فه‌رمانی لیٚ وه‌رده‌گرن، بۆمان درۆ ده‌کـه‌ن کـه ده‌ڵێن ئێمـه ئیمانمان به قورئان وبه کتێبانی تری ئاسمانی هێناوه، بۆمان شه‌یتان گه‌ره‌کیه زۆر دووریان بکاته‌وه له هیدایه‌ت ته‌واو گومراهیان بکات.

دەی بەم جۆرە رۆشن دەبێتەوە کە فەرمانبەرداری کردن لە غەیری خودا بە تەوزیعاتێ لە پێشدا باسمان کرد یەکێکە لە شێوە گەورەکانی شرك شەریك بۆ خودا قەرار دان (ئەمری ابتلائی ) لە فەرمانڕەوایی.

لە ئایەتی ٨٣ سورەتی نساء

بەیانی ئەوە دەکات کە (اولو الامر) لە ناو خۆیاندا دەستە دەستە دەبن وە هەر مەسئەلەیەك لەم مەسئەلانە (راجع) دەکرێن لە دەستەیەك لەوانە بە (اسطلاحي) ئەمرۆ (کۆمسیۆن) ێك وە لە دوای ئەمە کە فرقەی خاصی ئەو ئەمرە رەئی خۆیان دەردەبڕن ئەدرێتە هەموو دەستەی اولو الامر وە گشتی (اجماع) دەکات لەسەری ئەوجارە عەرزە دەکرێ بە ئومەت و دوای ئەوە شێوەی قانونیەت پەیا ئەکا کە لەوێ دەفەرموێت :

﴿ وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُوا۟ بِهِۦ ﴾.

وەختێك مەسەلەیەك لە مەسئەلەی سیاسی ئەوەی کە ئەمنی ئارامیەك دەخاتە ناو دڵی خەڵك یا ترسێك دروست دەکات پێیان دەگات کەسانی بێ بەند و بار خۆیان پێ (مقید) بوون بە هیچ زەوابتێکەوە بڵاو دەکەنەوە لە گشت جێگەیەك لەناو خەڵك کە ئەمە کارێکی ناشایستەیە.

﴿وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ﴾.

ئەگەر لە جیای ئەم کارە بیانبردایە بۆ لای اولو الامر ئەوانەی وا ئەزانن استمباتی حوکمی ئەو مەسەلە بکەن لە اولو الامر ئەیانزانی کە رێی چۆنە و ئەبێ چ حوکمێك لە بارەی ئەمەوە دەربچێ.

لێرە دوو جار وشەی (منهم) باس کراوە.

(منهم) ی یەکەم اولو الامر منهم بۆ کۆی مسوڵمانان ئەبێ اولو الامر منهم ی دووەم کەسانێك لە گشت مسوڵمانان وا ئەزانن چۆن استمبات بکەن لەو مەوزوعە.

یانی خودی اولو الامر گروپ گروپ دەبن بۆ هەر مەسئەلەیەك گروپێك دەتوانن استمبات بکەن.

لە پێشدا ئیشارە درا بەوەی کە کەسانێك تەئویل دەکەن بەوەی کە:

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾.

دەڵێن (من لم یحکم ) یانی کەسێك وا معتقد نەبێ ئیمانی نەبێ بە ما انزل الله نەك کەسێك کە لە واقیعیەتی ژیاندا حوکمی پێ نەکات.

لە نەتیجە ئاوای لێ دێت کە ئەگەر هاتوو کەسێك (معتقد) بوو بەمە کە ئەم کتێبە کتێبی خودایە بەڵکو فەرمانڕەوایی لەسەر ئەو ئەساسە نە ئەکرد ئەوە ئیتر ناکەوێتە بەر ئەمە.

بە شێوەیەکی تر یانی خودا ئەم گشتە پێغەمبەرانەی علیهم السلام زەحمەت داوە کە بێن ئەم خەڵکە رازی بکەن کە معتقد بن ئەم کتێبە کتێبی خودایە جا لەوە دوا ئیتر عەمەلی پێ نەکەن زۆر گرنگ نیە کە خودا هەرگیز کاری ئەوها ناکات.

لەبەر ئەوەی نەصارا و یەهود معتقد بوون کە انجیل و تەورات کتێبی خودان، بەڵام حوکمیان پێ نەدەکرد ئەمەی کە لەگەڵ مەسالحیان یەکی نەدەگرت.

جارێ بە پێچەوانەی ئەو تێگەیشتنەی کە خەڵکی وای تێگەیشتوون کە کافرەکانی زەمانی پێغەمبەر نوح و هود و سائری پێغەمبەرمان علیهم السلام عەقیدەیان بە خوداو بە مەلائیکەو بە سائیری مەسائلی غەیبی نەبووە وەکو فریان عبارەت بووە لەمە ئایاتێك لەقورئان هەن کە بەیان دەکەن ئەوان معتقد بوون بەو

مەسائیلە غەیبیە، بەڵکو تەسلیم نەبوونیان بە فەرمانی خوداوە ئیتاعەت نەکردنیان لە ئەو پێغەمبەرەی کە کتێبی لەلایەن خوداوە بۆ هێناون.

بە تەعبیرێکی تر قبوڵ کردنی فەریادرەسێك وە فەرمانڕەوایەکی تر غەیری خودا لە ژیاندا جوڵانەوە لەسەر ئەم ئەساسە تا ئەمەبو کوفریان کرد.

بۆ نمونە / لە ئایەتی ٢٤ لەسورەتی مؤمنون لە مەوردی عەقیدە بە مەسائلی غەیبیەوە دەفەرموێت: کە نوح وەختێك کە هات بۆ لایان دەعوەتی کردن بۆ عبادەتی خودا و تەوحیدی خودا و (الوهیە) بۆ غەیری خودا، قائل نەبوون ئاوا جوابیان داوە.

﴿فَقَالَ ٱلْمَلَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ﴾.

ملأ : یانی ئەوانەی وا هەموو جێگایەك پڕ دەکەن لە خۆیان و لە ناوی خۆیان و لە ئانصاری خۆیان دەسەلاتداران و (مترفین و مستکبرین).

ئەو (ملأ) ەی لە قەومی نوح کە لە دوای ئەمە حەقیان بۆ رۆشن بۆوە پشتیان لێ هەڵکرد و کافر بون.

پێیان ووت ئەمە هەر بەشەرێکە وەك ئێمە رویان کردەخەڵکەکەوە گوتیان هیچ (امتیاز)ێکی بەسەر ئێوەدا نیە فەقەت گەرەکیە بەم شێوە خۆی بکات سەروەر و ئاغا بەسەرتان حەقیقەتێك نیە لەم زەمینەدا بۆ:

﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً﴾.

ئەگەر خودا گەرەکی بوایە هیدایەتی ئێمە بدا مەلائیکەتی دەنارد بۆمان، ئاخر چۆن ئێمە دەکەوینە شوێن بەشەرێك، ئاخر چۆن دەکرێ خودا لە بەشەر رەسولێك

هەڵبژێرێ ئەگەر بەشەر بێ ئێمەش وەك ئەوین ئێمە خۆمان بەرنامە بۆ خۆمان دادەنێین.

﴿مَّا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلۡأَوَّلِينَ﴾.

ئێمە شتی ئاوامان لە ئەژداد و باپیرانمان نەبیستووە بەشەرێك هەستێ بڵێ پێغەمبەرم.

دەی ئەوەتا ئەو خەڵکە لێرەدا معتقدن بە الله وهەم بە ملائکە.

﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً﴾.

لەگەڵ ئەوەشدا کافر بوون خودا چی بەسەر هێناون.

لەبەر ئەوە حازر نەبوون بکەونە ژێر فەرمانی خودا ئیتاعە لەو پێغەمبەرەی کە خودا ناردوویەتی بکەن.

لە ئایەتی ١٤ لەسورەتی فصلت لەم زەمینەدا دوای ئەمە کە بەیانی دەکات کە ئێمە تائفەی عاد وە تائیفەی سەمود لە دوای ئەمە دوەفەرموێ: بۆمانمان لە بەین بردن هۆشدارێك دەدا بە قەومی محمد علیە الصلاە والسلام کە بەڵامنیش ئەکەونە بەر ئەم سوننەتە وە لەبەر ئەمە بەڵامن لە بەین چوون.

لە ئەوان دەگێرێتەوە وەختێك پێغەمبەران علیهم السلام دەهاتنە لایان.

﴿قَالُواْ لَوۡ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً﴾.

هەر عەینی ئەو قسەی قەومی پێغەمبەر نوح کردیان.

وەختێك پێغەمبەران علیهم السلام دەهاتن بۆ لایان دەیان ووت ئێمە بەشەرمان قبوڵ نیە وەك پێغەمبەر علیە السلام پێغەمبەر علیە السلام دەبێ مەلائیکەت بێ وە ئەگەر خاوەنەکەی ئێمە گەرەکی بوایە مەلائیکەی دەنارد بۆمان.

﴿فَإِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ﴾.

کەوابوو چونکە ئێوە هاتون مەلائکەت نەهاتوە وە ئێمە بەوەی ئێوە هێناوتانە کافرین بەوە قبولّی ناکەین بە وجودی ئەوەش زانیومانە دەزانین چییە.

هەروا لە ئایەتی٥٢ لە سورەتی زخرف

فیرعەون عەینی قسە بەرامبەر بە موسی علیە السلام دووبارە دەکاتەوە ئەو فیرعەونەی کە خەلّك وا دەزانن کە ئەو ووتی خوام بە مانای ئەوەی کە خالق بێ و رازق بێ وە سائری سفاتی خودا.

ئەلّێ: ﴿أَمۡ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي هُوَ مَهِينٞ وَلَا يَكَادُ يُبِينُ﴾.

ئەرێ من باشترم یا ئەو کابرایەی ئنسانێکی ئەوەندە زەعیفە کەوەختە لە حالّی قسە کردندا نەتوانێ ئەوەی دەیەوێ دەری بخات.

﴿فَلَوۡلَآ أُلۡقِيَ عَلَيۡهِ أَسۡوِرَةٞ مِّن ذَهَبٍ أَوۡ جَآءَ مَعَهُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ مُقۡتَرِنِينَ﴾.

دەی ئەگەر راست دەکات پێغەمبەرە ئەشیا مالّ و سەروەری هەبوایە یا ئەگەر ئەوە نیە .

﴿أَوۡ جَآءَ مَعَهُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ مُقۡتَرِنِينَ﴾.

بۆچی مەلائیکەت لەگەلّیا هاورێ لەگەلّیا نەهات.

تا ئێمەش قبولّمان کردایە.

یانی فیرعەون باوەڕی بەوە هەبوە کە مەلائیکە هەیە.

لە ئایەتی ١٤ لە سورەتی نمل خودا دەفەرموێت:

﴿وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗا﴾.

فیرعەون و (ال فیرعون) ئنکاری ئەوەیان دەکرد کە موسی علیە السلام پێی دەگوتن لە حالّێکدا لە دەروونەوە یەقینیان پێی هەبوو کە لەسەر حەقە.

بەڵام لەبەر ئەوەی گەرەکیان بوو هەر خۆیان فەرمان دەرکەن نەبنە ژێر فەرمان ئەوەیان قبوڵ نەبوو.

هەروەها لە ئایەتی ١٠٢ لە سورەتی اسراء موسی علیە السلام رووی تێ دەکات ئەفەرموێ بە فیرعەون

﴿لَقَدْ عَلِمْتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ بَصَآئِرَ﴾.

بە راستی کە تۆ زانیوتە قەسەم دەخوا کەوا بۆمانی من پێم راگەیاندووی لەم ئایەتە لەم معجزاتە ئەو کەسە ناردوومی کەخاوەنی ئاسمانەکان و زەوی یە بۆ ئەوەی ناردوومە کە بەرچاوی خەڵکیان پێ رۆشن ببێتەوە بکەونە سەر رێگەی حەق.

لە ئایەتی ١٢٧ سورەتی اعراف:

ئالی فیرعەون (ملأ) دەسەڵاتدارانی دەورو بەری بە فیرعەون دەڵێن:

﴿أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوْمَهُۥ لِيُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَ﴾.

ئەوە تۆ چۆن واز دەێنی لە موسی فەساد بکات لەسەر زەوی وە خۆت و ئالیهەتەکەت وێڵ بکەن.

یانی فیرعەون (آلـهَ) ی هەبوو فەریادرەسانێکی هەبوو بە شێوەی واستە لە بەینی خۆیو خودا وەهەروەها بۆ (تقرب) نزیک بونەوە لە بۆ خودا قەراری دابوون.

هەروا کە ئەو مەلیکەی زەمانی پێغەمبەر ئیبراهیم کە پێی دەڵێن (نمرود)

ئەویش هەر بەو شێوەیە وەك لە ئایەتی ٢٥٨ سورەتی بقرە بەیان دەکات گفت و گۆ لەگەڵ ابراهیم علیە السلام لەسەر ئەمە نەبوو کە (الله) وجودی هەیە یا خلق یا فلان.

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِي حَاجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي رَبِّهِ﴾.

گفت وگۆی لەسەر (رب) بوو فەرمانڕەوا دەبێ کێ بێ.

کە (نمرود) دەیگوت دەبێ من بم چونکە دەسەلاتم هەیە بەسەر مردن و ژیانی خەلك. کە دەتوانم یەکێ بکوژم و یەکێ رزگار بکەم لەبەر ئەوە دەبێ من فەرمانڕەوا بم، لە دوای ئەوەی ابراهیم علیە السلام وتی من لە کەسێك فەرمان وەردەگرم کە مردن و ژیانی بە دەستە، ئەویش وایدەزانی کە کەسێ بکوژێ و کەسێ بەرەلا کاتو نەیکوژێ مانای ئەوەیە کە ژیان و مردنی بەخشیوە، بێ خەبەر لەوەی کە ئەویش سوننەتی خودایە کە خودا وای کردووە ئەو ببێ بە سەبەبی مەرگ یا ژیانی کەسێکی تر وە لە حەقیقەت ژیان و مردن وا لە دەستی خودایە.

وەهەروەها لە سورەتی انبیاء ئایەتی ٦٨ وەختێك کەپێغەمبەر ابراهیم علیە السلام بتەکان دەشکێنێ خەلکەکە هاواریان بەرز دەبێتەوە

﴿وَانصُرُوا آلِهَتَكُمْ﴾.

بگەن کۆمەکی خوداکانتان بکەن، بگەنە فریایان.

یانی (آلِهَ) یان بوو بۆ (تقرب).

خودا دەفەرموێت: ئەوانەی پێش لە ئێوە لە بەینمان بردوون (الە) یەکیان هەبوو کە بە شێوە (قُربان) بۆ وەسیلەی (تقرب) بۆ لای ئێمە ئەوانەیان هەبوو کە هیچ فائدەی پێ نەگەیاندن وە عەجیبتر لەمەلە سورەتی (نمل) لە ئایەتی ٤٨-٤٩ لە مەوردی ئەو (٩) نەفەرە و وشترەکەی صالحیان علیە السلام کوشت ئەفەرموێ: بۆ دەست کرتن بەم کارە هەلسان تەدبیرێکیان کرد ئەفەرموێ :

﴿ وَكَانَ فِي ٱلْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿٤٨﴾ قَالُوا۟ تَقَاسَمُوا۟ بِٱللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِۦ وَإِنَّا لَصَـٰدِقُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾.

ئەفەرموێ: لە شاردا گروپێکی ٩ نەفەری هەبوون کە کاریان فەقەت فەساد بوو لەسەر زەوی هەرگیز کارێکی چاکەیان نەدەکرد وەختێك ویستیان زەربەیەك بدەن لە صالح وتیان با قەسەم بخۆین بە خودا عەجیبە کە شەو بچین خۆی و خانەوادەکەی لە بەین بەرین ئەمجارە بۆ سەر پەرشتەکەی وا دیارە صالح علیه السلام کەسێکی هەبووە پشتیوانی بووە دەچینە لای ئەو کەسە دەڵێین ئێمە ئاگامان لەو کارە نیە نەماندیوە و حازر نەبووین لەوێ چ تەدبیرێکیان کردبوو چۆن شەو دەیکوژین کەس نامانبینێ کەوا بوو سوێندەکەمان ناکەوێ (ما شهدنا) (شهید) یانی حازر و بینەر لەبەر ئەوە گوتیان حازرین بەڵام لەبەر ئەوەی شەوە کەس نامانبینێ.

خەریکن پێغەمبەرێك دەکوژن بەڵام بیر لەوەش دەکەنەوە کە دوایی ئەو قسانەی دەیکەن درۆ نەبێ (وانا لصادقون) دەی ئەمە کاری کەسێك نیە کە نەفی وجودی خودا بکات. تا ئەو حەدەش پەیوەستە بەوەی کە لەم زەمینەدا درۆ نەکەن.

لە ئایەتی ٢١ سورەتی فرقان بە شێوەیەك گشتی تەواوی ئەو کەسانەی بانگەوازی حەقیان خستۆتە پشت گوێ ئەفەرموێ کە: بەهانەیان ئەمە بووە کە بۆچی خودا مەلائیکەی نەناردووە هەر ئەو بەهانەی لە قەومی نوح و عاد و ثمود علیهم السلام گێراومانەوە.

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَوْ نَرَىٰ رَبَّنَا ۗ لَقَدِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ وَعَتَوْ عُتُوًّا كَبِيرًا ﴾.

له دوای ئەمـه دەفـەرموێت: کـه هەرچـی رەسـول بـەر لـەتۆ ناردوومانـه هـەمووی خۆراکیان خواردووه و چوون به رێدا، ئەفەرموێ: ئەوانـەی وا بەتـەمای ئـەوه نـەبوون که بێنەوه لای ئێمه له قیامەتدا قسەیان ئەمه بووه که ئەگەر ئەمه بەرنامـەی خودایـه رێی هیدایەتی ئێمەیه که ئێوه دەڵێن پێغەمبەران بۆچی خودا مەلائیکـەی نـه ناردۆتـه سەرمان یان بۆ خۆیمان نەدیت تا قبوڵ بکەین، جا دەفەرموێت؛ به راستی لـه خۆیـان زۆر خۆیان به گەوره هاتۆته بەرچاو بەراستی زۆر سەرکەش بوون.

لەمانـه لـه هـەموویان سـەیر تـر ئایـەی ٥٧ سـورەتی قـصص کـه بـەیان دەکـات دەربارەی کافرەکانی زەمانی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام.

لێرەدا دەردەکەوێ گومرایی زۆرێك قـەوم قورئـان سەرگوزشـتەیان بـەیان دەکـات ئەفەرموێ: که لەدوای (اتمام حجه) له بەین بران ئەمـه نـەبووه کـه ئینکـاری وجـودی خودا بکەن یا ئینکاری مەلائکەت و سائری حقائق بکەن، بەڵکه نه تەنها ئعترافیـان بـه وجودی خودا و مەلائکه کردووه زۆرێکیش له سفاتی خودایان قبوڵ بـووه هـەتا (إلـه) شیان بووه یانی فەریادرەسانی نیان هەبووه که به گومانی خۆیان نزیکیان دەکەنەوه له خودا، که له راستیدا گومراییـان ئـەوه بـووه کـەوایان زانیـوه کـه لـه ئیرادەی ئـەم جیهانی هەستیه له هەندێك له رووەوه غەیری خودا جۆره دەخاڵەتێکی هەیه.

بۆ نمونه / کەسانێك له بەنده صالحەکانی خودا تکـای ئـەوه دەکـەن کـه بـبێ بـه سەبەبی ئەمه بەعزێك له سوننەنی ئیلاهی راوەسـتن لـه روێکدا نـسبەت بـه کەسـانێك ئیش نەکەن.

وه بەشەکەی تر له گومراییان ئەوه بوو که (أسباب)یان بـه دارای تەئـسیری زاتـی زانیوه وه هەم ئەمه بووه که له ژیانیان فەرمانیان له غەیری خـوداو لـه ئنـسانەکانی سەرەوەی خۆیان وەرگرتووه.

دوو مشرکین (اعتراف) به وجودی خواو (اعتراف) به بەعزێك سیفاتی خودا و هیچ نەبووه به شەفیعیان لەلای خوداوه وه به سەبەبی ئەوەی که خودا لە عەمەلیان گوزەشته بکات.

ئایەتی ٥٧ سورەتی قصص له هەمویا عەجیبتر.

ئەم ئایەته له دوای مەتالبێك هاتوه تێیدا بەیانی سەرسەختی لەسەر کوفری قەومی پێغەمبەر محمد علیه الصلاة والسلام.

ئەو گشته تەبینەی بۆ کردن، ئەو گشته زەحمەتەی بۆ کێشان لێی دوور کەوتنەوەو کوفریان به حەق کرد، بەڵکو لەلایەکی ترەوه کەسانێك لە ئەهلی کتاب ئەوانەی که بەراستی کتێبی خودایان بووه هەڵیانی گرتووه لە علمایانی اهلی کتاب، وەختێك که حەقیان بۆ رۆشن بۆتەوه مەنزلەتی علمی نەبوو بە مانعی ئەوەی ئیمان بهێنن ئیمان به پێغەمبەرێك که نەخوێندەوار بوه له (عُرف) جاهلی مەنزلەتی له خوار مەنزلەتی علما بووه جا لەو بۆنەوه دەفەرموێت :

﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴾.

ئەو گشته زەحمەتەی دەکێشیٚ قەومەکەی هیدایەت بداتٚ، بەلام ئەوان مهتدی نەبوون، کەسانێکی تر مهتدی بوون، لێرە سوننەتێکی ئیلاهی لە نمونەی هیدایەت و گومڕایی ئەخاته بەرچاو که عبارەت لەوەیه که ئینسان ئەگەر خۆی (مستعد) نەبیٚ هیچ رێگەو وەسیلەیەك نیه ئەم سوننەته ئیلاهیه هیچ کەس ناتوانیٚ بیگۆڕیٚ.

ئەفەرمویٚ بەراستی تۆ ناتوانی هەر کەس که پێت خۆشه بیخەیته سەر ریٚ قەومەکەی خۆت هیدایەت بدەیٚ چونکه ئەوان حازر نابن.

وەختێکیش حازر نەبن تۆ بەشەری‌و دەسەڵاتی ئەوەت نیە سوننەتی خودا بگۆڕی بۆ ئەوە ئەوان مستعد بن بێنە سەر ڕێ، بەڵام خودایە کە گەرەکی بوو هەر کەسێ هیدایەت بدا هیدایەتی دەدا.

جا مەشیئەتی خوداش شتێکی بێ قاعیدە و بەرنامە نیە.

مەشیئەتی خودا ویست و ئیرادەی خودا هەر ئەوەیە کە سوننەتەکانی خودای پێك هێناوە، یەکێك لە سوننەتی ئیلاهی ئەمەیە ئەگەر ئینسان ئەو تێروانینەی وا خودا پێی داوە لە زەمینەی هیدایەتدا خستیە کار و ئامادەی پەیا کرد وە لە تەرەف خوداوە ڕێگەی درا مهتدی دەبێ.

جا ئەم سوننەتە بەولاوە تەعبیری لێ دەدا دەفەرموێت، هەر کەس گەرەکی بوو هیدایەتی دەدات گەرەکی بوو گومڕای دەکات.

یانی هەر کەس ئامادەیی تێدا بوو بۆ هیدایەت خوداش هیدایەتی دەدا وە هەر کەسیش ئامادەیی تێدا نەبوو خودا هیدایەتی نادا.

﴿وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِینَ﴾.

ئەو ئاگادارترە بە ئەو کەسانەی دەکەونە سەر ڕێ بۆ ئەو کەسانەی ئامادەن بۆ هیدایەت هیدایەت بە نسیبی ئەوانە دەکات وە ئەویش بە زۆر نایکات بە قورگیانا قەرارە خۆیان ( مختار )بن.

لە دوای ئەم ئایەتە عوزرێك لە تەرەف قەومی محمد علیە الصلاة والسلام بەیان دەکات عوزرێك عەجیب لەم عوزرانە ئیعتراف دەکەن بۆ ئەوەی کە هێناویەتی هیدایەتە، بەڵکو موشکلەیەك مەترەح دەکەن بوە بە سەبەبی ئەوەی ئیمان نەهێنن.

﴿وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلۡهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفۡ مِنۡ أَرۡضِنَآ﴾.

وتیان لە زەمینەی عوزر هێنانەوە کە بۆچی ئەم گشتە زەحمەتە ئەو دەیکێشیٚ بۆچی تەئسیریان تیٚ ناکات، ئەگەر ئێمە شوێنی هیدایەت لەگەڵ تۆ قبوڵمانە کە (هدی) یە هەتا بە وشەی (هدی) کە لە ئەسڵدا (مصدر) وەختێك مصدر بەکار برا بۆ زاتێك بۆ نمونە: قورئان نیشانەی مبالەغە کردنە کە ئەوەندە (هادیە) هەروەك خۆی هیدایەتە ئەڵێن ئەگەر ئێمە بکەوینە شوێن (هدی) ئەو بەرنامەی کە تۆ هێناوتە لەگەڵ تۆ دا هاو مەسیر بین ئەوا ئیشارە دەکەن بەوەی کە ئاسایش و بە سامانبونی وەزعی (اقتصاد)ی ئەوان لە سایەی ئەوەیە کە بەڵامن پەردە داران و سەرپەرشتانی کەعبەیەکن پرە لە بتانی عەرەبەکان.

ئەم عەرەبانە بت پەرستن مەرکەزی بت پەرستیەکان کەعبەیە قورەیشی سەرپەرشتیاری کەعبەیە بە سەرپەرشتی کەعبەوە مەنزڵەتی وایان پەیا کردووە کە لەو عەسرە وا کە ئەمنی ئیقتصادی و سیاسی وجودی نیە ئەم قورەیشیانە ئەکەونە ریٚ بەرەو شام و یەمەن گشت کەس لەبەر خاتری ئەوەی سەرپەرشتیاری کەعبەن ریزیان دەگرن.

هەروەها هیچ کەس هێرش ناکاتە سەر وڵاتیان، وان لە ئەمن و ئاسایش وە ئازوقەیان و رزق و رۆزیان بە رەحەتی جیٚ بەجیٚ دەکەن.

دەی ئێستاش فکر دەکەنەوە دەڵێن ئەگەر ئێمە ئیمان بێنین دەبیٚ ئەم بتانە لابەین بۆمانمان لا برد خۆ ئەم خەڵکە بەم شەرتە ئێمەیان قبوڵە پەردەدارانی کەعبە یەکین مەرکەزی ئالیهەی ئەوانە، ئەو مەنزڵەتەمان لە دەست دەردەچیٚ نەتەنها ئەمن و ئارامی نامێنیٚ بۆمان بەڵکو هەر دەمان رفێنن ئا ئەوە یە کە دەبێت بە مانعی ئەوەی ئێمە ئیمان نەهێنین.

جا جوابیان دەداتەوە دەفەرموێت:

﴿أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا ءَامِنًا يُجْبَىٰٓ إِلَيْهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَىْءٍ رِّزْقًا مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾.

ئەمە ئەوە بۆ روو لەوە ناکەن کە هەتا بەو حاڵەتەوە کە هەیانە ئێستا وان لە شرك و لە کوفردا، ئێمە حەرەمێکمان بۆ داناون ئا ئەمە مەکە و حەرەمی مەکە کە ئیتر لەلای هەمووکەسانی تر محەرەمە و بوونی بەئامن لێرەدا بووە بە سەبەبی حفزیان لە هەر جۆرە ترزانێك، ئەوە بۆ بیری ئەوە ناکەنەوە کە ئێمە حەرەمێکی ئامینەمان بۆ دامەزراندووە یانی هیچ جۆرە ترس و دوو دڵیەك بۆ ئەوەی لەم هەرێمەدا بژی نیە وەتەنها ئەمنی هەیە لە رووی سیاسیەوە بەڵکە هەرچی شتە کۆ دەکرێتەوە دەهێنرێ بۆ ئەوێ.

ئا ئەمە مەشیئەتێکە لە تەرەف ئێمەوە وە لایقێك تایبەتە بەم شوێنە و ئەهلی ئەم شوێنە دەفەرموێت: ئێمە بە وجودی لادانیان ئاوا بۆمان رێك هێناون دەی ئێستا ئەترسن ئەگەر ئیمان بێنن یەکتاپەرست بن ئێمە دەستیان لێ بکێشین بەڵام زۆرتریان ئەمە نازانن.

دەی کوفری قەومی پێغەمبەر محمد علیە الصلاة والسلام بەم شێوەیە رۆشن دەبێ کە تەنها ئەمەبووە کە لەبەر مەسئەلەی ژیانی دونیا حازر نەبوون تەسلیمی ئەوە بن نەك نەیانناسیوە یان ئنکاری وجودی خودا یان مەلائیکە بکەن یانی شتی تریان کردبێ بەڵێ لە جێگای تر دا جار جار ئنکاری ئەمە دەکەن کە ئەو رەسول بێت دەبێ گشتی بەشەر رەسول بێت، بەڵکو ئەمە دەری دەخات کە ئەو ئنکاریانەی کە کردوویانە مەسئەلەی عنادی بووە، چونکە لێرە وەختێك ئیتر خەریکی هێنانەوەی عوزرێك بوون حاڵەتی ئەو عنادە تایبەتەیان یان لە بیر چۆتەوە لە دەستیان دەرچووە ئیعترافیان کردووە بەوەی کە پێی دەزانن.

ئـەم ئایەتـە دەری دەخـات کـە ئەمـە حەقیقـەتی دەوری ئەساسـی بـۆ ئیمـان نەهێنانیان ئەوە بووە.

بەم شێوە ئینسان زۆر مەسائلی بۆ ڕۆشن دەبێتـەوە، بـە تایبـەت لـە جـوابی ئـەو کەسانەی دەڵێن :

﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾.

یانی کەسێك معتەقد بە ما انزل الله نەبێ کافرە ئا ئەمە هیچ جێی قسەیەکیان بـۆ ناهێڵێتەوە.

چونکە لێرە ئەوان دەزانن ئەوە ( هـدی )یـە بـەڵکو شـوێن نەکـەوتنی لەبـەر ژیـانی خۆیان وە ژیانی دونیایان هەڵبژارد بە لە دەستدانی ئاخرەت ئا ئەمەیە کوفر لـە دوای ئەوەی ( اقامه حُجَة ) کران.

جا لە زەمینەکانی تری غەیری تەوحید نمونەی زۆر هەن بۆ ئەوەی کـوفر عبـارەت لە ئنکاری فلان حەقیقەت نیە، بەڵکە وجودی ئیعتراف بەو حەقیقەتە تەسـلیم نـەبوون بە ( اقتزای ) ئەو ئیعترافە.

بۆ نمونە / سورەتی ماعون لە ئایەتی ئەول سـوئالێك دەکـات لـە دوو ئایـەی دوای ئەوە جوابی دەدەنەوە وە لە چەند ئایەی دوای ئەوەشـدا تـەوزیحاتی تـر هـەن بـەیان دەکات.

لەئەوەلەوە دەفەرموێت :

﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ﴾.

سوئاله دەبینین ئەرێ دیت، بەڵام چونکە وەختێك كەسێك شتێ ببینێ ئەتوانێ قەزاوەت بكات بە سەریا لەبەر ئەوە ﴿أَرَءَيْتَ ﴾ بەكار براوە. بۆ ئەوەی حوكم و قەزاوەتێك لە زەمینەیەكدا بكرێت.

ئەرێ دیت ئا دەی حوكمی خۆت بدە رەئی خۆت لەم بارەیەوە بڵێ بە ئێمە كە ئەو كەسانەی وا دین بە درۆ دەخەنەوە كێیە بۆ نمونە﴿يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ﴾ كەسێكە ئنكاری وجودی قیامەت بكات باسی شتێكی تر لەمانە.

ئیجازە نادا جواب بداتەوە خۆی جواب دەداتەوە.

﴿فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ ۝٢ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ۝٣﴾.

دەی ئەگەر دەتەوێ بزانی كێ یە دین بە درۆ دەخاتەوە و رۆژی جەزا ی قبوڵ نیە، ئەوە ئەو كەسەیە وا بە وەزعی ناخۆشی بە شددەت یەتیم دەردەكات یەتیمێك كە بێدەسەڵاتەو دەبێ سەرپەرشتی بكرێت وە یارمەتی ئنسانێك نادا كە تونای ئەوەی نیە خۆی بژێنێ نەك ئەمە ( مكذبي بالدين )

یانی ئەگەر ئینسانێك زانی كە قیامەت هەیە بەڵكو هۆش بەلای بێ دەسەڵات و نیازمەندانەوە نەبوو ئەو ئعتراف بە وجودی قیامەتیە وا نەبوو كە ئاگاداری بكات بابەت گیریەك ئەوە بە كردەوە وتویەتی قیامەت درۆیە چونكە ئەگەر بڵێ قیامەت راستە خۆی حازر دەكات.

دەی خۆ بۆ حازر كردنیش ئەوە دەبێ حەقی خودا بدا وە صاحب حەقترین كەس بۆمانن كە لەو ئایەتە باسیان دەكات.

دوایی دەفەرموێت: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴾.

باشترین شت یەکەم عەمەلی صالّحە کە لە ئینسان دەردەچیّ ئەوە نوێژە، ئەگەر رۆحی نەبوو ئەگەر ئەو تەئسیرەی دەبیّ بیبیّ نەیبوو بۆ ئینسان مایەی عەزاب و بەدبەختی یە نەك مایەی خۆشبەختی.

بەعزێك وا لێك دەدەنەوە کە کەسانێك گوێ نادەن نوێژەکانیان دەفەوتیّ. بەلاّم نا هەر ئەوەی وا نوێژ دەکات بەلّکو نوێژەکەی کاری لیّ ناکات لەکارو کردەوەی.

﴿ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ۝٥﴾.

ئەوانەی وا لەو نوێژەیان دەیکەن غافلّن. یانی قەرارە وەختیّ ئنسان نوێژ دەکات ئەو نوێژە لە (فحشاء منکر) دووری بخاتەوە.

هەروەکو دەفەرموێت :

﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ﴾.

نمل: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَـٰنِ وَإِيتَآئِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ ﴾.

سیّ شت جا ئێستا سیّ شتی بەرامبەری بۆمان بە (بشری مشوش) بە استطلاح

﴿وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ﴾ مقابلی ﴿وَإِيتَآئِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ ﴾

﴿وَٱلْمُنكَرِ﴾ مقابلی احسان.

والبغ مقابلی عدل

یانی (انفاق) نەکردنی بە خزمان و دۆستان ئەوە فحشا ومنکرە.

دەی وەختێك یەکێك لە فحشاء (انفاق ) نەکردن و (بخل) ە نوێژێك کە ئنسان نەگەرێنێتەوە لە کاری ئاوا فەحشاو مونکەرە.

نوێژێك ئنسان دوور نەكاتەوە لەو كردەوانەی لە سورەتی ماعون باس دەكرێ (

دەركردنیەتیم و نەدانی خواردنی هەژاران، وای بۆ ئەو نوێژكەرەی ئەم نوێژە دەكات.

﴿ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ﴾.

لە نەتیجە ئەو نوێژە بۆ ئەوەیە كە فەقەت پیشانی خەڵكی بدا نوێژ دەكات نەك بۆ خودا.

﴿ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ﴾.

وە ئەم نعمەتەی كە خودا پێی دا بوو كە ئەبێ لە رەوان بێ یانی بێجگە لەوەی خۆیان نیازیان پێیەتی

ئا ئەو نعمەتە كە دەبێ لە رەوان بێ ئەیگرنەوە وبەری ئەگرن وە نایگەیەنن بە شوێنی خۆی.

سورەتی مطففین

وەختێك باسی كەم بە خەڵكدان و زیاد وەرگرتن لە وەختی معامەلە دەكات لە دوای كەمێك دەفەرموێت:

﴿ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿١١﴾ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ ﴾.

لە پێشدا جارێ هەڕەشە دەكات لە (مطففین) یانی كەم دانی شتێك لەحەقی خۆی كەمتر بدرێت ئەوانەی وا وەختێك لە خەڵكی شت وەردەگرن گشتی ئەسێنن حازر نین كە لە كەمترین حەق لەلای خەڵكی خۆش بن، وەختێ كە بە خەڵك ئەدەن لێی كەم دەكەنەوە، جا دەفەرموێت: ئەرێ ئەوە ئەوان هەر گومانی ئەوە ناكەن هەر بیرێك لەوە ناكەنەوە كە لە دوای مەرگیان زیندوو بكرێنەوە بۆ رۆژێكی گەورە رۆژێك

خەڵك لە حزوری رب العالمین رانەوەستن، جا دوایی دەفەرموێت: هەروا ناكرێت بۆمان هی ئەوانە وا لەناو (سجین) جا دەزانی سجین چی یە ؟

سجین : بە تەفسیری بە عزە كتێبێكەوە پەروەندەیەك گشتی یە تەواوی پەروەندە تاكەكانی كافرەكان و گومرایانی تێدایە كە ئەفەرموێ: ئەو كتێبە بە رەقەم نوسراوە یانی هیچ كام لە كردەوە كانیان بزر نابێ.

جا دوای ئەمە هەرەشە دەكات لەوانەی كە رۆژی جەزا بە درۆ دەخەنەوە، بە درۆ خستنەوەكەیان ئەوەبوو كە ئاوا لەگەڵ خەڵك دا دەجوڵانەوە حەقی خۆیان لە خەڵك دەستێنن بەڵام حەقی خەڵكی بە تەواوی نادەن، كەسێك ئاوا بكات بە وجودی ئەوەش باوەری بە رۆژی قیامەت هەیە ئەو (مكذب بیوم الدین). ئەوە كافرە بە رۆژی قیامەت.

بۆ چونكە فەرقی ئەو و كەسێك باوەری بە رۆژی قیامەت نیە هیچ نیە، بەڵكو هەردوو یەكجۆر هەڵس و كەوت دەكەن. دوای ئەو دەڵێ ئەوە گومانی ئەوەش ناكەن زیندوو دەكرێنەوە بۆ ئەم رۆژە گەورەیە.

وەیا لە ئایەتی ٨٥ سورەتی بقرە بەیان دەكات ئەگەر ئینسان بەشێك لە كتێبی خودای قەبوڵ كرد ملتەزم بێ پێی، بەڵام لە بەشێكی تری بە وشەی (بعض) دەفەرموێت، هەتا یەك مەسەلەش دەگرێتەوە بەشێكی تری قبوڵ نەكات لەبەر ئەمە لەگەڵ هەوەس و ئارەزووی ناگونجێ ئەفەرموێ ئەوە كوفرە.

دەفرموێ: ئێمە لە بنی ئیسرائیل پەیمانمان سەند بوو كە یەكتر نەكوژن كەس لە ماڵ و شوێنی خۆی دەرنەكەن.

ئەمجارە دەفەرموێت: ئێوە بەشێك لە فەرمانی خواتان خستە پشت گوێ كوشتار ئەكەن خەڵك لە ماڵو شوێنی خۆیان دەرئەكەن بەڵكو وەختێك كەسێك لە تایفەی

خۆتـان بـە خەسـارەت دێتـە بـەر دەسـتتان مـاڵ و سـەروەتی بـۆ خـر دەکەنـەوە لـە خەسارەت رزگاری دەکەن دەفەرموێت :

دەی ئـەوە ئێـوە بـەعزێك لـە کتیبـەکان ئیمـانی پـێ دەهێـنن لـە دوای ئەمـە کـە ناسیوتانە ملتەزم دەبن پێی وە کوفر بە بەعزێکی دەکـەن لـە پـێش چـاوی دەخـەن و لەوەی کە تیایەتی ملتەزەم نابن.

ئەوانەی لە ئێوە کەئاوا کارێك دەکەن جەزایان چییە غـەیری ریـسوایی لـە ژیـانی دونیا غەیری ئەوە کە لە رۆژی قیامەت بگەڕێندرێنەوە بۆ قورسـترین عـەزاب وە خـودا لە وەی کە ئێوە دەیکەن غافلّو بێ ئاگا نیە.

بۆ نمونە / وەختێك کەسێك لە ناخۆشی رزگار دەکەن بەڵکە ئەم لەگەڵ هەوەس و ئارەزوو دەخوێنی چونکە لە قەولی خۆتانە پێتان ناخۆشە لە خەسارەت بن.

بەڵکو ئەو وەختەی تورە دەبن ئەوانـەی وا خۆتـان رزگارتـان کـردن دەیـانکوژن و ماڵ و سامانەکەی داگیر دەکەن.

ئیتر لەمە رۆشن تر نیە ئەگەر کەسێك لـە فەرمانـەکانی خـودا لـە دوای ئەمـەی کـە رۆشن کرانەوە تەنها یەك فەرمانیش لەبەر ئەمە کە لەگەڵ هەوەس و ئارەزوو ناگونجێ پشت گوێی خستبێ ملتەزم نەبوو خودا بە کافری دادەنێ و ئـاوا هەرەشـەی لێـدەکات لە ژیانی دونیا و قیامەت.

ئا بەمانە ئیتر ئەو گومانە نامێنێ کە کوفر گومڕایی و لەسەر ڕێی خودا نەبوون ئەمە نیە کە تەنیا ئنکاری وجودی خودا بکرێت یان ئنکاری ڕۆژی قیامەت بکرێت یان ئنکاری قورئان بکرێت یان شتانی تر لەم جۆرە.

بەڵکە لە دوای ئەوەی کەسێك ئا بۆمانی هەمو ئیعتراف پێ کرد تەسلیم نەبوون بەوەی کە ئەیزانێ لەو بارەیەوە وە نەجوڵانەوە بە بەرنامەی، ئەوانە ئەوەیە کە قورئان پێی دەڵێت کوفر.

بەڵێ لە قورئاندا باس کراوە کە ئنسانی ئیماندار ئەکرێ توشی گوناهی گەورە بێت لە لەحزەی زوعف و بێ توانایی ئیمان، بڵێین: تووشی زینا دەبێ، بەڵام لە عەینی کاتدا هەست بە شەرمەزاری دەکات وە لە دوای ئەمەش کە لە کارەکە بۆوە لە سورەتی نساء لە ئایەتی ١٧ دەفەرموێت (من قريب) زوو تۆبە دەکات و دەگەڕێتەوە ئا ئەمە دیارە کە هەوەس و ئارەزووی خۆی نەکردووە بە (اله) بۆخۆی.

بەڵکو وەك لە ئایەتی دوای ئەمە دەفەرموێت: ئەگەر هاتوو هەر تووشی خراپە و گوناحی گەورە بوو گوێی نەدا و هەستی بە شەرمەزاری نەکرد لە کاتی گوناحەکە و دوای ئەوە زوو پەشیمان نەبۆوە هەر چوو لەسەری چوو لەسەری تا نزیك مەرگ وە ئیتر هەستی کرد ئیتر توانای ئەوەی نەماوە کە کارێك ئەنجام بدات لە و وەختە بڵێ تۆبەم کرد خودا دەفەرموێت: لەو وەختە ئیتر تۆبەی لێ قبوڵ ناکرێت ئەوانە ئەشکەنجەی بە دەردمان بۆ ئامادە کردوون هەتا لە ئایەتەکە لەگەڵ کافرەکان بەیەکەوە ناویان دەبا.

ئەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ . وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ

ٱلْمَوْتُ قَالَ إِنِّى تُبْتُ ٱلْـَٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمْ كُفَّارٌۚ أُوْلَـٰٓئِكَ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾.

بەم جۆرە بۆمان رۆشن دەبێتەوە کە بیر و بۆچوونی مسوڵمانانی ئەمڕۆ لە مەوردی ئیسلام و کوفر شرك و تەوحید حقائقی دین چەندێك دوورە لەوەی کە لە قورئان دەرك دەکریّ.

بۆ نمونە / کەسێك کە دەڵێت ئیمانم بە خوا هەیە وەشەعائرێکی دین جیّ بەجیّ دەکات وەك ئەوەی نوێژ دەکات یان رۆژوو دەگریّ ئەمە بووە بە تێگەیشتنی ئیمان لەلای زۆر لە مسوڵمانان.

وە هەتا وشەی گەورەی (توحید) لا اله الاالله مەعناکەی ئەوەندە غەریب بوە بە مەعنایەك بێگانە لە لەفزی (اله) دانراوە کە ئەگەر ئێستا مەعناکەی خۆی بە خەڵك بگوتریّ بەیان بکرێت ئنسان لەگەڵ زۆر لە مشکلات توشی دەکات واتا کێشە دروست دەبیّ.

عاملێك هەیە بۆ ئەمەی مسوڵمانان لەم دوای یە مەعنای وشەیەك وەك (اله) کە هەمیشە بەسەر زمانیانەوەیە لێی غافلّ بوون، هەڵبەتە هەمیشە کەسانێك بوون کە حەقیان باش ناسیوە وە رایانگەیاندووە.

وە هەروەها عامل بۆ ئەوەی کە وشەی (رب) مەعناکەی غەریب بوو لە سائری( مسطلحاتي) ئیسلامی دروست ناسینی ئەوانە زۆر تەئسیری هەیە لە لایەنگری ئینساندا وە لە ئیمان بوونی ئنساندا نەبوونی بە مسوڵمانێکی تەقلیدی چینی یەکەمی مسوڵمانان بەر لەوەی کە قورئان دابەزیّ خۆیان لەناو جاهلیەتدا بوون وشەی (اله — رب ) و شتانی تر لەم جۆرە وەختێك بەکاریان دەهێنا ئەیانزانی بە چ مەبەستێکەوە دەیڵێن هەدەفیان لە بەکار بردنی ئەم کەلیمانە رۆشن بوو وەختێك بۆ نمونە

دەیانگوت ( الله ) شتێك وا خۆیان ڕووبەڕوو بوون لە گەڵیدا بە کردەوە سەروکاریان لە گەڵی بوو وە دەروونی خۆیان نسبەت بەم شتە دەناسی ئا ئەوەیان مەبەست بوو.

لەبەر ئەوە وەختێك کە دەعوەتی توحید دابەزی وە ڕاگەیەنرا بە ئەوان کە ( لااله‌الاالله ) خەڵك تێ گەیەشتن کەچی نەفی دەکرێ هەدەف ئەوەیە کە چی ئیسپات بکرێت.

بۆ نمونە / کاتێك بەردێك یان شتێکی تر دەکرێ بە ( اله ) ئەو بەردە یان ئەو بتە وای نەکردووە، بەڵام باوەڕبونی دەروونی ئەو کەسە نسبەت بەو بەردە وای کردووە ڕێزێکی لێ بگیرێ باوەڕی پێی بێ، بەڵام ئەمە لەلای هەموو کەسێك وا نیە لای یەکێك ڕێز و ئیحترامی هەیە وە بیکا بە ( اله ) وە لای یەکێکی تر لەوانەیە بیکا بە سێکوچکە بۆ ئەوەی چایەیەکی لەسەر لێ بنێ.

لەبەر ئەوەی وەختێك کە پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام تەواو ئیسلامی بە تەوفیقی خودا موسەللەت کرد بەسەر عەرەبستاندا وە بتەکانیان شکاند و تێکیاندان نەی فەرموو: دەبێ تەواوی ئەم بتانە سزا بدرێن بە هیچ جۆرێك قابلی ئیستفادە نین بەڵێ ئەشکێنرێ لەبەر چاوی ئەوان کە هیچ کارێکیان نیە، بۆ نمونە: ئەگەر تەختە بوو دوایی ئنسان دەتوانی لە شتێك ئیستفادەی لێ بکات.

یانی ئەو بابەتگیری ئینسان نسبەت بەو شتە ئەو شتە دەکات بە بت.

دەی مسوڵمانانی چینی یەکەم ئەمە دەزانن چون خۆیان حاڵەتەکەیان بوو لەبەر دەمیان، بەڵکو لە دوای مودەتێك مسوڵمانان چونکە لە کۆمەڵێك ئیسلامی هاتبوونە دنیا بە پەروەشێکی زەعیف ئیسلامیان دیبو لەگەڵ کەسانێك وە کەسانێکی تریش پەروەر دەیەك بە هێز درابوون لەگەڵ بەلامن تێکەڵاو بوون جیاییەکیش نەبوو لە بەینیا ئەم حاڵەتانەیان بە شێوەی وازح لە بەرامبەری مەخلوقاتی خوداوە نەبوو، نمونە / بتێك نەبوو لە بەرامبەریان ئەگەرچی حاڵەتەکانیان ( تبدیل ) بوبو بەوەی کە

له به‌رامبه‌ر به‌نده صالّحه كانی خوداوه بێت وه ئیتر یاده‌بوبتێك بۆ ئه‌وان دانه‌نێن چون ئه‌م حالّه‌ته به‌و رۆشنیه له به‌رامبه‌ر به‌رد و ته‌خته‌و فلان نه‌بوو ئه‌مجاره ئیتر وشه‌ی (إله) به مه‌عنای وه‌زعی خۆی نه‌ما وه‌ختێك (اله) به‌كار ده‌برا ته‌سه‌وریان ده‌كرد (اله) یانی ئه‌و بتانه‌ی كه ئه‌و وه‌خته بوون وه ئه‌و سه‌نه‌مانه‌ی ئه‌و وه‌خته بون وه ئه‌وانه نه‌ماون ئیتر كێشه‌یه‌ك نه‌ماوه.

له حالێكدا (اله) بابه‌تگیری ئنسان ده‌یكا به (اله) وه له هه‌موو عه‌صرو زه‌مانێك ده‌كرێت (اله) به شێوه‌یه‌ك له شێوه‌كانی بێت كه مناسبه له‌گه‌ڵ وه‌زعی ئه‌و زه‌مانه.

بۆ نمونه / وای لێ بێ (اله) ببن به په‌رله‌مانی كه ته‌شریع ده‌كه‌ن و قانون بۆ خه‌ڵك داده‌نێن یان ببێت به ئاساری یه‌كێك له پیاو صالّحان به مباره‌ك به وه‌سیله‌ی جلبی نفع و دفعی زه‌ره‌ر ئه‌زانرێ.

ده‌ی ئا له‌به‌ر ئه‌مه بۆ به‌یانی راستی ته‌وحید بۆ مسولّمانان لازمه كه ئنسان یه‌كه‌م هه‌نگاوی رۆشن كردنه‌وه ئه‌م (إسطلاحة) گه‌وره ئیسلامیه (اله) وه هه‌روه‌ها له پاڵ ئه‌وه‌دا (رب) وه به‌شوێنی ئه‌وا اسطلاحه‌كانی تر.

{(اله) یانی چ له چی هاتووه}

اله : له فعلي أَلِهَ – يَأْلَهُ، كه له سه‌ره‌تاوه بۆ مه‌عنایه‌كی ماددی به‌كار هێنراوه كه له حالّه‌تێكی زۆر بیدایه‌وه ده‌ستی پێ كردووه تا گه‌یشتۆته كه‌مالّی خۆی.

عه‌ره‌به‌كان وتویانه: أَلِهَ الفَصِيل

فصیل / به‌چكه وشتر

وه‌ختێ وشتر به‌چكه‌یه‌كی بوو وه چوو بۆ له‌وه‌ڕ به درێژایی رۆژ ئه‌و به‌چكه بێ تاقه‌تی دایكه‌كه‌ی بوه برسی بووه و باره باری كردووه و (احساسی) ده‌ردی برسیه‌تی كردووه په‌ناگه‌یه‌كی نه‌بووه كه په‌نای پێ ببات بۆ ئه‌وه چاره‌ی خۆی بكات، یانی هه‌ستی به‌وه كردووه بۆ ئه‌وه‌ی زه‌ره‌رێك هه‌یه بۆ ئه‌م برسیه‌تیه به‌ڵكو

رێی لادانی نەبووە وە نەفعێك هەیە كە شیرەكە بێت ئەم تێر بكات، بەڵكو رێی ( جلب ) ئەوە نەبووە لە دوایی كە ئێوارە دایكەكەی هاتۆتەوە هەڵمە هەڵم رای كردووە خۆی خستۆتە ژێر سكی و دەمی ناوەتە گوانەكەی شیری خواردووە تا ئەم حاڵەتی چوونی بۆ لای دایكەكەی وتوویانە( آلهَ الفَصیل ).

لێرە زەرەرێك هەیە و چاكەیەك هەیە:

وەدایكێك لە جلبی نفع دەكات تێر بوون بۆ دفعی زەرەر دەكات برسی بوون وە شتێكی تر هەیە كە تا بۆمان دەزانن كە بەچكە وشترە ئەمجارە وەختێ ئەم باوەرە پەیا دەكات وە لە دەروونەوە تەسلیم دەبێ كە دایكی

( جلبی نفع دفعی زەرەر ) بۆی ئەكا خۆی ئەخاتە پەنای وە هاواری پێ دەبات و داوای كۆمەكی لێ دەكات وە ئەویش كۆمەكی دەكات. یانی ئەم بێچووە هەست بەوە دەكات كە كاری بە ژێردەستی ئەم دایكەیە ئەو سەربەشتێتی ئەم دەبێ لە ژێر ئەمر و فەرمانی ئەو دا بێ هەستی بە دەسەڵاتێك بەسەر خۆیدا دەكات وەختێك ئەو دەسەڵاتەی ئەو ( اعتراف )ی پێ دەكات لە دەروونەوە تەسلیمی ئەوە دەبێ كە قەبوڵی ئەوە بكات، ئەمجارە تەماشا دەكەین كە لایەنگریەكی مناسبی دەبێ كە بە شوێن ئەودا دەچێ.

دەی تا لەمانە بۆمان دەردەكەوێ كە ( اله ) یانی مەوجودێك كە ئنسانێك وا بزانێ ( جلبی نفع و دفعی زەرەر ) دەكات ئیتر ئایا سەربەخۆ یان بە واسیتە بێت، وەختێك تا ئەمەی لێ زانی تا ئەم باوەڕەی پەیا كرد لە دەروونەوە تەسلیم بێ یانی ئومێد و رەغبەت نسبەت بەوە پەیا بكات وە لە دەرەوەش لایەنگرییەكی مناسبی لەگەڵ ئەمە بێ هاواری لێ بكات داوای كۆمەكی لێ بكات. ئەمە لایەك.

لایەكی تر ئەمە كە ( احساسی ) دەسەڵاتێك بۆ ئەوە بەسەر خۆیدا بكات مادام جلبی نفعی بۆ دەكات دفعی زەرەر، ئیتر دەسەڵاتێكی هەیە بەسەریا ئەمجارە لە

دەروونەوە بابەت گیریەك بكات مەتەناسب لەگەڵ ئەو باوەڕە كە پەیای كردوە یانی (خوف و رهب) ێكی تیا پەیا بو نسبەت بەو دەسەڵاتدارە وە لایەنگیریەك مناسب لەگەڵ ئەوا كە فەرمانداری بێ چوون و چەرای لەوەی كە بە دەسەڵاتداری خۆی دەزانێت، ئا ئەو شتە دەبێتە (اله)، واتە: (اله) یانی فەرمانڕەواو فەریادرەس.

فەرمانڕەوایەك وا تەرەف وای دەناسێ كە دەسەڵاتی بەسەرەوەیە لەبەر ئەوە (رهب) و ترس پەیا ئەكا نسبەت بە ئەو وە فەرمانبەرداری ئەبێ.

فەریادرەسێك تەرەف وای دەناسێ كە جلبی نفع و دفعی زەرەر ئەكات، جا ئومێد و رەغبەتی پێ پەیا ئەكات وە لەبەر ئەوە هاواری لێ ئەكا و داوای كۆمەكی لێ ئەكات، ئا ئەمە پێی دەوترێ (اله).

{مەعنای وشەی (رب) هەر بۆمانیە، بەڵام بە فەرقێكەوە}

ئەصلی وشەی (رب) مصدر لە (رَبَّ يَرُبُّ) بەخێو كردن.

رب: یانی خاوەن.

١- جا خاوەن یەكەم كارێك كە ئەیكات لەگەڵ ئەوەی وا لە ژێر دەستێتی یانی بەخێو كردنەكەی ئاوایە كە ئەوەی وا ئەو لازمیەتی بۆ گەیشتن بەرەو نوقتەی كەماڵی (تهیئە) دەكات یانی (جلبی نفعی) بۆ ئەكا وەكو ئەوەی دایكێك خۆراك و شتانی تر بۆ منداڵەكەی ئامادە دەكات.

٢- ئەمجارە ڕێگرێك دێتە سەر رێ ئەوانە لادەبا (دفعي مشاكل) دفعی زەرەر دەكات، وەك ئەگەر نەخۆشی بۆ منداڵەكە پەیا بوو دایكەكە دەیباتە لای دكتۆر بۆ چارەی.

٣- وەختێك جلبی نفع و دفعی زەرەر لە دەستی ئەو خاوەنەیە ئەبێ ئیتر (تسمیم) ئەو بۆی بگرێ ئەبێ حەرەكاتی بەرەو ئەو نوقتەی كەماڵ لە ژێر دەستی ئەو

و له ژێر چاودێری ئەو بێت، كە ئەمە بە (ملك) تەعبیری لێدەدرێت بە عەرەبی حەقی تەسەرف و دەسەڵات بەسەر شتێك. وە هەردوو مەعنای یەكەم و دووەم بە (الرحمن و الرحیم) تەعبیریان لێ دەدرێتەوە هەڵبەتە خاص ناكەین بە مەعنای یەكەم ودووەم ئەڵێین مەجموعەی (الرحمن و الرحیم) یانی هەرچی خێر و خۆشیە پێی دەبەخشێ وە هەرچی زەرەر و ناخۆشی یە لای دەبا لەسەری (امر) وە (مالك وملك) كە مەعنای سێ یەم یا (معبود).

٤- وەختێك بۆمان بوو مەعنای چوارەم ئەمە دەبێ (ئامر)-(معبود).

٥- (معین) ئەو كەسە فەرمانڕەوا بێت و بەكردەوە فەرمان دەربكات، جاوەختێك فەرمان دەردەكات، ئەمجارە بە پێی شەرائت و یاسایەك ئەمەش ئەوە دەكات كە جلبی نفع و دەفعی زەرەر دەكات، كەوا بوو هاواری لێ دەكات و داوای لێ دەكات كە كۆمەكی بكات.

دەی بەم شێوەیە مەعنای (اله) و (رب) لە لەحازێكەوە فەرقیان نییە ئەو (٥) شتە هەن بەڵكو فەرق لەمەیە كە هەر (٥) یان راستەوخۆ مەعنای (رب) ن.

(رب) مەعناكانی:

١- الرحمن

٢- الرحیم

٣- مالك – ملك

٤- معبود – امر

٥- معین

كە لە سورەتی فاتیحە بە تەرتیب هەن.

بەڵكو (اله) راستەوخۆ بۆ دوو مەعنای ئاخیر (معبود و معین) بەكار دەهێندرێت، مەعناكانی تر شەرتن وەك مقدماتن بۆی.

یانی کەسێك کە ئامر بێ لەبەر ئەوەی بەراستی ( مالك ملك ).

کەسێك معین بێ لەبەر ئەوە کە بەراستی جلبی نفع و دفعی زەرەر دەکات.

بەم شەرتانەوە بەم کەسە دەووترێ ( اله ).

بەس هەر پێنجیان راستەوخۆ مەعنای ( رب ) ن، بەڵکو دوی ئاخیر مەعنای ( اله ) راستەوخۆ وە سێی پێشوو دەبن بە شەرت بۆ مەعنای ( اله ).

جا چونکە سێ مەعنای یەکەم ئەبن بە مقدمات بۆ دوو مەعنای ئاخیر دوو مەعنای ئەخیری لایەنگری خارجی پەیوەندی پێوە هەیە، تەماشا دەکەین لە سورەتی فاتحە سێ مەعنای یەکەم بە شێوەی ( اسم ) لە دوای ئەمە کە دەفەرموێت: ( رب العالمین ) بە گشتی بەیانیان دەکات، ئەمجارە بە تەفصیل دەفەرموێت: ( الرحمن الرحیم ) ( مالك یوم الدین ) ئەمجارە نافەرموێ: ( معبود المعین ) دەفەرموێت: ( ایاك نعبد وایاك نستعین ).

چونکە وەختێك ئینسان خودای بە (الرحمن الرحیم) ناسی رەغبەی تێدا پەیدا بوو بە ( مالك ملك ) بیناسی (رَهَبی) تیا بوو یانی ئومێد و ترس ئەمجارە ئیتر لایەنگری دەرەکی کاری دەبێت، ئەبێ بە کردەوە فەرمانبەرداری بکات ( نعبد ). مەعامەلەکردن داوای کۆمەك بکات (نستعین).

وە ( اله ) بۆ ئەم دوو مەعنایەی ئەخیر بەکار دەهێنرێت، بەم جۆرە رۆشن دەبێتەوەکە ( اله ) پێویستی بەروی عەمەلە ( اله ) توحیدی عەمەلیە، بەشی یەکەمی کە ئنسان هەر تەنها خودا بە ( رحمن رحیم و مالك ) بناسێ بە استلاحی علما پێی دەڵێت( توحیدی ربوبیه )ە، یانی ئینسان خودا هەر بەوە بزانێ.

بەڵکو توحید بۆ ( معبود و معین ) ئنسان بەکردەوە فەقەت فەرمانبەرداری لە خوا بکات وە بەکردەوە فەقەت داوای کۆمەك لەو بکات ئەمە پێی دەوترێ ( توحیدی الوهیه ).

تەماشا دەکەین لە سورەتی ( ناس ) دا بە تۆزێك فەرقەوە لەوێ دەفەرموێت :

﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ ، ( رب ) لێرە ( رحمن و رحیم ).

﴿ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴾ بۆ مالك یوم الدین.

﴿ إِلَـٰهِ ٱلنَّاسِ ﴾ بۆ مەعبود و معین ( نعبد ونستعین ).

دەی بەم شێوەیە رۆشن دەبێتەوە کە ئنسان وەختێك دەڵێ ( لا الـه الا الله ) یـانی چی :

فەرمانڕەوایەك کە بەراستی فەرمانڕەوا بێت بۆ ئـەوە بـشێ ئـەمر بکـات ، فـەریاد رەسێك کە بەراستی بێ جلبی نفع و دفعی زەرەر بتـوانێ بکـات وە بـۆ ئـەوە بـشێ کـە ئنسان ( رغبی و رجاء ) ی بێ پێیان غەیری الله وجودی نیە .

دەی مـسوڵمانان بـەم شـێوە مانـای ( الـه ) و ( رب ) یـان بزانیایـەو بناسـیبا کـار دروستی دەبوو .

یانی ئەو حەقی ( الوهیە و ربوبیە ) غەیری خودا بە هیچ جۆرێك حازر نەبێ ئـیعترافی تیابکات .

بـەڵام بـە داخـەوە زۆری مـسوڵمانانی ئـەمڕۆ ئـەم مەعنایـەیان ( رب ) و ( الـه ) دەیگەیەنن ئەیدەن بەغەیری خودا.

جا ( الوهیە و ربوبیە ) پەیوەندی هەیە بە ( شهادة ).

اشهد ان لا اله الله

وەختێك فیرعەون وتوویەتی: ( انا ربکم الاعلی).

بە مەعنای چوارەم ی ( رب ) ووتویەتی یانی من باشترین فەرمانڕەوای ئێوەم.

مانای ( اشهد ان لا اله الله )

شەرحی حەقیقەتی شەهادەت و کەیفیەتی شەهادەتە .

بەر لە گشت شتێك مەعنای ( لغوی ) شهادە :

مـادەی ( ش – هـ – د ) دوو دانـە ( مـصدر )ی هەیـە کـە مـەعنای دوەمینیـان متەرەتیبە لەسەر مەعنای یەکەم.

١- مصدری یەکەم ( شهود ) بە مەعنای حزور و نـەزەری شـتن یـانی ئینـسان هـەم حازر بێ لەلای ئەو شتە بۆی بڕوانێ کە ئەمە قەوی ترین شێوەیەکی عیلمە.

ئاخر ئنسان لەلای شتێك بێ بەڵام بۆ نەڕوانێ رەنگە شتێك وەسف بکـات ناتـەواو بێ‌و وەهمی تێدا بێ یان ئەگەر حـازر نـەبێ لـە دوورەوە بروانـێ ئـەویش هـەروا بـەڵام ئەگەر وەختێك لەلای دابوو هەم بۆی روانی هیچ جۆرە ( اشکال )ێك نایەتـە زانینەکـەی لەم بارەیەوە.

٢- مصدری دووەم ( شهادە ) نەقلْ کردنی علمێك بە وەسیلەی حزور ونەزەر( حازر و بینەر بێ ) پەیا بوو بۆ کەسێك کە حزور و نەزارەتی ئەو جـۆرە مەتڵەبـەی نـەبوە بـە جۆرێك بۆی نەقلْ بکرێت، ئەویش وەك ئەوی لێ بێ چۆن ئەو علمی پەیا کردوە بە ئەم شتە ئەویش ئاوها علمی پێ پەیا بکات، بەڵام دەبێ ئەو نەقلە جێـی ( اعتمـاد ) بـێ وە ئەگەر نا بەرامبەر بەوەی وە ك ئەوی لێ نایێ.

بۆ نمونە / نمونەیەك لە ژیانی خەڵك:

دوو کابرا بـەناوی احمد و محمـود باخێکیـان هەیـە کـە مـەوردی نزاعـە لـە بـەینی هەردوکیان محمود دەڵێ ئەم باخە هی من بووە احمد سەندوێتی لـە مـن، بـەڵام لەبـەر ئەمە کە خۆی توانای نیـە بـۆی ناکرێـت کـە باخەکـەی لـێ بـسەنێتەوە ناچـار دەچـێ دەستی بە دامەنی کەسێك جێ ( اعتماد ) لە ناو خەڵکدا دەبێ لەوانەی وا حزور نەزەری ئەمە بوون کە ئەم باخە حەقی محمـودە بـە تەمـەن هـەر لـە زوەوە چـاویان لـێ بـووە کەباو و باپیری محمود بەسەر ئەم باخەوەبوون، ئێستا لـەناکاو لـەم دوایـی یـە احمد داگیری کردووە ئەم دوو نەفەرە کەحازرو نـازری ئـەو بـوون دێـن لـە نـاو خەڵکدا ئـەو

راستیە دەگەیەنن کە ئەم باخە لە ئەسڵدا هی محمودە چونکە ئێمە حازر بوین و نازر بووین لەوەی کە ئەمە هی محمودە، احمد کە زەوتی کردووە شەهادە دەدەن جا ئەگەر احمد کە زەوتی کردووە بە (اشتباه) ئەوەی هەست پێ کردبوو دەست دەکێشێ لە زەوت و کار تەواو دەبێ وە ئەگەر لە رووی گەردەن کڵۆفتی ئەم کارەی کردبوو ئیحتمالی هەیە وەختێك کە خەڵك پێیان زانی ئیتر بۆی نەکرێ ئیدامەی ئەو زەوت کردنەی بداتو ناچار دەستی لێ بکێشێتەوە، بەڵکو بەعزە وەختێکیش زانینی زەوتکردنەکەی لای خەڵك هیچ تەئسیری ناکات دەسەڵاتی هەیە و بەردەوام دەبێ جا ئەگەر لەم شێوە یان بوو ئەمجارە زەوت لێکراو محمود چاوەڕێی ئەوەیە کە هەر ئەو دوو کەسەکە بانگ بکات بیانبا لە دادگا وە لە رێی ئیجراو تەنفیزی حوکم لەوێ دووبارە ئەم شهادەتە بدەنەوە ئەو علمەی وا هەیانە نسبەت بەو داوایە نەقڵی بکەن بەرەو دادگا کە بینا لەسەر ئەو علمە کە بۆی پەیا دەبێ لەمبارەوە حوکم دەردەکرێ بە گەرانەوەی ئەم حەقە بۆ زەوتلێکراو وە لێرە دا ئیتر احمد کاری نامێنێ دەترسێ یان ناترسێ یان دەسەڵاتی هەیە، چونکە دەسەڵاتی دادگا بانترە، ئیتر کاری تەواو دەبێ.

ئێستا ووتمان خودا هەیە کە خاوەنی حەقی (الوهیە) یە بەعزێك لە درێژایی تاریخ (الوهیە) تیان بۆ خۆیان ئیدعا کردووە، چونکە قەرار نیە خودا ئەم ئنسانە لە (اختیار) نوما بکات، چونکە ئەم ئنسانە مەوردی (اختبار)ی بۆ بکرێت چاکە بکات وە بیەوێ خراپە بکات، لەبەر ئەمە لە رێگەی سوننەتی جەبەریەوە لە (ابتلاوە) واردی کار نابێ بە زۆر ئەوانەی زەوت دەکەن لە بەینیان ببا و نەهێڵێ کار بکەن، بەڵکە وەختێك کە زەوتی ئەم (الوهیە) کرا کەسانێك خۆیان ناونا (فەریاد رەس) کە سانێك خۆیان ناو نا فەرمانڕەوا خودا ئەگەرێ لە ناو خەڵکدا ئەوانەی وا (معتمد) ن ئەوانەی وا ئەو باوەڕیە یان هەیە وە هەروەها خەڵکیش باوەر دەکەن بەقسەکانیان ئەوانە

هەڵدەبژێرێو لە پێشدا تێیان دەگەیەنیّ کە وەزع چی یە ئەم (الوهیە) حەقی ئەوە و حەقی بۆمان نیە زەوتیانکردووە، وەختێك ئەو کەسە بە وەسیلەی ئەو هیدایەتە تایبەتە کە پێیان ئەدرێت بۆیان رۆشن بۆوە (شهود) یان پەیا کرد بەم داوایە، تەبعەن لێرە شهودەکە شهودی (بصیر) ە یانی ئنسان بە (قلب) ی حازر و نازری ئەمە دەبیّ کە (الوهیە) هی خودایە هی غەیری خودا نیە. چونکە ئەگەر (محسوسات) بوو لە رێگەی چاوەوە دەکریّ، بەلاّم ئەگەر (معنوی) بوو لە رێگەی (قلب) ەوە دەکریّ، وەختێك خودا ئایاتی خۆی نیشانی ئەم کەسە داوە کە جێی (اعتماد)ە وای لێهات کە بە (قلب) حزور و نەزارەتی ئەم داوایەی کرد کە (الوهیە) فەقەت هی خودایە ئەمجارە (مکلف) دەبیّ لەناو خەڵکدا هەروەك ئەوەی کە محمود کەسانی (معتمد) ی دەهێنا بۆ ئەوەی لەناو خەلکدا (شهادە) بدەن. لەناو خەڵکدا وە بەرامبەری (غاصب) ئەوانەی زەوتیان کردووە کە من (اشهد) یانی ئێستا قسەیەك دەکەم (اشهد) کە ئێستا بەکاری دەبا لە ماوەی (شهادە) مصدری دوەم بەیانی داوایەك دەکەم لەمەو پێش (شهود) م بووە بۆ ئەم داوایە، کەچی ئا ئەم (الوهیە) کە ئێوە زەوتتان کردووە ئەی (غاصبین) حەقی ئێوە نیە وە خەڵکینە قبوڵتان کردووە لەمانە کە زەوت بکەن و لەسەر زەوت کردن بجوڵێنەوە بەردەوامی بکەن بزانن حەقی بۆمان نیە وە ئێوەش رەئی خۆتان دەربڕن لە بەرامبەر بۆمان.

جا ئەگەر لێرە کار تەواو بوو ئەوەی وا (الوهیە) ی زەوت کردوە (اشتباه) ی کردبوو وای زانیبوو کە حەقی هەیە لەبەر ئەمە دەستی کێشا چوە کەنارەوە ئیتر داوایەك نامێنیّ، بەلاّم ئەگەر (انکار)ی کرد حازر نەبوو دستی لەو ماڵ و خۆشیەی لەم رێگەیەوە دەستی کەوتووە واز نەهێنیّ. بەلاّم بۆ بڕینەوەی کار دادگایەك پێك دەهێنریّ بەڵکو نەك لەدونیا لە قیامەتدا دادگا پێك دێت لەویّ (غاصب) و ئەوەی

( الوهيـه ) ی زەوت كـردووه زەوت لێكـراو كـه خـودا خۆیـەتی حـەقی زەوتكـراو كـه ( الوهیه ) یه وه ( شاهد ) لەم زەمینەدا گشتی حازر دەكرێن وه لەویٚ كار دەبڕێتەوه .

ئا ئەم خولاسەیه لە مەعنای ( شهادە )

ئەمجاره بە تەفصیل:

وەختێك ئەم دوو پیاوه ( معتمد )ه ( شهادە ) دەدەن كه ئەم باخه هی محمـوده وه احمد زەوتی كردووه ئەبیٚ خۆیان بەر لە هەموو شتێك تەواوی لایەنگریـەكانی ژیانیـان وا بێت كه لەم شایەتی دانه بوەشێنەوه ، نەك ئینسانی خراپ بن. بۆ نمونە : شایەتیان دا كه ئەم باخه هی ( محود )ه ، دوای ئەوه چون لەو باخەدا سێویان لە احمد وەرگـرت ، دەی ئـیتر لێـرەدا خـەڵك سـیقەیان بـەم كەسـانە نـامێنیٚ یـانٚ ئەگـەر هـاتوو ئـەم ( شـهادە )یـان دا دوایـی پێكـەنین بـەدەم احمـد ی زەوت كـەر وه لەگـەڵی هەڵـسان و دانیشتن برادەرایەتی و معامەلاتیان بـوو ، ئەمـه لـه شـهادەكه كـەم دەكاتـەوه ، بـەڵام دەبیٚ ئەوانەی شهادە دەدەن كه احمد زەوت كەره دەبیٚ تـەواوی هـەوڵ و كۆشـشیان بـۆ ئـەوه بـیٚ كـه ئـەم حەقـەی محمـود وەرگرنـەوه ، بـه شـێوەیەكی تـر دەبـیٚ هـەم دەروونیان وەك ئەم قسەیه بێت كه گەیاندویانه بە خەڵك كه احمد زەوتكـەره محمـود زەوت لێكراوه ، هەم تەواوی كار و كردەوەیان لەم زەمینه تەئیدی ئەم قسەیان بكات ، ئەگـەر نـا تـەنها قـسەكه بـوو لـەو دوا لـه دەروونـەوه خۆشەویـستیەكان نیـسبەت بـه ( غاصب ) زەوتكراو بوو رقیان لێـی نـەبوو وەتـەكی بـیٚ ئەرزشـی دەردەچیٚ وه نـاوی ناندرێت شهادە .

جا ئەم دوو نەفەره لە لـەحزەی شـایەتی دانیـان شـهادە ئـەدا دەكـەن بـه یەكـەم هەنگاو دروسته وشەی شاهد یان بۆ بەكار ببریٚ ، هەروا یەك نەفەر چۆن قتـل ئـەنجام دەدا پێی دەوتریٚ ( قاتل )

( هەر کەسێك جارێك لە یەکێك ( افعال ) ی ئەنجام دا ( اسمی فاعل ) لـە ( مـصدر ) ی ئەو ( فعل ) ە دروستە بۆی ( مشتق ) بکرێت وە بـۆی بـەکار بهێنـرێ. جـا ئەگـەر دوای ئەمە هەر لەسەر ئەوە چوو ئەو دوونەفەرە شهادەیان هەر دوبارە کردەوە لـە شـرائتی جۆرا و جۆر ترسی تەماح وای لێنەکردن بگۆڕێن و سارد ببنەوە جولآنـەوەیان کـرد وە لایەنگیریەکانیش لە دەروون و لە دەرەوە وەك یەك بـوون، ئـەو وەختـە سەرپەرشـتی کەسێك بکات پێی دەڵێن ( والی )، لێرەش ئەمە کەوا لەسەر ئەم شهادە ئەچێ تا دوای وازی لێنـاهێنێ بـە تـەواوی جولآنـەوە بـە حـالاتی دەرونیـەوە تەئیـدی ئـەم قـسەیەی دەکات پێیدەوترێ ( شهید ) دە لـە مـەوردی مەسئەلەی حـەقی ( الوهیـە ) طاغوتـان و خاوەنی حـەقی ئەصـڵی کەخودایـە و وە ئـەو کەسـانەی شـهادە لـەم زەمینەیـە ئـەدا دەکەن دروست بەم تەرتیبەیە.

وەختێـك کـە تاغوتێـك ئـەو حەقـە ( غـصب ) دەکـات خـۆی دەکاتـە فـەرمانڕەوای خەڵکی یان فەریاد رەسی خەڵکی خودا لە سەرەتاوە یەکێك لەوانەی وا شایستە تـرین کـەس بـێ بەڵکـە شایـستە تـرین کـەس لـە هـەر عەسـر و زەمانێـك هەڵدەبـژێرێ بـۆی رادەگەیەنێ بەیانی بۆ دەکات بە ئایاتی ( افـاق انفـس ) کـە ( الوهیـە ) حـەقی خودایـە، وەك بۆ نمونە : پێغەمبـەر نـوح پێغەمبـەر ابـراهیم پێغەمبـەر محمـد علـیهم الـسلام وە سائری شاهدانی دەرەجەی یەکەم لـە شـەهیدانی دەرەجـە یەکـەم. ئـەم ئنـسانە تـێ دەگەیەنێ بۆی رۆشن دەکاتەوە تا ( شهود ) پەیا بکات بـەم داوایـە، جـا رایدەگەیـەنێ یانی ( مرسلی ) دەکات بـۆ ئـەوەی بـچێت شـەهادەکە رابگەیـەنێ، دەی بـەم تەرتیبـە ئەوەی وا یەکەم جار هەڵی دەبژێرێ بە تەعبیرێکی تر دەیکاتە( نـبی ) دوایـی ( مرسـل ) وەختێك دەیکا بە ( نبی ) تێی دەگەیـەنێ ( شـهود ) ی پـێ دەدا لـەم زەمینـە وەختێـك شهودی پەیا کرد ئەمجارە بۆ شهادە ئەیکا بە مرسـل ئەوانـەی وا ئـەو هەڵیاندەبـژێرێ ئەم مەنزڵەتەیان پێ دەدا ( معتمد ) ترین کەسن لەزەمانی خۆیاندا.

ئەمجارە کەسێك لەوانە لە دوای ئەمە کە خۆی تێ گەیشت، بۆ نمونە: پێغەمبەر ابراهیم وەها شهودی پەیا کرد بو لەم مەسەلەیە کە وەختێك لەگەڵ دەسەلاتدارەکەی زەمانی خۆیدا رووبەروو لەم زەمینەدا قسەی لەگەڵ کرد وە ئەو ئەیوت دەبێ من (اله) بم بەمانای چوارەمی (رب) یانی فەرمانڕەوا بم پێغەمبەر ابراهیم دەلیلی ئاوا بوو کە ﴿رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ﴾ فەرمانڕەوای من دەبێ کەسێك بێ کە مردن و ژیانی لە دەست بێ ئەویش دەستی کرد بە مجادلە کردن جائەوە چی یە منیش مردن و ژیانم لە دەستەکەسێك ئەهێلم نایکوژم کەسێك دەکوژم ئەمە ژیان و مردنە. لە حاڵێکدا ئەو کەسەی ئەم شتە دەکات لە دائرەی سوننەتی خودا ئەم کارە دەکات، حەقیقەتی مردن و ژیاندن بە دەستی خودا خۆیەتی، لەبەر ئەوە پێغەمبەر ابراهیم علیە السلام ئەم دەلیلە دەگۆڕێ بۆ دەلیلێکی تر، دەفەرموێت: من خۆم تەنها نیم فەرمانڕەوایی بەسەر مندا بە تەنهایی (امکان)ی نیە من بەشێکم لەم عالەمە وە ئەم جهانی ئافەرینیشە دەستگایەتی (واحدە) دەبێ هەماهەنگ جوڵانەوە بکەن (تقدیر)ێك کە خوا کردوویەتی بۆ ئەم بەشانە ئەو ئیستعدادانەخاص کەداوێتی بەهەر کام لەمانە سازگارە لەگەڵ ئیستعدادەکانی ئەوانی تر بەس کەسێك دەتوانی بەشێك لەمانە لایەنی بۆ دامەزرێنێ بزانێ بەقیە چۆن جوڵانەوە دەکەن وە تایبەتمەندیان چی یە.

ئەوجارە ابراهیم علیەالسلام دەفەرموێت: (الله) رۆژ لە رۆژهەلاتەوە دەردێنێ لە رۆژئاواوە ئاوای دەکات ئەگەر دەسەلاتی ئاوات بوو توانیت بەسەر ئەو جیهانی هەستی ئاوا حوکم بکەی ئەو وەختە مناسبە من لێت قبوڵ بکەم کە فەرمانڕەوایی بەسەر مندا بکەی.

لێره کابرای کافر که حەقی بۆ رۆشن بۆوه حازر نیه قبوڵی بکات ئیتر قسەی نامێنێ چونکه یەك قبوڵێتی که (الله) رۆژ له رۆژهەڵاتەوه هەڵدێنێ وه له رۆژئاواوه ئاوای دەکات، دوو لێره ئیتر جێی قسەی نامێنێ که منیش دەتوانم ئاوا بکەم.

دەی وەختێك ئاوا یەکێك لەم ئنسانە تاوانبارانەحاڵی دەبێ لە دوای شهود بەم مەسئەله پەیا دەکات جا (مأمور) دەبێ بۆ ئەوەی که بێته ناو خەڵك.

جا قەزیەی ئەساسی ئەوەیه که یەکەم کەسێك که (شاهد) ه لەگەڵی قسه دەکات (غاصب) ەکەیه.

ئەسڵەن تەبیعەتی (شهادة) ئەوەیه که (غاصب) ەکه بزانێ لەم بارەوه چۆن بەر له گشتێك نەیزانی بوو به (اشتباه) ئەمەی زەوت کردبوو.

وەکو یەکێك له زەوتکاراوانی (ال فیرعون) وەختێك حەقی بۆ رۆشن بۆوه ئیمانی هێنا و دەستی له (غصب)ەکه کێشاوه و قبوڵی کرد که ئەمه حەقی خودایه.

هەیه دانه هەن له رووی (اشتباه)ەوه (غصب) ی ئەم حەقەیان کردوه.

کەوابوو یەکەم جار دەبێ لەگەڵ خۆیان رووبەروو ببێتەوه جا ئەگەر کابرای (غاصب) قبوڵی نەکرد خەڵکەکەش لەمه تێ دەگەیەنرێن که خەڵکینە ئێوەش بزانن حەقی (الوهیه) هی خودایه بۆمان به ناحەق بۆخۆیان (ادعا)یان کردووه وگرتیانەته دەست.

ئەو وەختە ئەگەر ئەم خەڵکه جورئەتی وایان بوو که لە دوای ئەمه بۆیان رۆشن دەکرێتەوه ئەوانیش ئاوا شتێك ئەنجام بدەن یانی لە دوای ئەمه که (شهود) بەم مەسەلەیان پەیا کرد حازر بن که بەلامنیش ئەم (شهاده) بدەن وه خۆیان بدەن به پاڵ ئیمانداران پەیرەوی ئەوان و ئیمانی پێ بێنن ئەگەرنا حاڵی نابن یان حاڵی دەبن بەلام زاتیان نیه ئەترسن له تۆڵەی ئەو تەرەفەوه که حەقی (الهویه) ی زەوت کردوه، ئەوه دیاره لەلای ئەوی تر دەمێننەوه و بەوەی که دەزانن حەق هی کەسێکی تره

بۆمان ( غصب ) یان کردووه لەسەر قبوڵ کردنی ئا ئەو داوایە بەردەوام دەبن وە فەرمان لە فەرمانڕەوا وەردەگرن و هاوار دەکەنە فەریاد رەس بە ناحەق.

بەڵام بە پێی بەیانی قورئان لە درێژایی مێژوو هەمیشە بەشێك کەم بوون کە حازر بوون لایەنگری لەو شاهدە بکەن و بێنە پاڵ ئەو ئەوانیش رووبەرووی ( غاصبین ) بوەستن ئەم ( شهادە ) یە ئەدا بکەن.

وە زۆرینە یان حاڵی نەبوون یان جورئەتیان نەبووە ئەم کارە بکەن، بەڵام هەرچۆن بێت ئەم ( شاهد )ە ئەبێ رێی خۆی بەردەوام پێ بداتو نابێ دەستەوستان دانیشێ تەنها بە ( شاهد )بوون تەواو نابێ دەبێ ببن بە ( شهید )یش.

یانی بە حاڵاتی دەروونیان وە بە لایەنگری و جوڵانەوەی دەرەوەیان هەمیشە ئەمە بگەیەنێ جوڵانەوەیان عبارەت بێ لە ( شهادە ) وەك لە سورەتی ( عادیات ) دەفەرموێت

﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٞ ۝٦ وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٞ ۝٧﴾.

ئنسان نسبەت بەخاوەنەکەی خۆی حەق داپۆشە وە هەر خۆشی ( شهید )ە لەسەر ئەمە وە تەواوی جوڵانەوەی خۆی بە زمانی حاڵ هاوار دەکات کە ئەم ئنسانە ( کنود ) کوفرانی نیعمەت کەرە حەق داپۆشەرە.

جا ئەوئنسانە ( شاهد ) ەش کە لەلایەن خوداوە ( مأمور ) دەبێ ژیانی لەم جهەتەوە بێ وە ئەگەر نا لەلای خودا لێ ی قبوڵ ناکرێت نەیتوانیوە ( اعتما )دێك وەها نسبەت بەخۆی لە دڵی خەڵکدا بکات کە ئەم ( شهود ) ە بە خەڵکەکە پەیوەست بکات وە خەڵکیش بۆیان رۆشن بێتەوە ( اقامە حجە ) بێ بەسەریان وەلای خەڵکیش بە عنوانی ( شاهد ) و ( شهید ) قبوڵ نابێ، چونکە وەختێك تەماشا دەکەی خۆی نەقسی قسەکەی خۆی دەکات، ئیتر باوەڕیان پێ نامێنێ.

تا ئێرە جوان ڕۆشن دەبێتەوە کە ئنسان ئەبێ لە ژیانیدا ببێ بە ( شەهید ) هەروا باقی ( اصطلاح )ە ئیسلامیەکان ( اصطلاح ) ی ( شەهید ) ( شهادە ) زەربەی گەورەی لێ کەوتوە وەختێك یەکێك دەکوژرێ دەڵێن پلەی شەهادەی هەیە.

ئاخر شەهادە یانی ئنسان ببێ بە بانگەوازخواز لەم زەمینە شهادە بدا کە حەقە زەوتکراوە هی خودایە و هی بۆمان نیە، کەوا بەلایانەوە ئەمە چۆن شەهادەتی پێ دەوترێ بەر لەوەی ئنسان بمرێ ئەبێ ئەمەی جێ بەجێ کردبێ، بەلێ یەکێك لە کردەوەکانی ئنسان ئەوەیە کە لە ڕێی خودا دەکوژرێ ( مقتول فی سبیل الله ) ئەوە یەکێکە لە شەهیدەکان، نەك شهید فەقەت ( منحصر ) بکەن لەوە.

وەبەر لەوەش باشتر ئەوەیە کە ئنسان ئەوەش بزانێ کە غەیری ئا ئەم ئنسانە ( معتمد ) دانە ئەوانەش وا لە شوێن ئەوان ڕۆشتن و بەردەوامیان دا بە ڕێی ئەوان، لە دواییدا غەیری پێغەمبەران و پەیڕەوانی ڕاستی ئەوان شاهدی تریش جارێ یەکەم شتی ( شهید ) و یەکەم ( شاهد ) لەم زەمینەدا خودی خوایە لە دوای ئەوە مەلائیکەتی خودا دەستەی سێیەم ئەم ئنسانانەن بە بەندەیانێك کەخودا هەڵیان دەبژێرێ.

لە ئایەتی ١٠ ی سورەتی ال عمران دەفەرموێت:

﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْعِلْمِ قَآئِمًۢا بِٱلْقِسْطِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾.

ئەم تەعبیری ( اولو العلم ) بۆ هەر کەسێك لەمە گەیشت لەو داوایە ئەوجولانەوەی لەگەڵ ئەمەی ئەنجام دا یانی چوو ( شهاد )ەی لەسەر ( شهود ) ئەنجام دا ئا ئەوە پێی دەوترێ ( ذي العلم ) لە قورئاندا کۆیەکەی ( اولو العلم )ە،

دەی بەم تەرتیبە هەر کەسێك لە کەسەکانی بەشەر راوەستێ لەسەر ئەم ( شهادە )و بیگەیەنێ ئەچێتە ئەو ریزەوە، ریزێك کە لە پێشەکی خودا لەدوای مەلائکە وە لە شوێن ئەوەش ئەم کەسە لە بەشەر.

وە هەروەها دەزانین کەم جار ئەم شەهادە بوێتە هۆی ئەوەی کە ( غاصبین ) دەست لە ( غصب ) بکێشن لەبەر ئەوەی جارێکی ماوە بۆ ئەوە کە بۆمان ئەدای ( شهادە ) بکەن لە قیامەتدا.

قەرار ئەوەیە کە هەر کەسێك وا ئیمان دەهێنێ بە بەرنامەی خودا شهید بێ هەروا قەرار لەسەر ئەوەیە کە هەر ئنسانێك بە ئیمان بێ ئەگەر هاتوو کەسێك شهید نەبوو ئەوە کەم و کوڕی لە کاریدا هەیە. چونکە هەر کەسێك دەبێ بڵێ ( اشهد ان لا الە الا اللە ) تا لە ریزی ئیمانداران قبوڵ بکرێت وە دیارە تەلەفوزی ( مجرد )ی ئەم وشە ئەرزشی هەیە، چونکە منافقیش ئەمە دەڵێ ئەم تەلەفوزە وەختێك دەخوا کە ( مبتنی ) لەسەر ئەم ( شهود ) بێ وە بەیانی شهادەتی مبتنی لەسەر ئەم شهودە، جا ئەگەر هاتوو کەسێك ئەم وشەی بەم جۆرە تەلەفوز کرد لە دواییدا لەسەر ئەو حەرەکەتی نەکرد ئەمە ئەبێ بە ئەوانەی وا پێیان دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٣ ﴾.

بەس قاعدە ئەمەیە کە قەرار لەسەر ئەوەیە کە هەموو کەس ( شهید ) بن، هەرکەسێك ( شهید ) بێ ئەگەر هاتوو کەسێك شەهید نەبوو هەروا ئەگەر هاتوو کەسێك وەلی نەبوو ئەوە نەقسی لە بەرنامەکەیدا هەیە.

جا رەحمەتی خودا ئاوایە کە دەرەجەیەکی تری لە خوار ( شهید ) بون داناوە بۆ ئەوەی ئەگەر ئنسان بگاتە ئەو دەرەجەیەش لێی قبوڵە کە موئمن بێت، بەڵام راستی

ئەوەیە کە ئەوە ئیتر ناقصە (مقتصر) ە لەوەی کە خودا ئەمری پێ کرد بوو دەستوری پێدابوو، قەرار بوو شهید بێ شهید نیە فەقەت وا لە دەرەجەی (اصلاح) پێی دەوترێ صالح.

هەروا لە ئایەتی ٦٩لە سورەتی نساء ئیمانداران لە بەشەر دەکات بە چوار دەستەوە یەکیان (نبیین – صدیقین – شهداء– صالحین)

نبیین : کە دەرەجەی یەکەمن لە (شهداء).

صدیقین : دەرەجەی دووەمن کە لە شهادە یش بانتر (صدیق (هەیە کەتەواوی ژیانیان ئسپاتی راستی بێژیان لە ئەو قسانەیان دەکات کەوا وتویانە (اشهد ان لا اله الا الله).

شهداء: کەسانێکن کە ئیتر دەرەجەی نبوەتیان نیە دەرەجەی صدیقیان نیە ناوێك خاص پەیا بکەن ئیزافە لەسەر شهید بوون کە بەو ناوە ناویان ببرێ.

جا بۆمان دەکرێ جار جارێك هەر لە کارەکانیان بەرامبەر بە شهادە پێیان بلێ، بەڵکو لەسەری ناچن زوو دەگەڕێنەوە و پەشیمان دەبنەوەو تۆبە دەکەن، لەبەر ئەوە بەلآمن وەك صدیقین نین بەڵکون چونکە لەسەر ئەوە نەچوون لەبەر ئەوە بە شەهید قبوڵ دەکرێن.

بەڵکو دەرەجەیکی تر کە لە خوارەوە بە دەرەجەی (صلاح) ئەوانەی وا دەگەنە ئەم دەرەجە فەقەت ئەوەیە ئیماندارن و تا حەددێك کاری چاکەیان کردووە، بەلآم ژیانیان ئاوا نەبووە شهادە بێ لەسەر ئەو داوایە بە تەواوی سازگاریێ لەگەڵ ئەو قسەی کە دەیانگوت.

بۆ دەلیل لەسەر ئەوەی هەموو کەسێك دەبێ شهید بێ ئەگەر کەسانێك نەبوون ئەوە کەم و کوڕی لە کاریان هەیە.

ئایەتی ١٤٣ سورەتی بقرە: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴾.

ئێوەمان کرد بە ئومەتێکی مام ناوەندی نەبەلای (افراط) نەبەلای (تفریط) بۆ ئەوەی ئێوە (شهداء) لەسەر خەڵکی بن، یانی بە ژیانتان شهادەکە بدەن لەسەر ئەو داوایە کە ئیتر ببنە (حُجە) لەسەر خەڵکەوە هەر وا رەسولیش شهید بێ بەسەر ئێوە، ئەویش ژیانی شهادە بێ کە ئیتر ئێوە بەهانەیەکتان نەمێنێ.

وە لە سورەتی **حەدیددا** ئایەتی ١٩ بە شێوەیەك زۆر سادە تەعریفی شهداء ئەداتە دەستمانو دەفەرموێت:

﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ ۖ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمْ ﴾.

ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە بە خوا و بە پێغەمبەرەکانی خودا ئا ئەوانەن کە هەم الصدیقن هەم شهداءن لەلای خاوەنەکەیان.

هەڵبەتە لەبەر ئەوەی ئەم (مسطلحة) غەریب بووە هەندێك کەس وەختێك ئەو ئایەتە دەخوێنێتەوە ئاوای دەخوێننەوە:

﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ﴾ لێرە (وقف) دەکەن دوایی دەڵێن: ﴿وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمْ لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ﴾.

کە ئەوە (اشتباه)ێکەو حەقی خوێندنەوەی لەم ئایەتە ئەوەیە کە ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ ۖ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمْ﴾، بۆ گشتیان ﴿أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ﴾.

هەڵبەتە دەستەی صالحین لێرە باس نەکراوە چونکە مقدارێك نەقص هەیە لە ئیمان و عەمەلەکانیاندا، لەبەر ئەمە ئیتر ناویان لێرە نەبراوە.

وتمان ئینسان دەبێ لە ژیانیدا ببێ بە (شهید) نەك بە مەرگەوە، ئەوەشمان ووت یەکێك لەو عەمەلانەی وا ئنسان تکمیلی (شهادە) ی پێ دەکات ئەوەیە بکوژرێ لە رێی خودا لەسەر ئەمە شهادە یەعنی لەبەرامبەری (غاصب)ەوە بوەستێ تا ئەکوژرێت.

قەرار ئەوەیە کە هەموو شەهیدەکان خۆیان حازر بکەن بۆ ئەمە وە یانی دەبێ هەر لە یەکەم جاریوە خۆی حازر بکات بۆ ئەوەی لە بەین بچێ لە رێی ئەم شهادەیە جا بەعزێکیان دەکوژرێن لە شهادەکە کوژرانە لە رێی خودا. بەعزێکیان هەر بە حاڵەتی ئاسایی دەمرن وە شهادەکەیان بە ژیانیانە، بەڵکو فەقەت ئەو کوژرانەی تێدا نیە.

جا کوژران لە رێی خودا خۆی (مقصود) نیە ئنسان دەبێ خۆی لە ژیانیدا شهادە بدا جا ئەگەر بە جوڵانەوەیەك دروست بەرەو شتێك دروست کە لە کتاب و سوننەت رۆشن کراوەتەوە کۆتایی هات بە کوژران ئەمە باشە، ئەگەریش نەبوو قەرار لەسەر ئەوە نیە هەروا خۆیدا بە کوشت و وا بزانێ خودی خوێن رژان ئەمە شهید دەگەیەنێ رەنگە زۆر وەختی خۆ بە کوشت دان خۆ دەرکردن لەدەست مەسئولیەت بێ.

ئالەم بارەوە کوژران لە رێی خودا یەکێکە لە هەنگاوەکانی کە(شهاد)ەی بە حەقی پێ ئیسپات دەکرێ.

ئایەتی ١٤٠ سورەتی ال عمران لە باسی غەزوەی احد ئەفەرموێ:

﴿إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ ٱلْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُۥ﴾.

ئاخر بۆ نارەحەت دەبن کە لەوەی بەشێکتان لێ کوژراوە ئەگەر زەخمێك لە ئێوە کەوتووە ئەم جارە خۆ ئەو قەومەش یان قورەیش هەروا زەخمێکیان لێ کەوتووە.

﴿وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾.

وه ئەوەی رۆژگار كه هەڵی دەسوڕێنێ له بەینی خەڵكی جارێك بەملا جارێك بەولا.

﴿وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾.

خودا دەزانێ كێ بە ئەوانەی بە راستی ئیمانیان هێناوه ئەوەتا خودا لەوەو پێشیش دەزانێ.

لیعلم : یانی زانینی بەر لە داوای میلاكی جەزا و پاداشت نیە (لیعلم) یانی تا شتەكه (تخصص) پەیا بكات له واقیعدا دەردەكەوێ. وه علمی خودا بەوه بزانی كه هەر چەندە لەوەو پێش زانویتی.

﴿وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ﴾.

وه بۆیه ئەم كارەی هێنا تا چەند شەهیدێك تان لێ وەرگرێ بۆ رۆژی خۆی كەسانێك وا له جوملەی (شهادە) له ژیانیان یەكێكیش هەنگاوێكی كوژران و خوێن رژانه له پێناو خوا.

﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾.

بەم شێوەیه (شهادە) بە حەق تەواو دەبێ لە دونیا جا چۆن كار نەبراوەتە (غصب) تەواو نەبووه كافرەكان دەستیان لەوه نەكێشاوەتەوه ئەبێ هەروا كه دوو پیاوه معتمدەكه محمود بردنیه دادگا بۆ ئەوەی لەناو خەڵكدا شهادەتیان نەتیجەی نەبوو بۆ گەرانەوەی حەقی (مغصوب) زەوت لێكراو دادگایەك پێك بهێنرێت لەوێ ساحێب حەق و (غاصبین) و شاهدین لەوێ حازر بكرێن كار لەوێ كۆتایی پێ بهێنرێ.

ئایەتی ٦٩ سورەتی زمر (اعلان)ی دەست بەکار کردنی دادگا وە حازر بوونی رەئیسی دادگا کە خۆی ساحب حەقە وە شاهدین وە غاصبین بەیان دەکات کە چۆن کار کۆتایی پێ دێ.

﴿ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا ﴾.

بە لەفزی (فعل) مازی تەعبیری لێ ئەکات کە ئەوەندە راستە وەك ئەوەی روویدا بێ.

ئەفەرموێ: سەر زەوی ئەو وەختە رۆژی قیامەت بە نوری خاوەنەکەی درەخشان بووە.

﴿وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ﴾.

کتابی خودا ئەوەی لەسەر ئەساسی ئەوە قەزاوەت دەکرێ کتابێك کە بۆ هیدایەتی بەشەر ناردوویەتی لە دونیا وەلە قیامەتیش دا هەر ئەوە حازر دەکرێ تا رۆشن بکرێتەوە کە کێ بە(اقتزای) ئەوە جولانەوەی کردووە کێ نەیکردووە.

﴿وَجِاْىٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ﴾.

وە پێغەمبەران و شهداء ئەهێنرێن پێغەمبەران خۆیان و وشەی شهدائیش لێرە بۆ صدیقین و شهداء بەکار هاتوە یانی ئەو سێ دەستە لە ئیمانداران حازر دەکرێن و (شهادە) تێك کە لە دونیا داویانە لەوێ تکراری دەکەنەوە.

﴿وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾.

وە قەزاوەت بە حەق بەو جۆرەی کە دەبێ بکرێت دەکرێ لە بەینیاندا حوکم دەردەکرێ لەسەر غاصبین و ئەوانەی لەگەڵیان بوون و ژێر فەرمانیانبون و هاواریان لەبەر دەکردن.

وه بەیان دەكرێ كە حەق بە پێغەمبەران و شهدا بوە ئەوان زوڵمیان لێ ناكرێت هەر كەس بە پێی كەسپ و كاری خۆی پاداشتی ئەدرێتەوە.

ئەمە بە شێوەی گشتی دەفەرموێت :

﴿وَجِاْىٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ﴾.

لە ئایەتی ٨٩ سورەتی نحل دا بە تەفصیل دەفەرموێت:

﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِى كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْۖ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ﴾.

بیری ئەو رۆژە بكەرەوە كە هەر میللەتێك شەهیدێك لە خۆیان هەلدەستێننەوە شەهادەت بدا بەوەی كە لە دونیا لە ناو خۆیان شەهادەتی داوە وە رێگە نادا چەنە بازی بكەن بڵێن ئاوا نەبووە و ئاوا بووە.

جا دەفەرموێت: بە تایبەت تۆش بە عنوانی شەهید لەسەر ئەم میللەتەی خۆت لەوێ راستی دەكەیەوە شهادەكەت دوبارە دەكەیتەوە.

جا لە سورەتی قصص ئیتر بە شێوەیەك رۆشن و جوان وەزعیەتی غاصبین وە هەروەها ساحب حەق كە خۆی قازی دادگایە بە خودا رۆشن دەكرێتەوە.

﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٧٤﴾ وَنَزَعْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا فَقُلْنَا هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ فَعَلِمُوٓا۟ أَنَّ ٱلْحَقَّ لِلَّهِ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٧٥﴾﴾.

بیری ئەوە بكەرەوە كە خودا بانگیان دەكات دەفەرموێت: كوانێ شەریكەكان وا گومانتان دەكرد كە شەریكی منن، بەلام جوابێك نیە جا ئەفەرموێت: لە هەر ئومەتێك شەهیدێك دەكیشێ دەیهێنێتە دەرەوە بۆ شهادەت دان، ئەم جارە روو دەكەنە

غاصبین دەڵێین ئەمە شاهدانی ئێمەیە ئێوەش برهانی خۆتان عەرز بکەن کە ئەو حەقە هی ئێوە بووە هی ئێمە نەبووە، بەڵام لەوێ بۆیان ڕۆشن دەبێتەوە کە ئەمە حەقی خودایە ( الهویە )ش هی خودایە ئەوان زەوتیان کردبوو.

ئا بەم جۆرە شەهادەتی ئینسانی ئیماندار شەهادەت بە حەق دوایی پێ دێت وە کار دەبڕێتەوە.

..................................................................................

خودای گەورە مۆفەقمان بکات بۆ ئەوە لە ( شُهَدای بالحق ) بین وە بۆ ئەمەی بتوانین هەر بەو تەرتیبەی لێرە ئیشارە کرا ئەوەڵ خۆمان شهود بە حەق پەیا بکەین دوای کەسبی ئیعتماد لەخەڵك بکەین وە بتوانین لەگەڵ خەڵك ئەم شەهادەتە مەترەح بکەین وە هەر وەختێك بە ( اقتزای ) حیکمەت وە بەو جۆرە حەرەکەتێکی اسلامی صحیح ئیجازە ئەدات وەختی ئەوە هات کە لەگەڵ غاصبین دا روو بەروو بین بە گوزەشت لەگیان و ماڵمان ڕووبەڕووی غاصبین بوەستین وە بڵێین ( اشهد ان لا الە الا الله ) وەك موئمنەکەی ( ال فیرعون یکتم ایمانە ) تا وەختی خۆی هاتە پێشەوە لەم جەلەسە گەورەیە کە زانی جێی کەتمان نیە هەرچی شتە گوزەشتی کردوو حەقی بەیان کرد

﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾ .

وصلى الله على محمد وعلى اله اجمعين

استغفر الله لي ولكم ولسائر المؤمنين

سبحانك اللهم و بحمدك اشهد ان لا اله الا انت استغفرك واتوب اليك.